بەرەو چارەسەرێکی گونجاو

# ڕێبەری زانستخوازان

## بۆ ڕزگاربوون لە بەستەڵەکبونی دوێنی و هەستانەوە بۆ ئەمڕۆ

د. ادریس کریم کاریتانی



# ڕێبەری زانستخوازان

## بۆ ڕزگاربوون لە بەستەڵەکبونی دوێنی و هەستانەوە بۆ ئەمڕۆ

**نووسینی: د.إدريس كريم كاريتانى**



چاپی یەکەم ٢٠٢٠ ز - ١٤٤١ك

**نوسینگەی تەفسیر**
بۆچاپ و بڵاوکردنەوە
هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر
کاریتانی، إدريس كريم
ڕێبەری زانستخوازان ، إدريس كريم كاريتانى(نووسەر)
٢٣٤ لاپەڕە،
١٧* ٢٤ سم
بابەت، گەنجان، هزری ئیسلامی
ISBN: 978-9922-632-21-6

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٢٤٦) ی ساڵی ٢٠٢٠ پێدراوە.

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

دیزاین :عمر عثمان عمر
خەتی بەرگ :نەوزاد کۆیی

# ڕێبەری زانستخوازان

## بۆ ڕزگاربوون لە
## بەستەڵەکبونی دوێنی و هەستانەوە بۆ ئەمڕۆ

هەوڵێک بۆ دیاریکردن و چارەسەرکردنی بەشێک لەگرفتە زانستی و مەنهەجیەکانی خویندن و بوارەکانی زانستی شەرعی، وە شکاندنی بەستەڵەکبوونی دوێنی و هەوڵدان بۆ هەستانەوەی مەنهەجی زانستی ئەمڕۆ بەدیدێکی سەردەمیانە

د. ادریس کریم کاریتانی

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَاءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴾ المائدة: ٤٨

واتە: (بۆ هەریەکێ لەئێوەش ئەی موسڵمانان و ئەهلی کیتاب! یاساو بەرنامەیەکمان دانا، بۆئەوە کاری پێبکەن و لێی لانەدەن، خۆئەگەر خوا ویستبای هەمووتانی دەکردە یەك گەل و یەك و ئوممەت و هەرلەسەرەتاوە یەك بەرنامەشی بۆ دادەنان بەڵام بەوشتانە پێماندراون ویستی تاقیتان بکاتەوە، کەوابوو گشتتان پێشبڕکێ بکەن، بۆ ئەنجامدانی هەموو کارێکی چاکەو خێر دڵنیاشبن هەموو هەر بۆلای خوا دەگەڕێنەوە ئەوساش زۆر بەوردی لەوشتانە ئاگادارتان دەکا، ناکۆکی و کێشەتان بوو، پاشانیش هەرکەسە بەپێی کاروکردەوەی خۆی، پاداش و تۆڵە وەردەگرێت).

# دیاریە:

- بەهەموو زانستخوازانی زانستە شەرعیەکان، کەهەوڵی هەستانەوەی ئوممەی ئیسلامی دەدەن لەڕێگەی مەنهجی و خویندن و زانست.
- بەهەموو ئەو زانستخوازانەی ئیسلام وەک پەیامی خودای و ڕیسالی هەڵدەگرن نەیانکردۆتە پیشە و هۆکاری پەیداکردنی پژیوی ژیان و بازرگانی پێ کردن.
- بەهەموو ئەوانەی زانست بەهوکاری سەرەکی دەزانن بۆ گێڕانەوەی حوکمی خودا.
- بەهەموو ئەوانەی بەدوای مەنهجی ڕیسالی و ڕێڕەووو پەیڕەوی سەلەف دا دەگەڕێن تا ئیسلام وەک خۆی پێشکەش بەمرۆڤایەتی بکەن.
- بەهەموو ئەوانەی بەزانست سیستەمی ئیسلامی گشتگیر ئاوەدانی و شارستانیەت بەرپا دەکەن.
- بەهەموو ئەوانەی هەوڵی بونیادنانی مەعریفە و زانست دەدەن لەڕێگەی وەحی.

بەهەموو ئەو ماموستا ئاینیە بەڕێزانەی هەوڵی گەیاندنی پەیامی خودا دەدەن، هەنگاو دەنێن بۆ هەستانەوەی ئومەت لەڕێگەی زانستی و زانستخوازان.

## سوپاس و پێزانین:

لەژێر ڕۆشنایی فەرمودەیی شیرینی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرموێت (ئەوەی سوپاسی خەڵك نەکات سوپاسی خودا ناکات) بەپێویستی دەزانم سوپاس و پێزانینی خۆم پێشکەش بەهەر یەك لەبەڕێزان: م حیدر عبداللە و دکتورە خوناو بکەم هەڵسان بەهەڵەچنی، ،هەروەها بەڕیزان: م فاتح ملا سلیمان و کاك بەهێز ئەرکی تایبکردنیان کیشا، لەگەڵ هەموو ئەوانەی بەهەر شێوازێك یارمەتیان دابم لەنوسینی ئەم کتێبە خودا پاداشتیان بداتەوە.

# ڕێبەر

لــەماوەی ســەد ســاڵی رابــردوو بــەهۆی ســەرهەڵدانی ڕابــوونی ئیســلامی لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست زۆرترین بیرۆکە و مەدرەسەی جیاواز و[1] ، کەسایەتی خاوەن فکر[2] و ڕای جیاواز و وەسیلە بۆ کارکردن لە جیهانی ئیسلامی سەریان هەڵداوە و هەموویان کاریگەری جیاوازیان لەسەر کۆمەڵگا و تاکەکانی کۆمەڵگا داناوە هەر یەکە بەشێوازی جیاجیا، بەشی زۆری هەوڵ و تەقەلاّیان بۆ پێگەیاندنی زانستخوازان و بیرمەندان و بانگخواز و مامۆستای ئایینی و دروستکردنی کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوو شارەزا و ڕۆشەنبیر بووە تا دەگاتە گێرانەوەی حوکمی خودا. سروشتی مرۆڤ وایە، کاتێك دەیەوێت هەنگاوێك بنێت، یان بگات بەئامانجێکی دیاریکراو، بۆ گەیشتن بەم ئامانجە شێوازو ئالیەتی جیاواز دەگرنە بەر، هەر یەکەو پێی وایە بەئالیەتێك دەتوانێ ئامانجەکە بپێکێ، بۆ نموونە بۆ دروستکردنی زانستخوازانی سەرکەوت و یان کۆمەڵگایەکی ستاندەر و تەندروست یان گێڕانەوەی حوکمێکی عادیلانە لە کوێ دەست پێ بکەین؟ مەنهەج چۆن بێ؟ زانستخواز و قوتابێ چۆن پێ بگات ؟ بەچی دەست پێ بکەین ؟ پەروەردە ، عەقیدە، یان فکر، دەعوە یان جیهاد، تاك یان کۆمەڵگا، یان دەسەلاّت ، لەکۆتاییدا هەر یەك لەم بیرۆکانە پێویستیان بە دانانی مەنهەج و پەیڕەو هەیە بۆ پێگەیاندنی تاکەکان، هەر مەنهەج و پەیڕەوێکیش بەپێی ئالیەتەکە دەگۆڕدرێت،

---

(١) مەدرەسەی صوفی و سەلەفی و جیهادی ، ئیخوان مسلمین و حیزبی تەحریر و جەماعەی ئیسلامی و چەندان حیزب و مەدرەسەی تری جیاواز پەیدابوون.

(٢) جمال الدین ئە فغانی و محمد عبده و محمد ڕەشید ڕەزاو ئەبو ئەعلای مەودودی و حەسەن بەنا و سید قوتب و چەندان کەسایەتی تری فکری لەم سەد ساڵە پەیدابوون.

لەکۆتاییدا هەر مەدرەسەیەك بۆ پێگەیاندن و گەیشتن بە ئامانج جیاواز دەبێت لەئەوەی تر. کەواتە لێرەدا وەرگرتنی زانست بۆ تاکەکانی کۆمەڵگا دەبێتە چەندان ویستگە و مەنهەجی جیاواز، بێ گومان بەرامبەرەکانیش بۆ شێواندن و مەرامی تایبەتی خۆیان دەستەوەستان ناوەستن و دەستتێوەردان دەکەن و هەندێکیان لەم مەنهەج و ماددانە بەلاڕێی دەبەن و سەر لێشێواویەك بۆ خوێنەر و زانستخوازان دروست دەبێت. لای زانستخواز و گەنج ئاسان نابێت لەکوێ و چۆن و بەچی دەست پێ بکات، بۆ دیاریکردنی ئەم ڕێڕەو و مەنهەج و پەیڕەوە پێویستمان بە ڕێبەرێك هەیە بەرچاوڕوونی بداتە زانستخوازو قوتابی و گەنج و نەوەی نوێ و تاکی کوردی تا ڕێی ڕۆشن بێ و هەڵگری مەنهەج و پەیڕەوێکی ڕاست و ڕەوان بێ. نەبوونی ڕێبەرێکی زانستخوازی بەهێز و مەنهەجێکی خوێندنی وشیار و ڕیسالی ئومەی ئیسلامی توشی پاشەکشەیەکی زۆر کردوو لەزوربەی بوارەکانی ژیان بەجێ ماوە، ڕۆژئاوا گەورەترین گورزی لەجیهانی ئیسلامی دا بەکارکردن لەسەر مەنهەجی خوێندن و هێشتنەوەی زانستە تەقلیدیەکان. توانیان غەزوێکی گەورە لەبوارەکانی فەرهەنگ و ئایدیاو کلتووری لەجیهانی ئیسلامی دا بکەن، هەر لەڕێگای خوێندنەوە تەواوی ئامانجەکانی خۆیان لەسەر خوێندکار و زانستخوازان و نەوەی نوێی ئێمە جێ بەجێ کرد، تاکەکانی ئێمە نەخوێندەوار و سادە و ساکار و دواکەوتە و ئەوانیش خاوەنی شارستانیەت و فەرهەنگ و کلتوری پێشکەوتوون. بۆ دەربازبونمان لەنەهامەتی و دواکەوتەیە پێویستمان بەشۆڕشێکی زانستی و مەنهەجی و فکری و فەرهەنگی هەیە ئەمانەش تەنها بەڕێی زانستی ریسالی و وشیارانە و مەعریفی دەکرێت.

د. ئیدریس کاریتانی

٢٠-١٢-٢٠١٧. هەولێر

## بخوێنه

هەر کاتێـك گوێمـان لـە وشـەی بخوێنـە (ٱقۡرَأۡ ) بـوو، پێویسـتە بگەڕێنـەوە بـۆ مێژووی جەزیرەی عەرەب و سەرەتایی هاتنی وەحی. خوێنـدن و خوێنـدەواری لـە جەزیرەی عەرەبدا بەپەنجەی دەست دەژمێردران[1]، کاتێك قورئان نیـدای خوێنـدنی لێدا دونیا سەر سام بوو! مانای چییە لە جەزیرەیەك لە لووتکەی نەفامی و نەزانی و نەخوێندەواری بـانگی خوێنـدن و خوێندنـەوە گوێیـەکان دەلـەرزێنێت، ئایـا ئـەم کۆمــەڵگا دواکــەوتووە لــەڕووی گرفتــی کۆمەڵایــەتی و ئــابووری و سیاســی و دواکەوتوویی و شارستانیەت و پەروەردە و فێرکردن و تەواوی بەشەکانی تری ژیـان چ پێویستی بەخوێندنە، کام گرفتی بۆ چارەسەر دەکات، پەنچـە لەسـەر کـام بـرین دادەنێت. تۆ بڵێی میللەتێك شوانەوێڵە و دەشتەکی، شارسـتانیەت و فەرهـەنگ و کلتووری لێ بەرهەم بێ، بۆچی وێنایکی شارستانیی ئەو کاتەیان بـۆ ناگوازنـەوە و تا فێری شارستانی بن، دیارە بواری کۆمەڵایەتی تەواو دار وخاوە و پێویسـتی بـە بیناکردنەوە هەیە با جاری کۆمەڵایەتی لێ بدرێ سەرەتا، دوایی خوێندن بێ ، ئەم پەیامــە، پــەیامێکی خوداییــە و دیراســەی تــەواوی کۆمــەڵگا کــراوەو باشــترین چارەسەری خێرا کەتەواوی لایەنەکان بگرێتەوە، خوێندنە. بۆیە جـاڕی: ﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ

(١) عن أَبيَ بكر بْن عَبْد اللَّهِ بْن أبىَ جهم العدوى قال: دخل الإسلام وفي قريش سبعة عشر رجـلا كلـهم يكتـب عُمَر بْن الخطاب وعلي بْن أَبيَ طالب، وعُثْمَان بْن عَفَّان، وابو عُبيَدة بْن الجراح، وطلحة ويزيد ابـن أَبـيَ سُـفْيَان، وابو حذيفة بْن عتبة بْن ربيَعة، وحاطب بْن عَمْرو أخو سهيل بن عمرو العامري عن قريش، وابو سـلمة بْـن عَبْـد الأسد المخزومي، وأبان بن سعيد بن العاصي بن أمية، وخالد بن سعيد أخوه، وعبد الله بن سـعد بـن أبـيَ سـرح العامري، وحويطب بن عبد العزى العامري وابو سفيان ابن حرب بن أمية، ومعاوية بن أبيَ سفيان، وجهـيم بـن الصلت بن مخرمة بن المطلب بن عبد مناف، ومن حلفاء قريش العلاء بن الحضرمي. واتە : كاتێك ئیسلام هـات ئەوانەی خویندەواریان هەبوو لەناو قـوریش ( ١٧ ) کـەس بـوون ئەمانـەی سـەرەوە ناوەکانیانـە .بروانـە: فتـوح البلدان أحمد بن يحيى بن جابر بن داود البَلَاذُري (ص: ٤٥٣).

رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِنْ عَلَقٍ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ عَلَّمَ ٱلْإِنسَـٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴾[1].

واتە: (ئەی محمد "ﷺ" بخوێنە بە ناوی ئەو پەروەردگارەتەوە کە هەموو شتێکی دروست کردووە, ئادەمیزادی لە چەند خانەیەکی هەڵواسراو (لەناو منداڵداندا) دروست کردووە, بخوێنە لە کاتێکدا هەر پەروەردگاری تۆ بەخشندەیە, ئادەمیزادی فێری ئەو شتانە کردووە کە نەیزانیون).

ئیمامی قورتبی لەبارەی ئایەتی ﴿ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ﴾ دەفەرمووێت: الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ يَعْنِي الْخَطَّ وَالْكِتَابَةَ، أَيْ عَلَّمَ الْإِنْسَانَ الْخَطَّ بِالْقَلَمِ. وَرووی سَعِيدٌ عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: الْقَلَمُ نِعْمَةٌ مِنَ اللَّهِ تَعَالَى عَظِيمَةٌ، لَوْلَا ذَلِكَ لَمْ يَقُمْ دِينٌ، وَلَمْ يَصْلُحْ عَيْشٌ. فَدلَ عَلَى كَمَالِ كَرَمِهِ سُبْحَانَهُ، بِأَنَّهُ عَلَّمَ عِبَادَهُ مَا لَمْ يَعْلَمُوا، وَنَقَلَهُمْ مِنْ ظُلْمَةِ الْجَهْلِ إِلَى نُورِ الْعِلْمِ، وَنَبَّهَ عَلَى فَضْلِ عِلْمِ الْكِتَابَةِ، لِمَا فِيهِ مِنَ الْمَنَافِعِ الْعَظِيمَةِ)[2].

واتە: ئەو خودایەی فێری نووسین و خوێندنی کردن مرۆڤەکانی فێری نووسین کرد بەهۆی قەڵەم، ریوایەت کراوە لە سەعید ئەویش لەقتادە دەفەرمووێت: قەڵەم نیعمەتێکی گەورەی خودایە، ئەگەر ئەوە نەبوایە ئایینیش بەرپا نەدەبوو، ژیانیش فەراهەم نەدەبوو بۆ ژیان، ئەمەیان بەڵگەیە لەسەر تەواوی کەرەمی خودا بەوەی خودا بەندەکانی خۆی فێری ئەو شتانە کردووە کەنایزانن، هەروەها ئەوانی گواستەوە لە تاریکایی نەزانی بۆ ڕووناکی زانست، ئاگاداری کردنەوە لە گەورەیی و ڕێزی نووسین و فێربوون، کە چەندە سوودێکی گەورەی هەیە.

(١) سورەتی العلق ئایەتی ١- ٥ .
(٢) بروانە: تفسير القرطبي (٢٠/ ١٢٠).

کەواتە دروشمی گۆڕانکاری لەجیهانی ئەم جارە، جیاواز لە گۆڕانکارییەکانی تر بە خوێندن دەستی پێ کرد، دەروازەی چارەسەرێکی گشتگیر بوو ، وەك کلیلی سەرجەم گرفتەکان تەواوی دەرگاکانی کردووە بەڕووی کۆمەڵگایەکی داخراو بەڕووی جیهان، دابڕاو لەتەواوی شارستانیەت و ژیانی میللەتانی دەوروبەری خۆی، بە وشەی ( ٱقۡرَأۡ ) دەرگای جەهالەت و نەفامی داخراو دەرگا بۆ پێشکەوتن و فەرهەنگ و کلتوورێکی نوێ بەڕووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کرایەوە، سەرنجی هەموو جیهانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا ، سەرەتایەکی نوێ بوو بۆ مرۆڤایەتی بەگشتی و میللەتانی ناوچەکان بە تایبەت دەستی پێ کرد، تا بەدیدێکی نوێ بڕواننە ژیان و بوونەور و مرۆڤ، لەوێوە مرۆڤ خۆی دۆزیەوە، زانی چی دەکا و بۆچی دەژی و لەکوێ هاتووە و بۆچی هاتووە و دەچێتەوە کوێ، ئەم پرسیارە فەلسەفیانەی دونیای بەخۆی سەرقاڵ کردبوو بەبێ وەڵام مابوونەوە یان وەڵامی هەڵەیان وەرگرتبوو بەهاتنی ( ٱقۡرَأۡ ) تەواوی وەڵامی ڕاست و دروستی خۆی وەرگرتەوە، بە دەستگرتن بەمانا و فەلسەفەو جێبەجێکردنی ئەم وشەیە سەرمەشقی و پێشەنگی بەوان بەخشرا جەهالەت ماڵئاوایی کرد ، بیر و هزر و فەلسەفە و خوێندن و نووسین و خوێندنەوە شوێنی گرتەوە. دەرگا داخراوەکان کرانەوە، گرفتەکان چارەسەر بوون، نەخویندەوارەکان بوونە مامۆستای مروڤایەتی، تاریکیەکان ڕووناك بوونەوە، گفتوگۆ جێی شەڕو ئاژاوەی گرتەوە، نەرمونیانی و لێك تێگەیشتن جێی بۆغز و دڵڕەقی گرتەوە، خوێندنەوەیەکی تازە بۆ تەواوی ماناکانی ژیان داڕێژرایەوە، تێڕوانین بۆ بونەوەر و ژیان و مرۆڤ گۆڕدرا، ئاسوودەیی و بەختەوەری و ئارامی باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشا، دونیا خامۆش بوو، مرۆڤ تازە لەمرۆڤبوونی خۆی تێگەیشت ماف و تایبەتمەندییەکانی پارێزراو بوو، ئافرەت هاتەوە ڕیزی مرۆڤایەتی و بەمرۆڤ هەژمار کراوە. لەبازنەی بەندایەتی بەندەکان

هاتنە بازنەی ئازادی و یەکسانی و سەربەستی، بوون بە خاوەن بیرکردنەوەی ئازاد و عەقڵی سەربەخۆ، توانیان داهێنان بکەن، بۆ دووبارە گەڕانـەوە و هەسـتانەوە سـەر پێی ئومەی ئیسلامی پیویستمان بە بخوێنەیە!. لەژێر رۆشنایی مەنهـەج و رێبـەرو پەیڕەوێکی ڕاست و دروست.

## ڕێبەری گەنجان و زانستخوازان بۆ؟

هەرچەندە نووسراوگەلێکی زۆر هەیە لەسەر مەنهەجی زانستی و زانستخوازی بەتایبەتی بەزمانی عەرەبی، بەلاّم بەپێویستم زانی ئەم ڕێبەرە بەزوبانی کوردی بۆ زانستخوازان لەدووتوێ کتێبێکدا پێشکەش بەتوێژی گەنجان و زانستخوازان و نەوەی نوێ بکەم لەبەر چەند هۆیەك لەم خالاّنەدا دەیانخەمە ڕوو:

١- پێغەمبەر (ﷺ) داوای لەهەموومان کردووە زانستخواز بین، یەکێك بین لەو بەشانە ئەگەرنا، تووشی لاڕێیی دەبین، وەك دەفەرموویت: «اغْدُ عَالِمًا أَوْ مُتَعَلِّمًا أَوْ مُسْتَمِعًا أَوْ مُحِبًّا وَلَا تَكُنِ الْخَامِسَ فَتَهْلَكَ»[1]. زانستخوازیش پێویستی بەڕێبەرێك هەیە تا ڕێڕەوی یەکێك لە وانەمان بۆ دیاری بکا.

٢- لەجیهانی ئیسلامی بەشێك لەمەنهەج و ڕێبەرەکانی خوێندنی زانستی شەرعی و خوێندنگاکان بەگشتی لەئێستادا بۆ سیاسەتی ولاّتان بەکار دەهێندرێت، بەتایبەتی ولاّتی شانشینی سعودیە بەڕێی نامیلکە و چاپکردنی کتێب، دەیان فکری تایبەت بە بەرژەوەندییەکانی خۆیان تێکەڵ دەکەن بەناوی قورئان و سوننەوە! دەینێرن بۆ ولاّتان و گەنجان بەبێ دیراسە دەیکەن بە مەنهەج، دوای خوێندنی دەبن بە دژی یەکتر بەناوی بیدعەو سوننەوە ڕیزی موسڵمانان لێك هەڵدەوەشێنن.

٣- بەناوی عەقیدە و کیتاب و سوننە لەلای مامۆستایەك پەروەردە دەبن، چونکە مەنهەجەکە دوورە لە بنەمای مەبدەئی و فکری، دوای زانستخوازەکان یان گەنجەکان دەبن بە داردەستی عەلمانییەکان و بەئەمیر و وەلی ئەمری موسڵمانانیان دەزانن، بەلاّم لەسەر بچووکترین سوننەت، کەلەلای ئەوان سونەت نیە، سەلام

(١) طبرانی لە أوسط گێڕاویەتیەوە (٢٣١/٥) ژ (٥١٧١)، هەروا بەیهەقی لە شعب الإیمان (٢٦٥/٢) ژ (١٧٠٩).

لەموسڵمانانی برای خۆی ناکات بەلاّم عەلمانیەت[١] بە وەلی ئەمر دەزانن.

٤- پاشکەوتن و دواکەوتنمان لەجیهانی زانست و زانیاری و شارستانیەت یەکێك لەهۆکارە سەرەکییەکانی نەبوونی مەنهەجێکی ڕیسالی و فکری و ڕۆشەنبیری و معریفە و نەهزەوییە.

٥- تا موسڵمانان خاوەنی مەنهەج و ڕێبەری ریسالی و مەعریفی بوون خاوەنی شارستانیەتی سەردەمی خۆیان بوون، کاریگەرییان کردە سەر ڕۆژئاواو هەستانەوە و شۆڕشی زانیاری ڕۆژئاوا بە ددانپێداهێنانی خۆیان بەکاریگەری مەنهەج و ڕێبەری زانا موسڵمانەکان بوو، کەچی ئێستا بەتەواوی لەدونیای تەکنەلۆژیاو پێشکەوتنی زانیاری سەردەم دابڕاوین.

٦- لێکترازان و پارچەپارچەبوونی ئومەی ئیسلامی بەئەندازەیەك کەس ددان بەکەس نانێت و ململانیّ لەنێوان موسڵمانان خۆیان قوڵتر و زیاترە لە ململانێی موسڵمان لەگەڵ بەرامبەرەکانی .

٧- یەکتر قەبوولنەکردن و نەبوونی هاماهەنگی لەکارکردن و ڕوحی یەکتر تەواوکردن، دوبارە نەبوونی مەنهەجێك و ڕێبەرێکی تەندروستە.

٨- دەیان ئایەتی قورئان و فەرموودەی شیرینی پێغەمبەرمان ڕێز دەکەن و بەتەواوی لەبەریانە و لەکتێب و وتار باسی دەکەن، کە دێنە سەر جێبەجێکردن (التطبيَق) لەپێشدا بەخۆیان جیّ بەجیّ ناکەن.

٩- قۆناغی ئێستامان لەلای بەندە ناو نراوە قۆناغی (پاشاگەردانی)(الفوضى)

---

(١) **عەلمانیەت چییە؟** دائیرەی مەعاریفی بەریتانی عەلمانی وا پێناسە کردووە و دەڵێت: (secularism): (هي حركة اجتماعي تهدف الى صرف الناس وتوجيههم من الاهتمام بالآخرة, الى الاهتمام بهذه الدنيا وحدها)، واتە: (عەلمانیەت: بزوتنەوەیەکی کۆمەلاّیەتیە، ئامانجی ئاڕاستەکردنی خەڵکە لەگرنگیدان بە ڕۆژی دواییەوە بۆ گرنگیدان بە تەنها ژیانی دونیاوە ). (شێخ سەفەر حەوالی) دەڵێت: واتای تەواوی وشەی عەلمانیەت واتە (اللادينيه أو الدنيويه) واتە: (دوور لە ئایین، یان دونیایی). بڕوانە : العلمانية نشأتها وتطورها, سفر الحوالى (ب١ – ل ١٣) للشيخ سفر الحوالى. و EnsyBratannicavol.Hp19)).

بێسەروبەری زۆر لەفەتواو بەشەکانی تری فکری ئیسلامی دا هەیە بەهۆی نەبوونی مەرجەعیەتێك فەوزایەکی زۆر بەتایبەتی لە نێوان جیلی گەنجان و زانستخوازانی سەرەتایی هەیە، هەر لەتکفیرکردن بگرە تا دەگاتە تاوانبارکردنی یەکترو جنێودان و ... هتد ئەمەشیان بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی مەنهەج و ڕێبەرێکی ستاندەری شەرعی.

١٠- تا ئێستا بەزمانی شیرینی کوردی مەنهەجێکی زانستی و ڕێبەرێکی ورد نەنووسراوەتەوە تا گەنجان بەئاسانی بەزمانی خۆیان بیکەن بە ڕێبەری خوێندنیان و بەرچاویان ڕوون بێتەوە.

١١-جیلی نەوەی نوێ، بەشێکی هەرە زۆری لەزمانی عەرەبی شارەزا نییە و ناتوانێ بەتەواوی لەپرۆگرامی عەرەبیٚ تێبگات.

١٢- ئەو مەنهەجەی زانستخوازان و قوتابییان لەئێستا لەلای مامۆستا و حوجرە و مزگەوتەکان و کۆلیژە ئیسلامییەکان دەیخوێنن زیاتر مەنهەجێکی زانستی ڕووتە و تیۆرییە، جەختی نەکردووەتە سەر لایەنی کرداری تا زانستخواز بتوانێ لەگەڵ ژیانی ڕۆژانەی خەڵك تێکهەڵکێشی بکات و چارەسەری گرفتەکانی خەڵکی پێ بکات .

١٣- بەشێك لە مەنهەج و ڕێبەرەکان ئیسلامیان وەك پەیام (الرسالَة) نەناساندووە بە زانستخوازان و گەنجان و قوتابیان تا غەمی تەنها گەیاندنی ئیسلام و پەیامەکەی بێت. بۆیە بەداخەوە چەندان مامۆستای ئایینی و بانگخوازمان هەیە، کەوتونەتە بەرەی عەلمانییەکان[1] ئەمە گەورەترین کارەساتە، زانستخواز

---

(١) **عەلمانی کێیە؟**عەلمانیەت یەك جۆر و شێوازی نییە، دەبێ بە سێ جۆر پۆلین بکرێت: **جۆری یەکەم:** عەلمانیەتی بێ باوەڕ، (العلمانیة الملحدة) ئەم جۆرەیان باوەڕی بە خودا و ئایین نییە، هەروەها باوەڕی بە سیستەمێکی ئایینیش نییە. بانگەشەکارەکانی (مارکس) و (هیگڵ)ن. **جۆری دووەم:** عەلمانیەتی خاوەن باوەڕ تەنها بەخودا: ئەم جۆرەیان باوەڕی بەخودا هەیە، بەلاّم بانگەشەی دوورخستنەوەی ئایین لە ژین دەکات.
←

لەسەر قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) پەروەردە ببێ، دوایی خزمەتی فکری عەلمانی بکات و بانگەشەیان بۆ بکات.

١٤- هەندێك مەنهەج و ڕێبەرەکان وا لە بەشێك لە زانستخوازان دەکات دەعوە و زانستەکەش وەك پیشە تەماشا بکەن، نەك وەك وەزیفەی پێغەمبەران (سەلامی خودایان لەسەر).

١٥- دونیای عەولەمە بەتایبەتی جیهانی ئیسلامی بووەتە چەقی ململانێی فکری جۆرەها بیروکەی لادەر هاتووە نێو موسڵمانان بەشێکی زۆر لە ڕێبەرو مەنهەجەکانی زانستخوازەکان دەیخوێنن تا ئێستاش هەر باسی موعتەزیلە و خەواریجە، کەچی ئێستا لەجێی ئەوانە عەلمانیەت و لیبرالیەت و فیکرەکانی تر لەمەیدانن و گەنج پێیانەوە سەرقاڵن ، بۆیە پێویست دەکات ڕێبەرێك هەبێت ئەم بابەتەیان بۆ ڕوون بکاتەوە کە کام کتێب بۆ ئەم سەردەمە دەتوانێ ڕووبەڕووی ئەم فکرانە ببێتەوە.

١٦- کۆمەڵێك کتێبێ تازە لە جیهانی ئیسلامی نووسراونەتەوە تێکەڵکێش کراون بەنمونەی ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)، هەروەها

---

بانگەشەکاری ئەم جۆرە (ڤوڵتێر، جۆن لوك، دیکارت، بێکوت، جان جاك ڕۆسۆ ).-لە جیهانی ئیسلامیش (قاسم ئەمین، تەها حوسێن، نەجیب عازۆری، ساڵح حصری، سەلامە موسا، ئەنوەر سادات ، میشێل عەفلەق ، ئەنگون سعادە، بۆرقیبە، زەین عابدین، جمال عەبدولناسر) بوون.- لە تورکەکان: (مەدحەت پاشا، نامیق پاشا، تکلین ئەلب، زیا ئەلب کوك، ئەنور پاشا، مستەفا کەمال ئەتاتورك) بوون. -لە ناو کوردان دوای دروستبوونی حیزبێ (ئیتحاد تەعالی و تەرەقی) ساڵی (١٨٨٩) ئەم سەرکردانە هەڵگری ئەم جۆرە عەلمانیەتە بوون لەوانە: (ئیسحاق سکۆلی، عەبدوڵلا جودەت، رەفیق حلمی، شەریف پاشا، ئیبراهیم ئەحمد). **جۆری سێیەم:** (عەلمانیەتی دیندار)، ئەم جۆرەیان تاکە تاکەی موسڵمانە، دیندارە، دڵی بە ئیسلام خۆشە، نوێژ و ڕۆژی دەگرێ، خێر دەکات، بەشداری مەراسیمەکانی ئیسلام دەکات، بەلاّم لەگەڵ عەلمانیەکانیش هەنگاو دەنێ، دەنگیان پێ دەدات، لە دوایان دەڕوات، وا لە ئیسلام گەیشتووە نابێ لەگەڵ سیاسەت و دەوڵەت تێکەڵ بکرێت، پێی وایە ئیسلام تەنها بۆ مزگەوتە، زانایانی ئایینی کاریان (تەلقین) و مارەبڕینە و پێش نوێژییە. بروانە: العلمانية نشأتها وتطورها, سفر الحوالي (ب١ — ل ١٣). هەروەها: کتێبێ نەوەی نوی لەنیوان فکری ئیسلامی و تیوری عەلمانی دا ، نوسەر ، ل ١٥١.

هەڵوەشانەوەی بیروڕا لادەرەکان ئاسانترە، گەنج و زانستخواز بیانخوێنی و بەکردار جێ بەجێیان بکات.

١٧- بەهۆی زۆری کتێب و نوسراو و نامیلکە بەشێك لە گەنجان و زانستخوازان توشی دوودڵی و سەر لێشێواویەك بوینە، کام مەدرەسە و کتێب و نامیلکە ڕاستە؟ کام ماددە و مەنهەج بخوێنێ پێ دەگات؟ ئەمانە پرسیارگەلێکن گەنجانی بێ وەڵاّم هێشتووتەوە.

١٨- گەنجان و قوتابییان و زانستخوازانێك هەن لەبەر نەبوونی ڕێبەرێکی ڕوون ساڵەهای ساڵە خەریکی خوێندنی زانستی شەرعین، کەچی هەرپێنەگەیشتوون ، تەمەنێکیان بەسەر بردووە نە ڕێبەریان هەبووە و نە مامۆستا، بۆیە نەگەیشتوونەتە ئامانج، ئیبن بەدران دەفەرموویێت: (اعْلَم أَن كثيرا من النَّاس يقضون السنين الطوَال فِي تعلم الْعلم بل فِي علم وَاحِد وَلَا يحصلون مِنْهُ على طائل وَرُبمَا قضوا أعمارهم فِيهِ وَلم يرتقوا عَن دَرَجَة المبتدئين وَإِنَّمَا يكون ذَلِك لأحد أَمريْن أَحدهمَا عدم الذكاء الفطري وَانْتِفَاء الْإِدْرَاك التصوري وَهَذَا لَا كَلَام لنا فِيهِ وَلَا فِي علاجه وَالثَّانِي الْجَهْل بطرق التَّعْلِيم)(١).

واتە: بزانە خەڵکێکی زۆر ساڵانێکی زۆر بەسەر دەبەن لە فێربوونی زانست، جاری وا هەیە لەیەك زانست، بەدەستیشی ناهێنن و تەمەنیان تێدا سەرف دەکەن ناگەنە پلەی سەرەتایش، ئەمەش لەبەردوو هۆکارە یەکێکیان نەبوونی زیرەکی سروشتی و دەرك نەکردنی ئەمەیان ئێمە قسەمان تێدا نییە و چارەسەریشی نییە، دووەمیان: نەزانی و نەشارەزایی بەڕێگای زانستخوازی.

١٩- زانستخواز و گەنجان و قوتابییان پێویستیان بەڕێبەرێك هەیە بیانگێڕێتەوە سەر دەلیل و سەرچاوەو کتێبە زانستییەکان (الاصول) ئەگەر نا،

---

(١) بڕوانە: المدخل إلى مذهب الإمام أحمد لابن بدران (ل ٤٨٥).

زانستخواز بەکاری لاوەکی خەریك دەبێت ناگاتە مەبەست، وەك گوتراوە: ( مـن لم یـتقن الاصـول حـرم الوصـول)[١]، واتـە: (ئـەوەی نەگاتـە سەرچـاوە سـەرەکی و بنچینەکان بێ بەش دەبێ لە گەیشتن). هەروەها گوتراوە: (مـن حـرم الـدلَیل ضـل السبیَل) واتە: (هەر کەسێك لە ڕێبەر یان ڕێوان بێ بەش بێت ڕێگا بزر دەکات).

٢٠- هەسـتانەوەی ئومـەی ئیسـلامی بەسـتراوەتەوە بـەدانانی مەنهـەجێکی ڕیسالی و زانستی و فکری و فەلسـەفی و فەرهـەنگی و مـەعریفی و واقیعـی، تـا جارێکی تر سەرمەشقی دونیا بگرێتەوە دەست.

٢١- بەهۆی تێکەڵی زۆرم لەخزمەت گەنجان و قوتابییان ڕۆژانە سکالاّی حـاڵی خۆیان دەکەن کام کتێب و کام مادده و مەنهەج گرنگە، پێویستە بۆ ئەم سەردەمە بخوێنین؟ تا لە زانکۆ یان لەشوێنی خۆی بتوانێ سەر ڕاست و زاناو شارەزا بێـت لـە دونیای ئەمڕۆ، لـە واقیعـی سیاسـیی و کۆمەلاّیـەتی و ئـایینی و بەشـەکانی تـر، ناکرێ بە وەلاّمێك بـۆی شـی بکەیتـەوە بۆیـە ئـەم ڕێبـەرەم بەپێویسـت زانـی، تـا بەکردەیی ببێتە ڕێبەرێك ئاستی مەعریفی بەرزکاتەوە بۆ گەنجان و زانسـتخوازان و قوتابییان لەگەڵ چەندان هۆکاری تر نامەوێ درێژەی زیاتری پێ بدەم.

٢٢- دوای ئەوەی هەردوو کتێبی گـەنجان لـەبواری چارەسـەری کۆمەلاّیـەتی و نەوەی نوێ لەبواری چارەسەری فکـری بـەپێی وتـەی خوێنـەرەکانی بەشـێکی بـاش هۆشـیاری لای تـاکی گـەنج و نـەوەی نـوێ پەیـدا گـرت وەك تـەواوکاری بـاگێکی هەستانەوەو نەهزە بەپێویستم زانی لەبواری چارەسەری مەنهەجی شتێك بنوسم تـا ئەم گرفت و لارو لەوێریەی لەمەنهـەجی زانسـتخوازان هەیـە ئامـاژە پـێ بکـەم و بەدیدێکی نوێش چارەسەریان بۆ بدۆزمەوە.

---

(١) بڕوانە: تذكرة السامع والمتكلم .

## کۆسپەکانی بەردەم ئەم نووسراوە

ئـەو نووسـراوانەی ناوەڕۆکەکـەیان بریتییـە لـە فکـر و هەسـتانە و چارەسـەر، زۆرتـرین کۆسـپ و تەگـەرەیان دێتـە پـێش، زۆر ئاسـان نییـە بتـوانی نووسـراوێك پێشکەش بکەی چارەسەری بابەتێکی زۆر هەستیارو مەنهەجی خوێندن و فێربـوون بکەی، دەیان گرفتی ناوەکی و دەرەکیت نەهێتە پێش ، بـۆ بەرچاوڕونی خوێنـەر، بەپێویستی دەزانم گرفتەکان بەچەند خاڵێك بخەمەڕوو:

### یەکەم: گرفتی نوسراوە فکرییەکان.

بابەتی فکری و هەستانەوە خوێنەری کەمە، بەتایبەتی ئـەمڕۆ زۆرتـرین کتێـب کـە دەخوێنرێتـەوە ئەوانـەن، کـە بەسـەرهات و بابـەتی خواپەرسـتی و بـوارە عاتفیەکانن، ئێمە لەم بابەتانە کەم ناکەینـەوە، بـەڵام لـە نووسـینی ئـەم کتێبـەدا لەبەر گرنگیی بابەتەکە لەلای بەندە دەیان شەو تا درەنگان دانیشتووم بەدیاریەوە، یان تا نوێژی بەیانی، تاکو بتوانم شتێك لەبواری فیکری و هەستانەوە و پێگەیاندن پێشکەش بە گەلەکەم بکەم، با خوێنەریشی کەم بێت و گـرفتی زۆریشـی هـەبێت، تـاوەك و بـوارە فکرییـەکان کـە بـەڕای بەنـدە زۆرتـرین چارەسـەر و دیـاریکردنی برێنەکانی ئومەی تێدایە بخوێندرێتەوە و کاری پێ بکرێت.

### دووەم: هەستانەوە و چاکسازی، کارێکی ئاسان نییە و ئاستەنگی زۆرە.

هەموو چاکسازی و هەستانەوەیەك دەبێ لەڕێی ڕێڕەوی مەنهەجی بێت و قۆناغ بەندی بۆ بکرێـت، لـە نوخبـە و زانایانـەوە دەسـت پـێ بکرێـت، ئـەوان جومگـەی سـەرەکی و کـاکڵی گۆڕانکـارین، ابـن بـادیس زۆر جـوان نەخشـەی هەسـتانەوە و چاکسـازی لـە فێربـوون دەکێشـێ و قۆنـاغ بەنـدی بـۆ دادەنێـت و دەفـەرمووێت:

(موسڵمانان چاکساز نابن تاوەکو زاناکانیان چاك نـەبن، بەڕاسـتی زانایـان لـە نێـو ئومەت وەك دڵ وانە، ئەگـەر چـاك بـن ئـەوە هـەموو لاشـە چـاك دەبێـت، ئەگـەر خراپیش بن لاشە هەموو خراپ دەبێت، چاکبوونی موسڵمانانیش بە تێگەیشـتنیان لـە ئیسـلام و کـار پێکردنیـەتی، فێربـوونی کۆمـەڵگاش لەسـەر دەسـتی زانایـان دەکرێت، ئەگەر زانایان بێ توانا و دۆگما بن لـە زانسـت و بـە هـەواو و هەوەسـی خۆیـان کـردەوە بکـەن ئـەوە موسـڵمانانیش وادەبـن، کەواتـە ئەگـەر دەمانـەوێ موسلمانان چاك بن، با زانایانمان چاك بکەین).

هەروەها دەفەرموێت: (زانایـانیش چـاك نـابن تـاوەکوو مەنهـەجی خوێنـدن و فێربوون چاك نەکرێ، هەرفێربوونە دەتوانێ زاسـتخواز ڕابهێنـێ لەسـەر داهـاتووی ژیانی، هـەروەها داهـاتی زانسـتی خـۆیی و غـەیری خـۆی دیـاری بکـات، ئەگـەر ویستمان زانایـان چـاك بکـەین، بـا مەنهـەجی خوێنـدن و فێربـوون چـاك بکـەین، مەبەست لە مەنهەجی خوێندن و فێربوون ئەو فێربوونەیە کە موسڵمان بکاتە زانا، زاناکانی ئیسلام دینی لی وەربگرن و ئیقتیدای پێ بکەن)[1].

ئەگەر بەوردی لەم دوو وتە جوانەی "ابن بادیس" بڕوانی جوانترین قوناغبەندی و ڕێبەری هەستانەوە و چاکسازییە لەڕێی زانایان و مەنهەجەوە.

## سێیەم: کاری بیرمەندان ئاسان نیە.

بەدرێژایی مێژووی موسڵمانان هیچ سەردەمێك خاڵی نـەبووە لـەبوونی چـەندان بیرمەندی گەورە و شارەزا، کاریان لەسەر ڕاسـتکردنەوەی ڕێـڕە و کـردوە، ڕێبـەری ڕاست و دروستیان بـۆ خـەڵك ڕۆشـن کردووەتـەوە، گوڕانکارییـان لـەنێو گۆمـەڵگا دروست کردوە و هەنگاوی زۆریان ناوە، لەوانە:

(١) بڕوانە: اثار ابن بادیس (٣- ٢١٧).

أ- ئاستی وشیاری خەڵکیان لەڕێگای نووسراوەکانیانەوە زۆر بەرز کردووەتەوە.

ب- کۆمەڵگایان بەخەبەر هێناوە و ڕابوونیان دروست کردووە.

ت- عەلمانیەت و ئایدیولۆژیا ناڕاستەکانیان بەجیهان ناساندووە.

پ- پیلانی دوژمانیان بەوردی شیکردووتەوە، هەر تەنها بەنووسراوەکانیان هەرچی شوبوهاتە هەڵیان تەکاندووتەوە.

ج- خوێندنەوەیەکی بابەتیانە و نوێیان بۆ تەفسیر و ئایەتەکانی قورئان و سوننەتی صەحیحی پێغەمبەرمان (ﷺ) کردووە.

ح- شەریعەتیان وەك سیستەمی ژیان بەخەڵك ناساندووە.

خ- لەگەڵ مێژوو نەژیاون و پشتیان لەداهاتوو کردبێ، سوودیان لەمێژوو بینیوە و نەخشەیان بۆ داهاتوو داڕشتووە.

د- واقیعیانە ژیاون و بۆ هەر سەردەم و بەرەو پێشچوونێك چارەسەریان لەقورئان و سوننەتی پیغەمبەر دۆزیوەتەوە.

## چوارەم: گرفتی یاسایی.

هەرکات تەواو دەبم لە نووسینی کتێبێك، گرفتی سەرەکیم ئەوەیە چۆن داوای ژمارەی سپاردن بکەم، چونکە لە زۆربەی دائیرەکان هەر گوترا کاریتانی ئەوە گرفت دروست دەبێت، وەك سروشتی خۆشم حەز ناکەم بەناوی خوازراویش شت بنووسم، پێم خۆشە بە ڕاشکاوی خۆم بەرپرسیارەتی هەر سزایەك یان ڕووبەڕوو بوونەوەیەك هەڵگرم، مادام بڕوام پێیەتی و وەك پیرەنسیب کارم بۆ کردوە.

## پێنچەم: گرفتی ماددی.

لە ژیاندا لەوەتەی لە خزمەتی ئەم ئیسلامە مەزنە بوومە، نەم ویستووە بە

هیچ شێوەیەك، هیچ سوودێکی مادی لەم ڕێگەیەوە بەدەست بێنم، تەنانەت (١٢) ساڵ لە مزگەوت بووم ڕۆژێـك لـە ڕۆژان نەچـوومەتە خـانووی مزگـەوت یـان هـەر سودێکی تر، لە نووسراوەکانیشم چاوم لە هیچ سوودێکی مادی نەبووە، غەمم ئەوە بـوە چـۆن چـاپ بکـرێ و بگاتـە دەسـتی خوێنـەرانی، زۆر جـار گرفتـە مادییەکـە ئاستەنگی زۆری بۆ دروسـت کـردووم، بەتایبـەتی هەنـدێك سەرچـاوەی سـەردەمیم پیویست بووە نەتوانراوە دابین بکرێ.

## شەشەم: گرفتی نەبوونی پاڵپشت و هاندان بۆ بوارە فکری و نەهزەوییەکان.

مرۆڤ بەسروشت پێی خۆشە هان بدرێت و پاڵپشـتی هـەبێت، پێغەمبـەر(ﷺ) دەیان ڕێگاو وەسیلەی جیاوازی هـەبووە بـۆ هانـدان و پاڵپشـتی سـەحابەکان، ئـەم چەند بابەتەی من دەیان نووسم، زیاتر بـواری فکـری و هەسـتانەوەن، زۆر جـار لـە جیاتی هاندان و پاڵپشـتی سـاردت دەکەنـەوە. بـە نموونـە یـەکێك لـە زانـا پـاك و شارەزاو بیرمەندەکان لەلام خوێندوەو مامۆستامە، ڕۆژێکیان پێی وتم تـازە کتـێبی (نەوەی نوێ لە نێـوان فکـری ئیسـلامی و تیـۆری عـەلمانی) چـاپ کرابـوو، گـوتی مامۆستا ئەوەندە لەسەر بواری فکری مەنووسە بـا لاڕێ نـەبیت و ڕێـی بـێ دیـنی بگـری، وەك فـلان و فـلان!. پـێم وت قوربـان وەکـوو جـەنابت دەکـەم جـەنابت "الحمدالله" بیرمەندی و زۆر ڕاستەڕێی و دینداری.

**ڕۆژێکی تر مامۆستایەکی ئایینی،** دڵسۆز، کە زۆر لە من نزیکەو دەزانم منی زۆر خۆش دەوێ، هەر پێشنیارێکم بۆ بکات دەزانم لە دڵسـۆزی خۆیـەتی بـۆ مـن، بەڵام بۆم دەرکەوت قسەی خەڵك کاری تێ کردووە وتی، مامۆستا پێم باشە ئاگات لەخۆت بێ زۆر لەسەر فکر نەڵێی و نەنووسی وتم بـۆ؟ وتـی ئەوانـەی لەسـەر فکـر دەنووسن، یان لەم بوارە قسە دەکەن، لاڕێ دەبن وەك فلانە کەس!، وتم برام:

١- هەمومان پێویستمانە بترسین، کە توشی لاڕێی بین، چونکە پێغەمبەرمان (ﷺ) لەگەڵ ئەوەی کە پێغەمبەریش بووە بەردەوام ئەو دوعایەی کردووە فەرمویەتی: (يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دَيْنِكَ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ آمَنَّا بِكَ وَبِمَا جِئْتَ بِهِ فَمَا تَخَافُ عَلَيْنَا فَقَالَ نَعَمْ إِنَّ الْقُلُوبَ بَيْنَ أُصْبُعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ الرَّحْمَنِ يُقَلِّبُهَا).

ئەو فلانە کەسەی، کە تۆ باسی دەکەی ئەمە ئەهلی فکر و بیرمەند نییە تا لەسەر بیرمەندان حیساب بکرێت، ئەمەیان لە سیاسەت شکستی هێناوە و ئێستا کەوتووەتە ژێر ئەجێندای حیزبە عەلمانیەکان و کار بۆ ئەجیندایەکی تایبەت دەکات، ئەوەی دەیڵێ یان گوێ بیستی بووە لە شەحرورو عەدنان ئیبراهم، یان لە ڕێی هەندێ کتێبەوە خوێندویەتیەوە و نەقلی دەکات، نەك بیرمەند بێ و بە قەناعەتی خۆی لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکی زانستی گەیشتبێتە ئەم دەرئەنجامە، هەروەها ئەمە هیچ ڕۆژێك دیراساتی شەرعی نەخوێندوە و هیچ پسپۆریەکی لە شەریعەت نییە بۆیە گوناحە ئەمانە بهێنننە ڕیزی بیرمەندان و قیاسی لەسەر بکەن.

٢- لاڕێبوون پەیوەندی بە بواری فکرەوە نییە ئەگەر وابا ئەم هەموو کەسانەی کوردستان و جیهان بانگەشەی قورئان و سونەتیان دەکرد ڕازی نەبوون تەنانەت ناوی فکری ئیسلامیش بێت، بۆچی بونەتە عەلمانی و داردەستی بۆ ئەوان دەکەن، (فڵانەکەس) و (فڵانەکەس) لە کوردستان سەرەتای نەوەتەکان بەردەوام بانگەشەی قورئان و سونەتیان دەکرد، ئێستا لاڕێ بوون ئایە ئەوانە ئەهلی فکرن؟ بێگومان نەخێر، کەواتە لاڕێبوون پەیوەست نییە بە فکر.

٣- پیاوانی گەورەی وەك ناسری سوبحانی و سعید نوریسی و مەودودی و حەسەن بەناو نەوەوی و سید قطب و عبداللە عزام و محمد قطب و جمال بەرزنجی و

قەرزاوی و هەزاران بیرمەندی گەورەی جیهانی دونیایان پڕکردووە لە نووسراو وکتێب و خزمەتی ئیسلام زۆربەیان لە لایەن وڵاتانی دژ بە ئیسلام دەربەدەر کراون و داواکراوبوون ئایە ئەمانە لاڕێ وبێ دین بوون؟ بێگومان نەخێر.

## حەفتەم: نەبوونی سەرچاوە.

بابەتی مەنهەجی خوێندن و فێربوون بۆ سەردەم و زەمانێك گۆڕانی بەسەر دادێت، زانایان خوا پاداشتیان بداتەوە لەهەموو بوارێکیان نوسیووە، بەڵام بۆ دارشتنەوە و ڕێبەرێکی نوێ بۆ زانستخوازان بەتایبەتی لەئێستادا کەجومگەی سەرەکی خوێندن و فێربوون لەدەست عەلمانییەکانە زۆر ئەستەمە لەم بوارە شتێك بنووسی وا لە زانستخوازان بکات بیکەن بە مەنهەجی خۆیان و بەرچاوڕوونیان هەبێ، بۆیە سەرچاوەی لەم بارەیەوە ئەوەی من دەمویست زۆر کەم دەستم کەوت.

## هەشتەم:-ترسان لە قسەکردن لە هەندێ بابەت.

لە کاتی نوسینی ئەم کتێبە زۆر بە حەزەرەوە دەبو قسە لەسەر هەندێ بابەت بکەم، چونکە بەشێك لە زانایان لە کوردستان زۆر ئەستەمە بتوانن هەندێ ڕاوبۆچوون هەیە، کە لە لایان دروست بووە بیگۆڕن دەشزانن ئەمە ڕای زانایانە نەك قورئان و سوننەی سەحیحی پێغەمبەر (ﷺ)، هەروەها جاری وا هەیە زوو دەکەونە دژایەتیکردنی هەندێ کتێب بە بێ ئەوەی بیخوێننەوە لەبەر ئەوە زۆر بە حەزەرەوە دەبو دارشتنی بیرۆکەکان بکەم نەوەك دڵیان بڕەنجێ و نەهێڵن زانستخوازان بە تایبەتی فەقێیەکان لە مزگەوتەکان و خوێندنگا ئیسلامییەکان بیخوێننەوە بۆیە ئەمەش بوو بووە گرفتێك لە بەردەمم.

## نۆیەم: ڕاگرتنی هاوسەنگی.

یەکێکی تر لەم گرفتانە ئەوە بوو کاتێك باسی ڕێبەرێکی ڕیسالی و فکری دابڕێژین بۆ زانستخوازان، بەڵام گرفتەکە لەوە بوو، چۆن هاوسەنگی ڕابگرم لەنێوان مەنهەجی زانستی شەرعی و خوێندنگا ئیسلامییەکان، هەروەها لە هامانکاتدا چۆن بتوانم هاوسەنگی ڕابگرم تا خزمەت بەقوتابیانیش بکەم بەتایبەت خوێندنی هەموو بوارەکانی تر جگە لە شەریعەش سود بە ئیسلام و موسلمانان بگەیێنێ.

## دەیەم: نەبوونی کاتی پێویست.

بابەتێکی لەم شێوەیە کاتێکی زۆری دەوێت لە سەری بخوێنیتەوە و زانیاری لەسەر پەیدا بکەی، هەروەها تێڕامان و بیرکردنەوەو و داهێنانی دەوێ، ئەمانەش پێویستی بە خۆیەکلایەکردنەوە هەیە، بەڵام بەندە بەحوکمی سەرقاڵی زۆرم بە دەزگای ڕووناکی، پرۆژە و بەرنامە و ئیدارەیەکی زۆری دەوێت، جگە لەسەرقاڵبونم بە هەندێ کاری مەلایەتی و گرفتی خەڵك، کاتم زۆر کەم بە دەستەوە بوو، بەمەش زۆر جار دادەبڕام لە نووسینەکە و تا دەگەڕامەوە سەری گرفتی بۆ دروست دەکردم.

**لە کۆتایدا:** سوپاس بۆ خودا بەهەر جۆرێك بێت، بە شەوخونی توانیم بەسەر ئەم گرفتانەدا زاڵ ببم، خودای گەورە تەوفیقی دام تا کۆتایی بەردەوام بم، ئەمەش لە فەزوڵ و گەورەیی خودا دەزانم.

# گرنگیی زانست وەک سەرچاوە و ڕێبەری زانستخوازان

دیـارە بـەپێی تێگەیشـتنی بەنـدە، زانسـتخوازی و فـەزڵ و گـەورەیی زانسـت لەقورئاندا تەنها لە زانسی شەرعی، کورت نەکراوەتەوە لەگەڵ ئەوەی بەشێکی زۆر لە ڕاڤەی ئایەتەکان وایان تەفسیر کردووە، بەڵام زانسـت لەقوڕئانـدا زۆر بـەفراوانی هـاتووە و باسـی فـەزڵ و ڕێـزی تـەواوی زانسـتەکان کـراوە، بـە مـەرجێك بـۆ خزمەتکردنی مرۆڤایەتی و چاکە و خێر بەکاربێت و نیەتی کەسەکە خزمـەت بـێ بەکۆمـەڵگا و مرۆڤایـەتی، بێگومـان هـەر وشـەیەك بنووسـم نـاتوانم جـوانتر لـە ئایەتەکانی قوڕئان باس لە گرنگی و گەورەیی  زانست و فێربـوونی بکـەم، خـودای گەورە لەقوڕئاندا زۆرترین ئاماژەی بەباسی زانست و فێربوونی زانستی داوە، زیاتر لە (٧٧٩) جار تەنها ناوی زانست (علم)ی هێناوە، جگە لە وشەکانی تر کەمانای زانست دەگەینن، بەکورتی ئاماژە بەهەندێکیان دەکەین:

**١-** خوداناسـی و تێگەیشـتن لـە یەکتاپەرسـتی، بـە زانسـت بەسـتووەتەوە و فەرمانی پیێ کـردووە دەفـەرمووێت : ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾[(١)]. واتـە: (چاك بزانە و دڵنیابە ئەی محمد "ﷺ" جگە لە الله هیچ خوایەکی تر نییە).

**٢-** پێغەمبەران بەدوای زانستدا گەڕاون ، خودای گـەورە لـەبارەی پێغەمبـەر مووسی علیە السلام کە ئولولعەزمـە دەفـەرمووێت: ﴿ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلۡ أَتَّبِعُكَ

---

(١) سورەتی محمد ئایەتی ١٩ .

عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴾[(١)]. واتە: (موسی "علیه السلام" پێی گوت: ئاخۆ مۆڵەتم دەدەیت شوێنت بکەوم؟ تا لەو زانستەی لەلایەن پەروەردگارتەوە فێرکراویت منیش فێر بکەیت و نیشانمی بدەی بەڵکوو لە کاروبارمدا کەڵکی لێ وەرگرم).

**٣-** خاوەن زانستی بە خاوەنی عەقڵ و کاکڵی زیرەکی داناوە، دەفەرمووێت: ﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾[(٢)].
واتە: (ئەی **محمد** "ﷺ" بلێ: ئایا ئەو کەسانەی کە دەزانن و شارەزان وەك ئەو کەسانەن، کە هیچ نازانن و شارەزاییان نییە؟ بەڕاستی تەنها خاوەن بیر و هۆشەکان لەم جۆرە یادەوەریانە سود وەردەگرن و تێدەگەن).

**٤-** پلەی خاوەن زانستەکانی بە چەندان پلە بەرزتر کردووەتەوە، دەفەرمووێت: ﴿ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾[(٣)]. واتە: (ئەوانەی ئیمانیان هێناوە لە ئێوە و ئەوانەشتان، کە زانست و زانیاریتان پێدراوە خوای گەورە چەندەها پلە و پایە بەرزیان دەکاتەوە, خواش بە ئاگایە بەو کار و کردەوانەی دەیکەن).

**٥-** وەسفی خودان زانستەکانی کردووە بەدادوەر و شاهێدیدەر لەسەر یەکتاپەرستی خودا دەفەرمووێت: ﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْعِلْمِ قَآئِمًۢا بِٱلْقِسْطِ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾[(٤)]. واتە: (خوای

(١) سورەتی الكهف ئایەتی ٦٦ .
(٢) سورەتی الزمر ئایەتی ٩ .
(٣) سورەتی "المجادلة" ئایەتی ١١.
(٤) سورەتی" آل عمران" ئایەتی ١٨.

گەورە شایەتی داوە کە بەڕاستی جگە لەو هیچ پەرستراوێك نییە شایەنی پەرستن بێت, هەروەها فریشتەکان و خاوەن زانستەکانیش بە ڕێگایەکی ڕاست دەیسەلمێنن خوا هەمیشە دادپەروەری ڕەهایە و جگە لەو زاتە هیچ خوایەکی تر نییە و ئەو باڵادەست و دانایە).

**٦-** مرۆڤ بەهۆی زانستەوە لە فریشتە گەورەترە خودا فەرمانی کردووە سوجدە بۆ مرۆڤ ببەن دەفەرمووێت: ﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمۡ عَلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسۡمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾[١]. واتە: (ئادەمی فێری هەموو ناوەکان کرد و بە فریشتەکانی فەرموو: ئادەی ئێوە ناوی ئەو شتانەم پێ بڵێن ئەگەر ڕاست دەکەن و توانای ئاوەدانکردنەوەی زەویتان هەیە, فریشتەکان وتیان: پاك و بێگەردی و ستایش هەر شایستەی تۆیە, ئێمە هیچ زانستێکمان نییە تەنها ئەوە دەزانین کە تۆ فێرت کردووین, بەڕاستی تۆ پەروەردگارێکی دانا و زانایت).

**٧-** ئەوانەی خاوەن زانستن بەحەقناس وەسفیان دەکات دەفەرمووێت: ﴿ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلۡحَقَّ ﴾[٢]. واتە: (ئەوانەش کەلەلایەن خواوە لە زانیاریی بەشدراون، سوور ئەزانن ئەوەی کە بۆ تۆ ناردراوە لەلایەن پەروەردگارتەوە هەر ئەو ڕاست و دروستە).

---

(١) سوڕەتی "البقرة" ئایەتی ٣١ – ٣٢.
(٢) سوڕەتی سبأ ئایەتی ٦.

## لەبەر گەورەیی زانست بۆتە سیفەتێک و پێغەمبەرانی پێ وەسف کراوە

بێگومان پێغەمبەرایەتی گەورەترین پلەی مرۆڤایەتییە دراوەتە پێغەمبەران، دیارترین وەزیفەیان بووە، زۆربەیان لەقورئاندا بەسیفەتی زانست وەصف کراون:

أ- ئادەم "علیه السلام" باوکی مرۆڤایەتی بە مامۆستای زانست و فێرکەری هەموو بەشەریەت دادەنرێت، دوای ئەوەی خودا فێری زانستی دەکات هەرچی زانستە لەدوای ئەو پەیدا دەبێت دەگەرێتەوە بۆ باوکی مرۆڤایەتی، کە ئادەمە علیه السلام: ﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ﴾[1]. واتە: (خودا هەموو ناوەکانی فێری ئادەم کرد).

ب- خودای گەورە لەبارەی پێغەمبەر لوط ( سەلامی خودای لەسەر بێ) دەفەرموویت: ﴿ وَلُوطًا ءَاتَيۡنَٰهُ حُكۡمًا وَعِلۡمًا ﴾[2]. واتە: (بە لوط پێغەمبەریش حیکمەت و دانایی و زانیاریمان بەخشی).

ت- خودای گەورە لەبارەی پێغەمبەر داود و سلێمان دانایی و زانیاری پێغەمبەر ( سەلامی خودایان لەسەر بێ) دەفەرموویت: ﴿ فَفَهَّمۡنَٰهَا سُلَيۡمَٰنَۚ وَكُلًّا ءَاتَيۡنَا حُكۡمًا وَعِلۡمًاۚ ﴾[3]. واتە: (جا ئێمە چارەسەری کێشەکەمان لە سولەیمان گەیاند، هەردووکیانمان بەهرەوەر کردبوون لە حیکمەت و دانایی وعیلم و زانست).

---

(١) سورەتی البقره ئایەتی ٣١ .
(٢) سورەتی الأنبیاء ئایەتی ٧٤ .
(٣) سورەتی الأنبیاء ئایەتی ٧٩ .

پ- ئیمامی نیسابووری لە لەبارەی زاستەوە دەفەرموویێت: (ولم يفتخر سليمان بالمملكة العظيمة بل افتخر بالعلم، ولولا شرف العلم لم يكن للهدهد مع ضعفه أن يتكلم بحضرة سليمان بقوله "أَحَطْتُ بِما لَمْ تُحِطْ بِهِ", وهكذا الرجل الساقط إذا تعلم العلم صار نافذ القول على السلاطين، وما ذاك إلا ببركة العلم)[1].

واتە: سولێمان پێغەمبەر شانازی ناکات بەم هەموو موڵك و دەسەڵاتەی هەیەتی بەڵکو شانازی بەزانستەوە دەکات، ئەگەر گەورەیی زانست نەبووایە هود هود بەم لاوازیەی خۆی نەیدەتوانی لە لای سولێمان قسە بکات. دیارە بەهەمان شێوە پیاوێکی شکستخواردوو ئەگەر فێری زانست بوو، دەبێتە پیاوێکی قسەڕۆیشتوو لەلای دەسەڵاتدارەکان، بێگومان ئەمە لەبەرەکەتی زانستە.

ج- خودای گەورە لەبارەی پێغەمبەر یعقووب ( سەلامی خودای لەسەر بێ) دەفەرموویێت: ﴿وَإِنَّهُۥ لَذُو عِلۡمٍ لِّمَا عَلَّمۡنَٰهُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾[2].

واتە: (بەڕاستی یەعقووب خاوەنی زانستێك بوو، چونکە ئێمە فێرمان کردبوو، بەڵام زۆربەی خەڵکی ڕاستییەکان نازانن).

ح- خودای گەورە لەبارەی پێغەمبەر یووسف ( سەلامی خودای لەسەر بێ) دەفەرموویێت: ﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيۡنَٰهُ حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾[3].

خ- واتە: (کاتێکیش کە یوسف پێگەیشت و گەیشتە ئەوپەڕی تونودتۆڵی و ئێمەش پلەی فەرمانڕەوایی و دانایی و زانیاری شارەزایی باشمان پێبەخشەی, هەر بەو شێوەیەش پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە).

د- خودای گەورە لەبارەی پێغەمبەر مووسا ( سەلامی خودای لەسەر بێ)

---

(١) بڕوانە: تفسير النيسابوري = غرائب القرآن ورغائب الفرقان (١/ ٢٣٣).
(٢) سورەتی یوسف ئایەتی ٦٨.
(٣) سورەتی ئایەتی یوسف ٢٢.

دەفــــــــــــــەرمووێت: ﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسۡتَوَىٰٓ ءَاتَيۡنَٰهُ حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾[١]. واتە: (کاتێك تەمەنی گەیشتە ئەوپەڕی تونـدوتۆڵی, حیکمـەت و دانایی باشمان پێبەخشی, هەر بەو شێوەیەش پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە).

ژ- خودای گەورە لەبارەی پێغەمبـەر عیسـا ( سـەلامی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرمووێت: ﴿ وَإِذۡ عَلَّمۡتُكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ ﴾[٢]. واتـە: (هەروەها فێری نوسین و دانایی و تەورات و ئینجیلم کردی).

ر- خودای گەورە لەبارەی پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرمووێت: ﴿ وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمۡ تَكُن تَعۡلَمُۚ ﴾[٣]. واتــە: (خــوای گەورە قورئان و دانایی بۆ دابەزاندوویت و فێری ئەوشتانەی کردوویـت کـە جـاران نەتدەزانی).

﴿ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلۡقُوَىٰ ﴾[٤]. واتـە: (فریشـتەی خـاوەن هێـز (جوبرائیـل) فێـری قورئانی کردووە).

(ئیبن و قەییم) دەفەرمووێت: بەرزترین شت کە مرۆڤ بەدەستی بهێنێ دڵ پێی بگـات، بەنـدە پێـی بەرزببێتـەوە لـە دونیـا و دوارۆژ زانسـت و ئیمانـە ، خـودای گـەورەش بەیەکـەوە باسـی کـردووە. ﴿يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖۚ ﴾[٥]، واتــە (لـە ئێـوە و ئەوانەشـتان زانسـت و زانیاریـان پێـدراوە چەندەها پلەو پایە بەرزیان دەکاتەوە ).

ئەمانە هەڵبژاردە و ناوەرۆك و کاکڵی کۆمەڵگەن[٦].

---

(١) سورەتی ئایەتی القصص ١٤.
(٢) سورەتی المائدە ئایەتی ١١٠.
(٣) سورەتی النساء ئایەتی ١١٣ .
(٤) سورەتی النجم ئایەتی ٥ .
(٥) سورهتی المجادلە ئایەتی ١١ .
(٦) بڕوانە: الفوائد ابن القیم (ل ١٥١).

## گەورەیی زانست و فێربوونی زانستی شەرعی لە فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

خودای گەورە وەزیفەی سوننەتی پێغەمبەری (ﷺ) دیاری کردووە مەجالی بۆ ئێمە نەهێشتووتەوە قسە لەسەر پێگەو وەزیفەی پێغەمبەر (ﷺ) بکەین، بیخەینە قالبی زەوق و فەلسەفە و بەرژەوەندیی خۆمان چۆنمان بۆیێت ئاوا وەسفی بکەین، یان لەمەقامی کەم بکەینەوە[1] : ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ ﴾[2]. واتە: (ئێمە قورئانمان بۆ تۆ دابەزاند تاوەکو بۆ خەڵکی ڕوون بکەیتەوە کە بۆیان هێنراوەتە خوارەوە).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى ٱخْتَلَفُواْ فِيهِ ﴾ [3]. واتە: (ئێمە ئەم قورئانەمان بۆ تۆ دابەزاندووە تاوەکو خەڵکی لە هەرچییەك کێشەیان هەیە بۆیان ڕوون بکەیتەوە).

کەواتە مادام وەزیفەی سەرەکی پێغەمبەر (ﷺ) شیکردنەوەو ڕوونکردنەوەی قورئان بێ، (٧٧٩) جار زانست و زانیاری ڕاڤەکردبێ و شیکردبێتەوە کەواتە مادام چەقی سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) زانست و زانیاری بووە، تەنها لە فەرموودەکانی کۆکراوەتەوە لەکتێبێ صحیحی بوخاری (٣٠٠) جار ناوی زانست

(١) مەبەستم ئەم بۆچوونە هەڵانەیە کە قسە لەسەر سوننەت دەکەن گوایە سەرچاوەی تەشریع نییە! یان وەحی نیە! خودای گەورە زیاتر لەبابەتەکانی تر بە ڕوون و ئاشکرا فەرموویەتی : ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴾ سورەتی النجم ئایەتی ٣- ٤ .

(٢) سورەتی النحل ئایەتی ٤٤ .

(٣) سورەتی النحل ئایەتی ٦٤ .

(علم) هاتووه[١]، جگە لە کتێبەکانی تر وەك صحيحی مسلم و ترمزی و نسائی و ابن ماجەو ئەبوو داود و ئەوانی تر. بەکورتی ئاماژە بەگرنگی زانست دەکەین لـەم فەرموودانە:

**١- سـەرەتای دروسـت بـوونی مرۆڤایـەتی و ژیـان پێویسـتی بەخوێنـدن و زانستخوازی و قەڵەم هەیە:** عن عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ، قَالَ : سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) ، يَقُولُ : إِنَّ أَوّلَ ما خَلَقَ اللَّهُ الْقَلَمُ فَقَالَ: اكْتُبْ فَقَالَ: يَا رَبِّ مَا أَكْتُبُ؟ قَالَ: اكْتُبِ الْقَدَرَ مَا كَانَ وَمَا هُوَ كَائِنٌ إِلَى الْأَبَدِ)[٢].

واتە: گوێم لەپێغەمبەر بوو دەیفەرموو بەڕاستی یەکەم شت کـەخودا دروسـتی کرد قەڵەم بوو، پێی فەرموو بنووسە وتی ئەی خودایە چ بنووسم؟ فـەرموی قـەدەر بنووسە ئەوەی بووەو ئەوەی دەبێت هەتا هەتایە.

**٢- زانسـتخوازی ڕێگایـە بـۆ گەیشـتن بـە بەهەشـت و دوعـای خێـری دروستکراوەکانی خودا:**

عن ابیَ الدَّرْدَاءِ فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: (مَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَطْلُبُ فِيهِ عِلْمًا، سَلَكَ اللَّهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ، وَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ لَتَضَعُ أَجْنِحَتَهَا رِضًا بِمَا يَصْنَعُ، وَإِنَّهُ لَيَسْتَغْفِرُ لِلْعَالِمِ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ، حَتَّى الْحِيتَانُ فِي جَوْفِ الْبَحْرِ، وَإِنَّ فَضْلَ الْعَالِمِ عَلَى الْعَابِدِ كَفَضْلِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ عَلَى سَائِرِ الْكَوَاكِبِ، وَإِنَّ الْعُلَمَاءَ هُمْ وَرَثَةُ الْأَنْبِيَاءِ، إِنَّ الْأَنْبِيَاءَ لَمْ يُوَرِّثُوا دِينَارًا وَلَا دِرْهَمًا وَإِنَّمَا وَرَّثُوا الْعِلْمَ، فَمَنْ أَخَذَهُ أَخَذَ بِحَظّ وَافِرٍ)) [٣].

واتە: هەر کەسێك ڕێگایەك بگرێ مەبەستی زانستخوازی بێت، خـودای گـەورە

(١) بروانە: کتێبی العلم وبناء الأمم، د. راغب السرجانی، (ل ١٠).
(٢) ترمذی گێڕاویەتیەوە (٤٥٧/٤) ژ (٢١٥٥) .
(٣) ئیمـامی أحمـد لـە موسـنەدەکەیدا گێڕاویەتیـەوە (١٩٦/٥) ژ (٢١٧٦٣) ، هـەروا ئـەبو داود لـە سونەنەکەیدا (٣١٧/٣) ژ (٣٦٤١) .

بەم ڕێگای زانستخوازییە ڕێگای بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات، مەلائیکەتەکان باڵی خۆیان ڕادەخەن رازین بەم کردەوەی کە دەیکەن، وە ئـەوەی لـە ئاسمـان و زەویدایـە داوای لێخۆشبوون دەکات بۆ زانستخوازەکان، تەنانەت ماسییەکانی نێو دەریـاش، بەڕاستی پلەی زانا جیاوازە لەگەڵ خواپەرستێك وەك جیاوازی مانگ وایە لەشەوی چواردە لەگـەڵ ئەسـتێرەکانی تـر، بەڕاسـتی زانایـان میراتگرانـی پێغەمبـەرانن، پێغەمبەران دینارو درهەمیان بەجێ نەهێشتووە بەڵکوو زانستیان بـەمیرات بـەجێ هێشتووە، هەر کەسێك دەستی پێوە بگرێ، دەستی بە بەشێکی باش گرتووە.

**٣- ئەوەی خودا خێری بۆ بووێت فێری زانستی دەکات و دەبێتە زانستخواز:**

پێغەمبەر – (ﷺ) دەفەرموێت : (مَن يُرِدِ اللّٰهُ بِهِ خَيَراً يُفَقهْهُ فِي الدينِ) [(١)].

واتە: خودا خێری بۆ هەر کەسێك بوێت لەدینەکەی خۆی تێی دەگەیەنێ.

**٤- زانستخوازی واجبێکی شەرعییە:** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): (طَلَبُ الْعِلْمِ فَرِيضَةٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ)[(٢)].

واتە : زانستخوازی لەسەر هەموو تاکێکی موسڵمان واجبە .

**٥- پلەو پایەی زانستخوازان وەك پلەو پایەی موجاهیدەکانە لەڕێی خودا:**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، قَالَ : سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ : (مَنْ جَاءَ مَسْجِدِي هَذَا لَمْ يَأْتِهِ إِلاَّ لِخير يُعَلِّمُهُ ، أَوْ يَتَعَلَّمُهُ فَهُوَ بِمَنْزِلَةِ الْمُجَاهِدِ فِي سَبيلِ اللّهِ) [(٣)].

واتە: گوێم لەپێغەمبەر بوو دەیفەرموو هەر کەسێك تەنیا بۆ فێربـوونی خێرێـك هاتبێتـە مزگـەوت، یـان خـۆی فێـری زانسـت بکـات ئەمـە لەپلـەی موجاهیدانـە لەڕێگەی خودا.

---

(١) متفق علیه . بوخاری گێڕاویەتیەوە ژمارە (٧٣١٢)، وە موسلم بە ژمارە (١٠٣٧) .
(٢) ابن ماجە لە سونەنەکەیدا گێڕاویەتیەوە (١/ ٨١).
(٣) ابن أبيَ شيبة لە مُصنف دا گێڕاویەتیەوە (٢/ ٣٧١).

**٦- دانیشتن له کۆڕو مەجلیسی زانستخوازان سێ پله بەدەست دەهێنێ:**

عَنْ أَبيَ هُرَيْرَةَ ، عَنِ النَّبِيَ (ﷺ) قَالَ : (مَا مِنْ قَوْمٍ يَجْتَمِعُونَ فِي بيَت مِنْ بيَوتِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ، يَقْرَؤُونَ وَيَتَعَلَّمُونَ كِتَابَ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ يَتَدَارَسُونَهُ بينَهُمْ، إِلاَّ حَفَّتْ بِهِمُ الْمَلاَئِكَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ ، وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ) [(١)].

واته: هەر کۆمەڵەخەڵکێك له ماڵێکی خودا کۆببنەوە بخوێننەوەو خۆیان فێری قورئان بکەن له نێوان یەکتردا بەدەرس بێخوێنن، ئیلا مەلائیکەت دەوریان دەدات، خودا بەرەحمی خۆی دایان دەپۆشێ، خودا لەلای خۆی واتا لەلای مەلائیکەتانی لای خۆی باسیان دەکات.

(١) موسلم له صەحیحەکەیدا گێڕاویەتیەوە (٨/ ٧٢) ژ (٢٧٠٠) .

## جۆرەکانی زانست

پێش هاتنی ئاینی زانست و زانیاری و (إقرأ) جیهان سەرقاڵی جۆرەها زانستی جیاواز بوو، ئەوەی پشتگوێ خرابوو زانستی پێشکەوتن و خزمەتکردنی مرۆڤایەتی و فەرهەنگی و شەرعی و ئایینی بوو، کاتێك خۆری زانست هەڵات جگە لەوەی دەروازە بوو بۆ سەرجەم زانستەکانی ژیان، زانستی خزمەتکردن بە مرۆڤایەتی و جومگەکانی ژیان کە زانستی ئایینی و شەرعی بوو خستیەوە نێو کۆمەڵگاو ڕێیی تەواوی مرۆڤایەتی رۆشن کردەوە، زانستی کردە بنەمای ئەم ئومەتە کە پێشتر زانستێك نەبوو بەناوی ڕێبەری ژیان بۆ بوارەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری و فکری و فەرهەنگی و پەروەردەو فێرکردن. دوای کردنەوەی ئەم دەروازەیە دەستی کرد بە ڕێکخستن و پۆلێنکردن و ڕێزبەندی و دابەشکردنی زانست تا بەپێی پێوەری خاڵبەندی و گرنکی بۆ مرۆڤ پۆلینیان بکات، هەروەها زانستە بەسوودەکانیشی لەفلتەردا و بەرگێکی نوێی لەبەر کرد تا زۆرترین سوود بەمرۆڤایەتی بگەیەنێ، بۆ دیاریکردنی جۆرەکانی زانست دەگەڕێنەوە بۆ پوختەیەکی جوانی (ئیبن خەلدون) ئەم ووتەی کاتێك فەرمووە کە موسڵمانان گەیشتنە لوتکەی زانست و کۆتا قوناغی پێشکەوتن بوو لەم بوارەدا، دوای ئەم قۆناغە دووبارە موسڵمانان تووشی لاوازی و شکستێکی زۆر بوون لەڕووی زانست و پێشەنگییەوە:

### لەبارەی زانستەوە دەفەرمووێت:

(اعلم أن العلوم التي يخوض فيها البشر ويتداولونها في الأمصار، تحصيلاً وتعليماً، هي على صنفين: صنف طبيَعي للإنسان يهتدي إليه بفكره، وصنف نقلي يأخذه عمن وضعه. والأول هي العلوم الحكمية الفلسفية، وهي التي يمكن أن يقف

عليها الإنسان بطبيَعة فكره، ويهتدي بمداركه البشرية إلى موضوعاتها ومسائلها وأنحاء براهينها ووجوه تعليمها، حتى يقفه نظره وبحثه على الصواب من الخطإ فيها، من حيث هو إنسان ذو فكر. والثاني هي العلوم النقلية الوضعية، وهي كلها مستندة إلى الخبر عن الواضع الشرعي. ولا مجال فيها للعقل، إلا في إلحاق الفروع من مسائلها بالاَ صول،........ وأصل هذه العلوم النقلية كلها هي الشرعيات، من الكتاب والسنة التي هي مشروعة لنا من الله ورسوله)[(١)].

واتە: بزانە ئەو زانستانەی مرۆڤایەتی تێیدا قاڵبووەتەوە و لە نێوان ولآتاندا دەستاو دەست کراون، بۆ وەدەستهێنان و فێربوون، دوو بەشن: بەشێکیان سروشتین مرۆڤ ئاراستە دەکەن لەڕووی فکریەوە، بەشی دووەم زانستی (نەقلیە) وەرگیراوە لەو زاتەی کە دایناوە.

**زانستی یەکەم:** زانستی دانایی و فەلسەفی. ئەم جۆرەیان دەکرێ مرۆڤ لەسەری بووەستێ لەڕووە فکریەکەیەوە. بەپێی دەرککردنی مرۆڤ بوونەوە ڕینوێن دەکرێ بۆ بابەت و مەسألەو لایەنە بەڵگەدارەکان و ڕووە فێرکارییەکەی. تا تێدەگاو تێ دەڕوانێ و دەکۆڵێتەوە و ڕاست لە هەڵە جیا دەکاتەوە. لەڕووی ئەوەی کە ئەو مرۆڤە و خاوەن فیکرە.

**زانستی دووەم:** زانستی نەقلی داندراو، ئەمەیان گشتی پشت بەو خەبەرانە دەبەستی کە لەلایەن دانەری شەریعەت دانراوە (مەبەستمان خوداو پێغەمبەرە (ﷺ)، بواری بۆ عەقڵی مرۆڤ نەهێشتووتەوە ، تەنها لە بابەتە لاوەکییەکان نەبێت کە بەستراونەتەوە بە بابەتە سەرەکییەکان، بنچینەو بنەمای ئەم زانستە نەقلیانە هەموویان لە بەشە شەرعییەکانن کە سەرچاوەی گرتووە لە لەقورئان و سونەت ئەویش لەلایەن خودا و پێغەمبەر (ﷺ) داڕێژراون.

ئەم دابەشکردنەی ئیبن خەلدوون بۆ زانستی نەقلی و عەقڵی بۆ ئەوە بووە تا

---

(١) بڕوانە: مقدمة ابن خلدون (ل ٢٤٩).

زانستی شەرعی لەگەڵ زانستەکانی تر بەگشتی جیابکرێتەوە و فەزڵی زانستی شەرعی زیاتر بێت لەزانستەکانی تر چونکە پەیوەندی بەخودا ناسی و بیروباوەڕەوە هەیە، بێگومان زانستی نەقلی مەبەست لێی ئەوەی لە شەریعەتەوە بۆمان نەقل کراوە. زانستی عەقڵیش ئەو زانستەیە، کە خودای گەورە بۆ عەقڵی مرۆڤەکانی جێ هێشتووە تا داهێنانی تێدا بکەن ، شارو ولاّتی پێ ئاوەدان بکەنەوە بەپێی پێویستی ژیانی مرۆڤایەتی گونجاو لەگەڵ کات و شوێن پێشکەوتنی تێدا بکەن[1] خودای گەورە ئاماژەی بەوە کردووە، کە مرۆڤەکان بەشێك لەزانستەکانی مرۆڤایەتی دەزانن بە تایبەتی زانستە ڕووکەشەکان، کە مرۆڤ لە ڕێی هەستەکان یان بە تەجروبە دەرکی پێ دەکات: ﴿ يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِّنَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ ٱلْـَٔاخِرَةِ هُمْ غَـٰفِلُونَ ﴾[2]. واتە: (ئەوانە هەر ڕواڵەت لە ژیانی دونیا تێدەگەن و بێ ئاگاشن بەرامبەر بە قیامەت).

## کەواتە: بەشی زۆری زانایان زانستیان بۆ دوو بەشی سەرەکی دابەش کردووە:

١- زانستی شەرعی (العلوم الشرعیە).

٢- زانستی پێداویستیەکانی ژیان، یان ئاوەدانکردنەوەو بوارە عەقڵیەکان، (العلوم الحياتية أو العلوم العقلية).

---

(١) باسکردنی ئەم زانستانە لەلای ئیبن خەلدوون بەم فراوانییە نیشانەی گەیشتنی زانستەکانە بە لووتکەی پێشکەوتن لەسەردەمی ئەودا لەزانکۆ و جیهانی ئیسلامی بەگشتی.
(٢) سورەتی الروم ئایەتی ٧ .

## زانستە شەرعییەکان:

ئـەو زانســتانەن، کـە خـودای پـێ بناسـی و بەندایـەتی بـۆ بکـەی و شـێوازی خواپەرستیەکان بەشێوەیەکی زانستی وەك ئەوەی لە قورئان و سـوننەت دا هـاتووە جێبەجێی بکەی. پێك هاتوون لە: زانستی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) و بیرو باوەڕ و فقە و اصولی فقە و ئـەخلاق و زانسـتی زمـان و ئـەدەب و مێـژوو، تەواوی ئەم زانستانەی پەیوەندییان بەزانستی شەریعە هەیە.

## ڕەهەندەکانی مەنهەجی ئیسلامی

مەنهەجی ئیسلامی بەگشتی ئەم ڕەهەندانەی هەیە:

١- مـەنهـەجی هەڵسـوکەوتکردن لەگـەڵ بنـەماکان (الاصـول): ئـەوەش دوو ئاڕاستە دەگرێتەوە، مەنهەجی چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ قورئان و سوننەتی صەحیحی پێغەمبەر (ﷺ).

٢- مـەنهــەجی چــۆنیەتی هەڵســوکەوت کــردن لەگــەڵ کەلــەپووری ئیسلامی(التراث): ئەمەش شمولی دوو بابەت دەکات.

مەنهەجی چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ کەلـەپووری ئیسـلامی و چـۆنیەتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ کەلەپوری مرۆیی جیهانی.

٣- مـەنهەجی چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ واقیع.

ئەمەش بەهەمان شێوە شمولی دوو بابەت دەکات.

چـۆنیەتی هەڵسـوکەوتکردن لەگـەڵ واقیـع، کـە هەیـە, یـان بڵـێین بـەپێوەری لێکۆڵینەوەی زانستی چۆنە, چـۆنیەتی هەڵسـوکەوتکردن لەگـەڵ واقیـع، کـە چـۆن پێویستە ببێت، واتە ئەم لێکۆڵینەوانەی باس لە داهاتوو دەکەن[1].

(١) بڕوانە : المنهاج والمنهجية، طبيَعة المفهوم وأهميته والمفاهيم والمصطلحات ذات العلاقة، (ل ٢٩) .

## زانستە عەقڵییەکان:

زانکـــۆ و خوێنـــدنگاکانی ئێســـتا بەشـــێوەیەکی گشـــتی لـــەڕووی زانســـتە عەقڵییەکانەوە پێك دێن لە: زانستی زمان و کۆمەڵایەتی و بیرکاری و پیشەسـازی و کشتوکاڵ و زانستەبیرکاری و سروشتییەکانی وەك: ئەنـدازیاری و فیزیـاو کیمیـاو زینـــدەوەرزانی و فەلەکناســـی و پزیشـــکی و وەرزشـــی و هونـــەری و بونیـــات و جیولوجیّ و بایولوجیّ و گیانەوەرو ژینگەیی...هتد.

## ئایا پۆلێنکردنی زانست بۆ زانستی شەرعی و عەقڵی لەگەڵ قورئاندا تێک ناگیرێت

ئایا زانست و زانستخوازی و فەزڵ و گـەورەیی لـە قوڕئانـدا تـەنها بـە مانـای زانستی شەرعی دێت؟ قورئان پەیامێکی ئاسمانی و کتێبێکـی جیهانییـە تـەووای چەمکەکانی بەشێوازێکی جیهانی داڕشتووە هیچ زانستێکی لەبیر نـەکردووە، (مَـا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِنْ شَيْءٍ)[١]. هەموو زانستەکانی بە درێژی باس کردووە: (وَكُلَّ شَيْءٍ فَصَّلْنَاهُ تَفْصِيلًا)[٢]، زۆر بە فراوانی بە چەندان واتا و مەبەست زاراوەکانی بۆ شوێن و کاتی جیاواز بەکار هێناوە، هەر خۆیشی وەسفی خۆی کردووە بە جیهـانی وەك دەفـــــــــەرمووێت ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ﴾[٣]. واتە: (بەرز و بڵند و مەزنە ئەو زاتەی قورئانی دابەزاندووە بـۆ ئـەوەی ببێتـە جیاکـەرەوەی ڕاسـت و ناڕاسـت و ببێتـە هۆشـیارکەرەوە بـۆ دانیشـتووانی جیهان).

(١) سورەتی الأنعام ئایەتی ٣٨ .
(٢) سورەتی الإسراء ئایەتی ١٢ .
(٣) سورەتی الفرقان ئایەتی ١ .

وشـەی زانسـت و زانسـتخوازیش مـوڵكی تـەواوی مرۆڤایەتییـە و هـەموو مرۆڤایەتی لێی سوود مەندە و پێویستی پێیەتی، چەندان جۆری زانست لە قورئاندا باسكراون كورت نەكراوەتەوە لە زانستی شـەرعی ، ئایـا واتـاو مەبەسـتی زانسـت (العلم) تەنها بە مەبەستی زانستی شەرعی هاتووە؟ یان تـەواوی زانسـتەكانیتریش مادام خاوەنەكەی مەبەستی پێی خزمەتكردنی موسڵمانان بێت و ئاوەدانكردنـەوەو شارستانیەتی موسڵمانان بەرەو پێش ببات هەمان خێـری دەگـاتیٚ؟، ئایـا سـەقفی قورئان زۆر فراوانتر نییە بۆ واتاو مەبەستەكانی زانست و تـەواوی زاراوەكـانی تـر؟ بیرۆكەی **(زانستی شەرعی فەزڵی لەتەواوی زانستەكانی تر زیـاترە)** لـە زۆربـەی تەفسیرەكانی زانایان دا هاتووە و ئێمە كە دەگەڕێینـەوە بـۆ واتـاو فـەزڵی زانسـت لەجیاتی ئەوەی ماناكە لـە قورئـان وەرگـرین دەگەڕێینـەوە بـۆ قسـەی بەشـێك لـە زاناكان پێش گەڕانـەوەمان بـۆ واتاكـە لـە قورئـان، قسـەی زانایـانیش دەكـریٚ لـە سـەردەمێكەوە بـۆ سـەردەمێك بـەپێی زەمـەن و توانـاو ژینگـەو ئاسـتی زانسـتی گۆڕانكاری بەسەردا بێت ، یان ڕاڤەكردنی بەپێی توانای زانستی كەسەكەو ژینگە و ئاستی پێشكەوتنی زانستەكانی تر دەگۆڕێت، واتاكانی قورئان بۆیـە بـۆ هـەموو سەردەم و شوێن و كات و لۆكالی و جیهانییە، خودا دایڕشـتوەو لەگـەڵ تێـروانین و ڕاڤەی مرۆڤ زۆر لێك جیاوازە، دەكریٚ ڕاڤەی مرۆڤەكان بۆ كات و شوێنێك ڕاسـت بن، بەڵاّم مەرج نییە بۆ هەموو كاتێـك گونجـاو بـن، واتاكـانی قورئـان گشـتگیر و هەمە لایەنەیە. لەم چەند ئایەتە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، كە زانست بە چەندان واتای جیاواز هاتووە :

### ١- زانستی جەنگ:

خـودای گـەورە لـەبارەی زانسـتی چـەنگەوە دەفـەرموێت: ﴿ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰهُ عَلَيۡكُمۡ وَزَادَهُۥ بَسۡطَةٗ فِي ٱلۡعِلۡمِ وَٱلۡجِسۡمِۖ ﴾ [١]. ئیمـامی سـەمەرقەندی لـە تفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: (وكان رجلا جسيما وكان عالما بأمر الحرب)[٢].

واتە: تالوت پیاوێکی خاوەن لاشەو بالآیەکی بەرزو بەهێزی هەبوو زانا بـوو بـە کاروباری جەنگ.

هەروەها: ئیمامی واحیدی دەفەرمووێت:

(وَزادَهُ بَسْطَةً فَضِيلَةً وَسَعَةً فِي الْعِلْمِ بِالْحَرْبِ، وَفِي الْجِسْمِ بِالطُّولِ)[٣].

واتە: زانستێکی فراوانی پیێ درابوو لە جەنگ، خاوەن لاشەیەکی درێـژو بـەهێز بوو.

هەروەها: ئیمامی بەغەوی و نەسەفی دەفەرموون:

(كان أعلم بني إسرائيل بالحرب والديانات في وقته)[٤].

واتە: تالوت زاناترین کەسی بەنو ئیسرائیل بوو لە زانستی جەنگ و ئایینـەکان لەسەردەمی خۆی.

---

(١) سورەتی البقرە ئایەتی ٢٤٧ .

(٢) بروانە: تفسير بحر العلوم للسمرقندي، (١/ ١٨٨).

(٣) بروانە: التفسير الوسيط للواحدي (١/ ٣٥٧).

(٤) بڕوانە: تفسير البغوي -(١/ ٣٣٤). تفسير النسفي - دار النفائس (١/ ١٣١).

### ٢- زانستی ئابووری و بیرکاری:

خودای گەورە لەبارەی زانستی ئابوریەوە دەفەرمویێت: ﴿ قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ﴾ (١).

ئیمامی تەبەری دەفەرمووێت: «إِنِّي حَفِيظٌ لِمَا اسْتَوْدَعْتَنِي، عَلِيمٌ بِسِنِيِّ الْمَجَاعَةِ» .

واتە: من پارێزگار دەبم لەوەی پێم دەسپێرن، بە ساڵی برسیەتی زانامە.

هەروەها دەفەرمووێت: (إِنِّي حَافِظٌ لِلْحِسَابِ، عَلِيمٌ بالاَلْسُنِ)(٢).

واتە: من پارێزەرم بۆ کاروباری بیرکاری و ئابووری، زانام بە زمانەوانی.

ئیمامی سەمعانی دەفەرمووێت: {إِنِّي حفيظ عليم} أَي: حفيظ للخزائن، عليم بؤجُوه مصالحها(٣).

واتە: من شارەزام بە پاراستنی خەزێنەکان، زاناو شارەزام لە چۆنیەتی پاراستنی پەرژەوەندییە ئابووریەکان.

### ٣- زانستی ئاسنگەری و کەلوپەلی جەنگ:

خودای گەورە لەبارەی زانستی ئاسنگەری دەفەرمویێت: ﴿ وَعَلَّمۡنَٰهُ صَنۡعَةَ لَبُوسٖ لَّكُمۡ لِتُحۡصِنَكُم مِّنۢ بَأۡسِكُمۡۖ ﴾ (٤). واتە: (داودمان فێری دروستکردنی قەڵغان و زرێ کرد تاوەکوو لە کاتی جەنگدا ببێتە پارێزگاری بۆتان).

ئەو مەفهوومانەی لەم ئایەتە وەردەگیرێ لەوانە:

یەکەم کەس بوو زانستی ئاسنگەری دایهێناوەو کردویەتی(٥).

---

(١) سورەتی یوسف ئایەتی ٥٥.
(٢) بڕوانە: تفسير الطبري = جامع البيَان ت شاكر (١٦/ ١٥٠).
(٣) بڕوانە: تفسير السمعاني (٣/ ٤٠).
(٤) سورەتی الأنبيَاء ئایەتی ٨٠ .
(٥) بڕوانە: تفسير النسفى - (٣/ ٧٦).

قەتادە لەبارەی ئەم ئایەتە{ وَعَلَّمْنَاهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَّكُمْ }دەفەرموێت: قَالَ: كَانَتْ قَبْلَ دَاوُدَ صَفَائِحُ قَالَ: وَكَانَ أَوَّلَ مَنْ صَنَعَ هَذَا الْحَلْقَ وَسَرَدَ دَاوُدُ»[1].

یەکەم کەس بووە کەلوپەلی جەنگی دروست کردووە.

- نانی دەستی خۆی خواردووە لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەر بووە بەڵام کارو کەسابەتی کردووە .

- " وَإِنَّ نَبِيَ اللَّهِ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَام كَانَ يَأْكُلُ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ )[2].

واتە: بەڕاستی پێغەمبەر داود علیه السلام نانی دەستی خۆی دەخوارد.

- خودا فێری ئەم زانستەی کردووە کەواتە خێرو پاداشتی وەکوو زانستی شەرعییەو زانستەکە مادام خودا فێری کردبێ بێگومان شەرعییە، (و علمناه صنعة لبؤس لکم ) " واتە: فێری دروست کردنی زرێی جەنگ و چەك و سیلاح و پێداویستی جەنگمان کرد.

## ٤- زانستی فێربوونی زمانی جیاوازو باڵندەکان:

خودای گەورە لەبارەی زانستی زمانەوە دەفەرموێت: ﴿ وَقَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَيْءٍ ﴾[3]. واتە: (سولەیمان لەڕووی ددان نان بە نیعمەتەکانی خوا وتی: خەڵکینە! ئێمە فێری زمان و دەنگ و ئاوازی باڵندە کراویین تێگەیەنراوین و ئەزانین چی دەڵێن. بەشێکمان پێدراوە بۆ بەڕێوەبردنی حکوومەت و دەسەڵاتەکەمان ).

---

(١) بڕوانە: تفسیر الطبري (١٦/ ٣٢٩)، وتفسير عبد الرزاق (٢/ ٣٨٩) .

(٢) بوخاری لە صەحیحەکەیدا گێڕاویەتیەوە (٢/٧٣٠) ژ (١٩٦٦).

(٣) سورەتی النمل ئایەتی ١٦ .

ئیمامی سەمەرقەندی دەفەرمووێت: (یعني أعطینا علم كل شيء)[١]. واتە: زانستی هەموو شتەکانمان پێدا.

ئیمامی ئەبوو زوهرە دەفەرمووێت: (أي علم لغة الطیر)[٢]. واتە: فێربوونی زانستی باڵندەکان.

## ٥- زانستی لێکۆڵینەوە لە مرۆڤ.

خودای گەورە لەبارەی زانستی لێکۆڵینەوە لەمرۆڤەکان دەفەرموێت: ﴿ فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ خُلِقَ مِن مَّاءٍ دَافِقٍ يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ ﴾ [٣]. واتە: (مرۆڤ با سەیر بکات لەچی دروستمان کردووە, دروست کراوە لە ئاوێکی هەڵقولاو کە مەنی پیاو و هێلکۆکەی ئافرەتە, لە نێوان بڕبڕەکانی پشت و ئێسکەکانی سینەدا دەردەچێت).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَفِي أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴾ [٤]. واتە: (هەروەها لە خودی خۆشتاندا چەندان نیشانە هەیە بۆچی بیناییتان بەکار ناخەن).

ئەم دوو ئایەتە باس لە زانستی مرۆڤناسی دەکات بەتایبەتی باسی چۆنیەتی دروستبوونی مرۆڤ لە کاتی کۆرپەیی، ئەم زانستە ١٣ سەدەی بەسەردا رۆیشت ئینجا زانستی سەردەم توانی بگاتە ئەم ڕاستییە.

(١) بڕوانە: تفسير السمرقندي = بحر العلوم ط دار الفكر (٢/ ٥٧٦).
(٢) بڕوانە: زهرة التفاسير (١٠/ ٥٤٤٣).
(٣) سورەتی الطارق ئایەتی ٧ .
(٤) سورەتی الذاريات ئایەتی ٢١ .

## ٦- زانستی فەلەکناسی:

خودای گەورە لەبارەی زانستی فەلکناسی دەفەرموێت: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهْتَدُواْ بِهَا فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ﴾[1]. واتە: (هەر ئەو خوایەی، کە ئەستێرەکانی بۆ کردوونەتە ڕێنیشاندەر لە تاریکایی شەودا لە وشکانی و دەریادا).

## ٧- زانستی خواردن و گیانەوەر و گیاو ئاو و تەواوی بوارە جوگرافی و زیندەوەرییەکان باس کراوە وەک لەم چەند ئایەتەدا دەردەکەوێ .

خودای گەورە لەبارەی زانستی خواردن و گیانەوەر دەفەرموێت: ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا حَبًّا وَعِنَبًا وَقَضْبًا وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا وَحَدَآئِقَ غُلْبًا وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ﴾[2]. واتە: (دەبا ئادەمیزاد سەیری خۆراکەکەی بکات, ئێمە بارانمان بۆ دابەزاندووە, زەویمان بۆ لەت لەتکرد تا ڕووەکی تێدا چەکەرە بکات, ئینجا دانەوێڵەمان تێدا ڕواند, هەروەها ترێ و سەوزە و زەیتوون و خورما, هەروەها باخچەی چڕ و پڕ).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ رُفِعَتْ وَإِلَى ٱلْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ ﴾[3]. واتە: (ئایا سەیری حوشتر ناکەن چۆن دروست کراوە, سەیری ئاسمان ناکەن چۆن بەرز ڕامان گرتووە بێهیچ کۆڵەکەیەك, سەیری شاخەکان ناکەن چۆن دامان کوتاوە بە ناخی زەویدا, سەیری زەوی ناکەن چۆن نەخشاندوومانە).

---

(١) سوڕەتی الأنعام ئایەتی ٩٧ .
(٢) سوڕەتی عبس ئایەتی ٣١ .
(٣) سوڕەتی الغاشیە ئایەتی ١٧ — ٢٠ .

هەروەها دەفەرمویت: ﴿ قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ ﴾ [(١)]. واتە: (پێیان بڵێ سەیری ئاسمانەکان و زەوی بکەن بزانن چی تێدایە).

هەروەها دەفەرمویت: ﴿ سَنُرِيهِمۡ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلۡأٓفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمۡ ﴾ [(٢)]. واتە: (ئێمە لە داهاتوودا بەڵگەی سەرسوڕهێنەریان نیشاندەدەین لە ئاسۆکانی بونەوەر و لە خودی خۆشیاندا تاوەکو بۆیان ڕوون ببێتەوە).

## تروسکەیەک لەسەر ئەم بابەتە:

دەکرێ ئەم پێغەمبەرانە (صەلات و سەلامی خودایان لی بێ) خاوەنی ئەم زانستانە بوون و ژیانی مرۆڤایەتییان پێ گۆڕیوەو خۆشگوزەرانییان بۆ تەواوی مرۆڤایەتی فەراهەم هێناوە، ئایا ئەوانە خاوەنی ئەم زانستە بەرزانە بن بۆ سەرخستنی دینی خودا بەکاریان هێنابێ بڵێین ئەمە خێرو پاداشتی لە بازنەی زانستەکانی دونیایە، یان خێری وەك کەسێك نییە کە زانستی شەرعی شارەزایە، ئایا دەکرێ ئەم زانستە پێویستانە بۆ ژیانی کەسەکان ناو ببەی بەزانستی نا شەرعی، یان لە زانستی شەرعی هەژماری نەکەی بێگومان نەخێر، چونکە زۆر جار زانستی وا هەیە موسڵمانان پێویستیان پێیەتی کاتێك کەس نەبێ ئەدای بکات بێگومان هەمویان گوناهبار دەبن، چونکە دەچێتە بابێ فەرزی کیفایە، مادام بەنەکردنی گوناهبار بن بەکردنیشی خێرو پاداشتیان هەیە وەکو زانستی شەرعی.

---

(١) سوڕەتی یونس ئایەتی ١٠١ .
(٢) سوڕەتی فصلت ئایەتی ٥٣ .

## ڕای ئەو زانایانەی تەفسیری زانستیان کردووە بەوەی خێرو پاداشتی گەورە تەنها بۆ هەڵگرانی زانستی شەرعییە

لەم ئایەتانەی پێشوو بۆمان دەرکەوت قورئان زۆر بەفراوانی باسی بابەتی زانستی کردووەو جۆرەها زانستی بەپێغەمبەران داوەو پێغەمبەرانیش خێرو پاداشتیان لەسەر وەرگرتووە ، بەدرێژایی چەند سەدەیەك زانایانی ئیسلام زۆر بەقووڵی و بە فراوانی چوونەتە نێو تەواوی زانستە جیاوازەکان بە هاوتایی لەگەڵ زانستی شەرعی گرنگی تەواویان بە زانستەکانی تر داوە، تێی گەیشتوون کە ژیان بەبێ زانستەکانی تر خاوەنداریەتی ناکرێ بۆیە لە تەواوی زانستەکان بوونەتە سەرمەشق و داهێنانیان تێدا کردووە، بەلاّم بەشێکی زۆر لەزانایانی پێشین و ئێستاش بۆچونیان وابووە خێرو پاداشتی گەورە و لەپێشینیان تەنها بۆ زانستی شەرعی داناوە لەم بەڵگانەی خوارەوە بەکورتی ئاماژەیان پێ دەکەین:

ئیبن حبان لە ڕاڤەی ئەم فەرمودەیە (من سلك طريقا يطلب فيه علما) دەفەرمووێت:

في هذا الحديث بيَان واضح أن العلماء الذين لهم الفضل الذي ذكرنا هم الذين يعلمون علم النبيَ (ﷺ) دون غيره من سائر العلوم[1].

واتە: لەم فەرموودەیە بەڕوونی دەردەکەویت، کە ئەوانەی فەزڵ و گەورەییان هەیە تەنها ئەم زانایانەن کە زانستی پێغەمبەریان هەیە جیا لە تەواوی زانستەکانی تر.

- ئیبنولحەجەر: لەبارەی زانستەوە دەفەرمووێت: (والمراد بالعلم: العلم

(١) بڕوانە: صحيح ابن حبان (١/ ٢٩٠) .

الشرعي الذي يُفيد معرفة مايجب على المكلَّف من أمر دينه في عباداته ومعاملاته...) [١].

واته: مەبەست لە زانست ئەو زانستە شەرعیەیە كە سوودبەخشە بۆ كەسی موكەلیف تا لەدینەكەی تێ بگات لە معامەلاّت و كاروباری ڕۆژانەی و بەندایەتیكردنی بۆ خودا شارەزا بێت.

- ئیمامی زەهەبی لەبارەی زانست (العلم)، دەڵێت: علم النحو : النحويون لا بأس بهم ، وعلمهم حسن محتاج إليه ، لكن النحوي إذا أمعن في العربيَة ، وعري عن علم الكتاب والسنة بقي فارغا بطالا لعابا ، ولا يسالَه الله في الآخرة ، بل هو كصنعة من الصنائع كالطب والحساب والهندسة لا يثاب عليها ولا يعاقب إذا لم يتكبر على الناس[٢].

واته: زانستی نەحوو زانستەكەیان باشەو خەڵك پێویستی پێیەتی، بەلاّم كەسی شارەزا لەزانستی نەحوو ئەگەر زانستەكەی روت بوو تەنها لە نەحوو بەبێ قورئان و سوننە زانستەكە بەتاڵەو كەمە و گاڵتەیە، لەڕۆژی دوای لێی ناپێچرێتەوەو پاداشتیشی نییە، بەڵكوو جۆرێكە لەپیشەسازی پزیشكی و بیركاری و ئەندازیاری هیچ پاداشت وەرناگرێ و سزاش نادرێ ئەگەر خۆی بەگەورە نەزانی لەسەر خەڵك.

- **ئیمامی نەوەوی لە ڕاڤەی ئەم فەرمودەیەدا** (من سلك طريقاً يلتمس فيه علماً ...) دەفەرمووێت: والمراد العلم الشرعي ويشترط أن يقصد به وجه الله تعالى[٣].

واته: مەبەست لە وشەی زانست، زانستی شەرعییە مەرج تێیدا زانستەكە لەپێناوی خودای گەورە بێت.

---

(١) بڕوانە: فتح الباری (١ / ١٤١).
(٢) بڕوانە: زغل العلم (ل ٤٠).
(٣) بڕوانە: شرح النووي على صحيح مسلم (١٧/ ٢١).

- **ئیمامی شاتبی لە کتێبی "موافقات" دا دەفەرمووێت:**

(فالعلم الذي الثناء فيه وعلى طالبيَه هو فقه كتاب الله وسنة رسوله (ﷺ)، وما عدا ذلك فإن كان وسيلة إلى خيَر فهو خيَر، وإن كان وسيلة إلى شر فهو شر[1].

واتە: ئەو زانستەی جێگەی سوپازگوزارییە لەگەڵ هەڵگرەکەی تێگەیشتنە لە قورئان و سونەتی پێغەمبەر(ﷺ) جگە لەمانە ئەگەر ڕێگا بێ بۆ خێر ئەمە خێرە، ئەگەر ڕێگا بێ بۆ شەڕ ئەمە شەڕە .

- **شێخ (عبدالرحمن النجدى) دەفەرمووێت:**

العلم: وهو معرفة الهدى بدلَيله. والعلم إذا أطلق فالمراد به العلم الشرعي الذي تفيد معرفته ما يجب على المكلف من أمر دينه.

واتە: زانست ناسینی ڕێگای هیدایەتە بەبەڵگە، وەزانست ئەگەر موتلەقی گوترا مەبەست پێی زانستی شەرعیە کە سوود بە کەسەکان دەگەیەنێ تا فێری ئەو فەرمانانە بن کە لەسەریان واجب کراوە.

هەروەها دەفەرمووێت:

والمراد بالعلم: العلم الشرعي الذي هو نور القلوب وحياتها, وغيره علم نسبيَ إضافي إما إلى أمور دنيوية, أو علوم حسابيَة وصناعية أو غير ذلك, وأهله ليسوا من أهل العلم إلا على العلم الشرعي الديني[2].

واتە : مەبەست لە زانست زانستی شەرعیە کە نوری دڵ و ژیانیەتی، جگە لە زانستی شەرعی زانستەکانی تر ڕێژەیی و بۆ لادراون یان بۆ کاروباری دونیایی یان

(١) بڕوانە: شرح كشف الشبهات ويليه شرح الأصول الستة، للشيخ محمد بن صالح بن محمد العثيمين (ل ١٣١).

(٢) بڕوانە: حاشية ثلاثة الأصول للشيخ عبد الرحمن بن محمد بن قاسم العاصمي القحطاني الحنبلي النجدي (ل ١٤).

بۆ زانستەکانی بیرکاری و پیشەسازی و ئەوانی تر, ئەمانە خاوەنەکانیان ئەهلی زانست نیین تەنها زانستی شەرعی نەبێ.

ئەمانە ڕای بەشێك لەو زانایانە بوو لە بارەی بابەتی زانست، بێ گوومان زانایانی تر هەن هەمان ڕایان هەیە، بەلاّم بەکورتی ئاماژەمان پێ کرد بۆ ئەوەی بزانین ئەم بۆچونانە مێژوێکیان هەیەو تا ڕادەیەك کاریگەریان هەبووە لەسەر ئاوەدانکردنەوەو پێشکەوتن، لەم بابەتە پرسیارێك دروست دەبێ ئایا ئەوە نیە موسڵمانان لە سەدەکانی پێشوو گەیشتونەتە لوتکەی زانست و زانیاری و شارستانیەت هەمان بۆچونیان هەبووە ، بێگوومان بەلێ بەلاّم ئەو کاتە دەوڵەت لەڕێی دام و دەزگا و سیستەمەکانی خزمەتگوزاری و ئاوەدانکردنەوە

**ئایا بیروکەی ( زانستی شەرعی خێرو پاداشتی لە زانستەکانی تر زیاترە لەلای بەشێك لەزانایان) زەرەری بە پێشکەوتنی موسڵمانان نەداوە؟.**

موسڵمانان لە سەدەکانی ڕابردوو پیشەنگی مرۆڤایەتی بوون لە تەواوی بوارەکانی ژیان بە شارستانیەت و ئاوەدانکردنەوەش، تا مەنهەجی خوێندن و گرنکیدان بە زانستەکان بەگشتی، لەتەواوی مزگەوت و خوێندنگاکان لەجیهانی ئیسلامی دەخوێندران بەزانستی فەلەك ناسیشەوە ، کتێب و نووسراوەکانی جیهانی ئیسلامی سەرچاوەی هەموو زانکۆکانی ڕۆژئاوا بوو، زانستی موسڵمانان بووە هۆکار بۆ هەستانەوەی ڕۆژئاوا بەشاهیدی خۆیان، لەوانەیە کەسێك پرسیار بکات بلێ ئەم جیاکارییە لە زانست چ پەیوەندیەکی بەپێشکەوتن هەیە؟ بۆ وەلاّمی ئەم پرسیارە پێویستمان بەم خالاّنە هەیە تا بگەینە وەلاّمێکی دروست کە بەشێك لەهۆکاری دواکەوتنمان لە جیهان و پێشکەوتنی ڕۆژئاوا بیروکەی (تەنها خۆ خەریککردن بە زانستی شەرعی فەزڵ و خێری هەیە نەك زانستەکانی تر)!!!.

١- ئەوەی زانست تەنها بە زانستی شەرعی لێك دەداتەوەو پێی وایە تەنها

ئەوانە لەلای خودا پاداشتیان هەیە زانستەکانی تر نیانە هەڵەن ، بێگومان پشتگوێخستنی زانستی شەرعی و گرنکی پێ نەدانی ئەمەشیان هەڵەیەکی زۆر کوشندەیە چونکە زانستی شەرعی بنەمای زانستەکانە، بەلاّم نابێ هیچیان بۆ هیچیان پشتگوێ بخرێ و گرنگی پێ نەدرێ بەڵکوو دەبێ هاوسەنگ بێن لەنێوانیاندا.

٢- پاش ئەوەی لەبابەتی سەرەوە بەبەڵگەی قورئانی سەلماندمان، کە زانست لەقورئاندا فەزڵ و گەورەیی هەیە بەهەموو جۆرەکانیەوە ئیدی ئەمە بەسە بۆ وەلاّمی ئەم پرسیارە.

٣- ئەم زانستانە بێگومان لەڕووی حوکمی شەرعییەوە دەچنە خانەی فەرزی کیفایە، واتە: ئەگەر موسڵمانان پێی هەڵنەستن تەواویان گوناهبارن هەتا کارەکە ئەنجام دەدەن و بەرپای دەکەن، ئەمەش بۆ خزمەتکردنی موسڵمانان و مرۆڤایەتییە.

٤- کاتێك بیروکەی (تەنها خۆ خەریککردن بە زانستی شەرعی فەزڵ و خێری هەیە نەك زانستەکانی تر). موسڵمانان پشت لەزانستەکانی تر دەکەن و گرنکی پێ نادەن دەبێتە هۆی پاشەکشەی موسڵمانان لەم بوارانەدا جگە لە زانستی شەرعی.

٥- پێشکەوتنی ولاّت لەڕووی ئاوەدانی و شارستانیەتەوە پێویستی بە زانستەکانی تر هەیە، ناکرێ موسڵمان پشت لە خزمەتکردنی مرۆڤایەتی بکات.

٦- ئەوەی ئایەتی قورئان و فەرموودەی شیرینی پێغەمبەر (ﷺ) دەخوێنێتەوە تەنها بەتیوری دەیخوێنێتەوە و لەبەریەتی، بەلاّم ئەوەی تر زانستەکان دەکاتە کارو لەواقیعی عەمەلی جێ بەجێ دەکات زیاتر ماندوو دەبێت و شەونخوونی زیاتر دەوێت.

٧- ئەندازیارو پزیشك و تەواوی خاوەن پسپۆڕرییەکان لە زانستەکانی تر جگە لە زانستی شەرعی هەوڵی ئەوە دەدەن گرنکی بە زانستەکەی خۆیان نەدەن! یان

بگوازنەوە بۆ  شارەزایی لەزانستی شەرعی مادام وایان پێ گەیشتووە زانستەکەیان خێری قیامەتی ناگاتێ.

٨- ناکرێ و نالۆژیکییە کەسێك پسپۆرییەکەی بۆ پێشکەوتن و خزمەتکردنی موسڵمانان بەکار بینێ پاداشتی وەك زانستی شەرعی نەبێ بۆ نموونە: (پزیشك نەخۆش چارەسەر بکات، ئەندازیار بیناسازی بکات، شارەزای بواری تەکنەلۆژیای سەردەم خزمەتی هاوولاتییان بکات لە گەیاندن و ڕاگەیاندن، مامۆستا لەپەروەردەو فێرکردن، پسپۆرییەکان سەربازی لە دروستکردنی چەك و تفاقی جەنگ بۆ پاراستنی سنورو و ولاتی موسڵمانان، شارەزای بواری ئابووری لە بەهێزکردنی ئابووری ولات، تا دەگاتە دروستکردنی تاقەی نەوەوی و هەموو ئەم زانستانەی بەنیەتی خزمەتکردنی موسڵمانان بەتایبەت و مرۆڤایەتی بەگشتی وا لەقەڵەم بدرێت ئەمانە لەبەر ئەوەی زانستی شەرعی نین و زانستی دونیایین خێر و فەزڵ و پاداشتیان نییە)!!!.

٩- ئێستا ڕۆژئاوا بووەتە خاوەنی تەواوی زانستەکانی تر، موسڵمان لەولاتی موسڵمانان زۆر کەم گرنکی بەم زانستانە دەدەن، کەواتە بەردەوام دەبێ چاویان لەڕۆژئاوا بێ بۆ فێربوون و بەرهەمی ئەم زانستانە.

١٠-ئەمە وای کردووە نەوەی نوێ وا حاڵی ببێ ئیسلام دژی زانستە! یان بەلای کەم دژی پێشکەوتنە، تەنها ڕۆژئاوا بە داهێنەری ئەم زانستانە دەزانی.

١١- تەواوی بەرهەمەکانی زانستی عەقڵی لەڕۆژئاوا دێت، واتە ئەوەی دروست دەکرێت بە داو دەرمان و جۆرەها خۆراك و پێداویستییەکان لەدەستی ئەوانە هیچ زەمانێك نییە ئایا چۆنی دروست دەکەن، حەلاڵە یان حەڕامە، مرۆڤەکان توشی نەخۆشی دەبن یان نا؟ کەل و پەلەکانیان زەرەر مەندن بۆ موسڵمانان یان نا؟.

١٢-لەجیهانی عەولەمە ئابووری بەهێزترین هۆکارە بۆ پێشکەوتن، بەهۆی ئەوەی تەواوی زانستەکانی سەردەم جگە لە زانستی شەرعی لە دەست ئەواندایە،

ئەم زانستانەش سەرچاوەی سەرەکی بەهێزکردنی ئابوورین کەواتە ئەمەش لەدەست موسڵمانان دەردەچێت و دەکەوێتە دەستی ڕۆژئاوا.

١٣- بەبێ زانستی دونیاوە (وەك ناویان لێناوە) زەوی ئاوەدان ناکرێتەوە خوداش داوای ئاوەدانکردنەوەمان لێ دەکات: ﴿ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا ﴾(١).

واتە: (چونکە هەر ئەوە لەم زەوییە ئێوەی بەرپاکرد و بەدیهێنان و کردنیشی بەئاوەدانکەرەوەی زەویی).

١٤- بۆ پەیداکردنی رزق و ڕۆزی پێویستمان بە زانستی دونیەوی هەیە: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ ﴾(٢).

واتە: (ئەو خوایەیە کە زەویی ڕامکردووە بۆتان، بەهەر شێوەیەك بتانەوێ سوودی لێ وەربگرن ئامادەیە، لەگەڵ ئەو هەموو جموجوولە و سوڕانەوەیدا، ئێوە زۆر بە ئاسوودەیی ژیانی خۆتانی تیا ئەبەنەسەر، جا کەوابوو بچن بەهەموو گۆشەو کەنارێکیا و لە ڕزق و ڕۆزیی بخۆن).

١٥-چارەسەرکردنی مرۆڤەکان بەبێ زانستی پزیشکی نابێ، کە زانستێکی وەصف کراوە بە دونیایی کەچی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێ کردووە بێگومان جێبەجێکردنی فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) پاداشتی هەیە:
(...يَا عِبادَ اللَّهِ تَدَاوَوْا فَإِنَّ اللهَ عَز وجلَّ لَم يَضَع دَاءً إِلَّا وَضَعَ لَهُ شِفاءً...) (٣).
واتە: (ئەی بەندەکانی خودا خۆتان چارەسەر بکەن خودای گەورە هیچ نەخۆشیەکی بەبێ چارەسەر دانەناوە).

---

(١) سورەتی هود ئایەتی ٦١ .
(٢) سورەتی الملك ئایەتی ١٥ .
(٣) ئیمامي أحمد لە موسنەدەکەیدا گێڕاویەتیەوە (٣١٥/٤) ژ (١٨٨٥١) هەروا دارقطنی لە العلل (٢٨/٦) ژ (٩٥٨).

- **ئیمامی شافعی** بەر لە(١٠٠٠) ساڵ درکی بەم هەقیقەتە کردووە فەرموویەتی زانایانی ئیسلام لە زانستەکانی تر دوور کەوتونەتەوە و کەوتوونەتە دەست ئەهلی کیتاب دەفەرمووێت:

(لا أعلم علما بعد الحلال والحرام أنبل من الطب، إلا أن أهل الكتاب قد غلبونا عليه ويقول : ضيعوا ثلث العلم)(١).

واتە: نەم زانیوە زانستێك هەبێ چاکتر دوای زانستی حەلال و حەڕام لە زانستی پزیشکی بەڵام ئەهلی کیتاب لەم زانستە بەسەرماندا زاڵبوون سێیەکی زانستمان لەدەست داوە.

- **بەسەرهاتی ئیمامی مازەری و زانستی پزیشکی:**

ئیمامی مازەری نەخۆش کەوت زۆر بەگرانی کەس نەبوو چارەسەری بکات تەنها یەهودیەك نەبێت، کاتێك بەهۆی چارەسەری یەهودیەکە خودا شیفای بۆ نارد ، دەستی کرد بەخوێندنی زانستی پزیشکی تا فێری بوو فەتوای لەبواری زانستی پزیشکی دەدا وەك چۆن فەتوای لەزانستی فیقه دەدا (٢).

١٦-خودای گەورە فەرمانی بەجیهاد کردووە جیهاد کردنیش بەبێ چەك و ئەسبابەکانی جەنگ نابێ ئەمانەش هەر زانستی دونیایین دروستکردنیان واجبە جێبەجێکردنی خێرو پاداشتە : ﴿ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ ﴾ (٣). واتە: (هەرچی لە تواناتاندا هەیە ئامادەی بکەن لە ئەسپ و کەل و پەل و کەمتەرخەمی مەکەن تاوەکوو دوژمنانی خوا و ئێوە چاوترس بکەن).

---

(١) بڕوانە: الطب النبوي للذهبيَ (ل ٢٢٧).
(٢) بڕوانە: سير أعلام النبلاء للذهبيَ (٢٠/ ١٠٥).
(٣) سورەتی الأنفال ئایەتی ٦٠.

ئـەم دەسـەڵاتە زۆردارانـەی ئـەمڕۆ بەسـەر موسـڵماناندا زاڵـن هۆكارەكـەی بـۆ لاوازیـی ئێمـە دەگەڕێتـەوە لـەڕووی گرنكـی نـەدانمان بـەم زانسـتانەوە بەتایبـەتی زانستی جەنگ و پێداویستییەكانی.

١٧-پێغەمبەر (ﷺ) فـەرمانی بەهەنـدێك صـەحابە كـردووە فێـری هەنـدێك زانست بن، كەناویان نراوە زانستی دونیایی لەوانە: فەرمانی بە زیدی كوری سـابت كرد فێری زمانی یەهودی و سریانی ببێ[١].

ئیمامی حاكم لە "المستدرك" دا دەفەرموویێت: ئیبن زوبێر (١٠٠) مێرد منداڵی هەبوو هەر یەك بە زمانێكی جیاواز قسەیان دەكرد[٢].

كەواتە پێویستمان بەوە هەیە هەردوو زانستی شەرعی و عـەقڵی بەهاوسـەنگی گرنگی پێ بدەین ئینجا دەتوانین بەرەو پێش بچین.

## مەبەستمان لە دابەشكاری زانست و شیكردنەوەی بۆ دوبەش و گرنكییەكەی چیە؟

ئـەم دابەشـكارییە جـارانیش لەكتێبـەكانی پێشـوو كـراوە بـەڵاّم بـەم شـێوە پۆلێنكردنە و تەركیز كردن لەسەر بەشی دووەم لەزانستە (مرۆیی و پیشـەییەكان ) بەتایبەتی بە زمانی كوردی نەكراوە، ئەگەر چی لە زمانی عـەرەبیش هـەر دەسـتم نەكـەوت! بەهــەرحاڵ مەبەســتمان تێیــدا ڕاســتكردنەوەو گرنكیدانــە بەتــەواوی زانسـتەكان، دیـارە زۆربـەی زۆری كتێـب و محـازەرەو وتـاری هـەینی و ڕاگەیاندنـە ئیسلامییەكان و زانكۆو پەیمانگا تایبەتەكان بـە بـواری زانسـتە ئیسـلامییەكان و

(١) قَالَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ: أَمَرَنِي رَسُولُ الله (ﷺ) فَتَعَلَّمْتُ لَهُ كِتَابَ يَهُودَ، وَقَالَ: إِنِّي وَاللهِ مَا آمَنُ يَهُودَ عَلَى كِتَابِي فَتَعَلَّمْتُهُ، فَلَمْ يَمُرَّ بِي إِلاَّ نِصْفُ شَهْرٍ حَتَّى حَذَقْتُهُ، فَكُنْتُ أَكْتُبُ لَهُ إِذَا كَتَبَ وَأَقْرَأُ لَهُ، إِذَا كُتِبَ إِلَيْهِ بروانه: سنن أبيَ داود (٤/ ٢٣٩).

(٢) (عَنْ عُمَرَ بْنِ قَيْسٍ قَالَ : كَانَ لِابْنِ الزُّبَيرِ مِائَةُ غُلاَمٍ يَتَكَلَّمُ كُلُّ غُلاَمٍ مِنْهُمْ بِلُغَةٍ أُخْرَى) بروانه: المستدرك للحاكم (٣/ ٥٤٩).

بەشـێکی زۆر لەلێکۆڵینـەوەو زۆرتـرین وەسـائیلەکانی گەیانـدن تـەرکیزیان تـەنها لەسەر زانستە شەرعیەکانە، بەتایبەت مەبەستمان پێی دەڵێن خێرو پاداشـتی ئـەم ئایەتانەی قورئـان و فـەرمووودەکانی پێغەمبـەر (ﷺ) کەباسـی زانسـت دەکـەن تەنها زانستی شەرعی دەگرێتەوە! ئومێـد دەکـەم بـەم جیاکارییـە و وردەکارییـەی لێرەدا لەسەر زانستەکانی تر کرا ببێتە هۆکار لێرە بەدواوە وەکو زانسـتی شـەرعی گرنکی بەزانستەکانی تربـدەین، بـەهێزکردنی زانسـتەکانی تـر زانسـتی شـەرعیش بەهێز دەکات، تا ئومەت بـەهێز بێـت ئەوەنـدەش پاڵپشـتی بـۆ دەعـوەو زانسـتی شەرعی زۆر دەبێـت، ڕۆژئـاوا ئێسـتا بـەهۆی بـەهێزی لەزانسـتەکانی تـر هـەموو جیهانی ئیسلامییان کەوتوتە دەست، چۆنیان بوویێت ئاوا هەڵیدەسووڕێنن، تەنانەت ئایینە گۆڕدراوەکان لەئەوروپا باویان نەمابوو، ئێستا بەهۆی بەهێزیان لەزانستەکان بەجۆرەها شێوە بانگەشە بـۆ ئایـدولۆژیاکانیان دەکـەن، دەسـتیان دەگاتـە هـەموو شوێنێك و خەڵك لـەداو دەرمانـەوە تـا دەگاتـە زۆرینـەی پێداویسـتییەکانی ژیـان پێویستیان بەوانە، کاریگەرییان دروست کردووە لەسەر هـەموو تـاك و کۆمـەڵگاو ولاتێك! ڕۆژئاوا لە تەواوی زانستەکان بالا دەستە جگە لەزانستی شـەرعی، دیـارە موسڵمانان تەنها لەبەر ئـەم خاڵـە لاوازە دواکـەوتوو نـین بـەلام ئەمـەیان یەکێکـە لەخاڵە سەرەکییەکانی پێشەنگی و پێشکەوتن و شارستانیەت و هەستانەوە، هـیچ میللەتێك هەڵناستێتەوە تـا بالادەسـت نـەبێ لـە تـەواوی زانسـتەکان، ئێسـتا بـۆ ماوەی سەدەیەکە بەتایبەتی لە دوای ڕووخـانی خەلافـەتی ئیسـلامی لـە جیهـانی ئیسلامی تاك لەمنداڵییەوە لەهـەموو مینبەرەکانـەوە تـەنها گـوێی لـەوە دەبێـت زانستی شەرعییە و لە قورئان وسوننەت باسـکراوە و مـەدحکراوەو تـەواوی خێـرو پاداشتیش هەر بۆ خاوەنی ئەم زانستەیە، ئەم جـۆرە تەفسـیرانە کاریگـەری لەسـەر تاك دروست دەکات ئەگەر لە بوارێکی تریش توانای هەبێ ڕێڕەوی خۆی بگۆڕێ بۆ

زانستی شـەرعی، یـان بـەلای کـەم ئەوەنـدە گرنکـی بەزانسـتەکانی تـر نـەدا وەك کـارێکی سروشـتی و پیشـەیی سـەیری بکـات، دوور لەپاداشـتی دوارۆژ، شـارەزاو خاوەن زانستی شەرعی لەجیهانی ئیسلامی سوپاس بۆ خودا یـەکجار زۆرن، بـەلاّم لەزانسـتە پیشـەیی و مرۆییـەکان یـان لـە خاوەنداریـەتی دروسـتکرن لەشـتە گەورەکانەوە بگرە تا دەگەیتە دەرزیـەك مـۆری ئـەوروپا و ولاّتـانی تـری لەسـەرەو ئەوان دروستی دەکـەن، واتـە لـە هـەموو شـتێك پێویسـتیمان بەوانـە بەجلـەکانی بەریشمانەوە، ئەگەر لەبابی فەرزی کیفایەش بیّ نـەمانتوانیوە جێبـەجێی بکـەین، چونکە فەرزی کیفایە ئەگەر نەهاتە دی و کارەکە ئەنجام نەدرا بیّ گومان هەمومان تاوانبارین.

## هەڵوەستەیەک

زانایانی پێشین توانییـان دونیایـەك لـە زانسـت و زانیـاری بـۆ خوشـگوزەرانی مرۆڤەکان بەگشتی و موسڵمانان بەتایبەتی فەراهەم بکـەن، سـەروەتێکی زانسـتی زۆر فراوان و گەورەیان بۆ ئێمە جیّ هێشـتووە ، لـە هـەموو زانسـتە جیاوازەکـان گەیشـتنە لوتکـە، کتێـب و نووسـراوەکانیان تـا ئێسـتاش وەك ئـەوەی بـۆ ئـەمڕۆ نوسرابێتەوە بنەمای سەرەکین بۆ زانستی ئـەمڕۆ ، خوزگـە ئێمـە لـەم سـەردەمەدا دەمانتوانی بە ئەندازەی ئەوان یان بەچەند پلە کەمتر لەوان داهێنانمان لە زانست و زانیاری بکردایە، بەلاّم بەداخەوە ئەوەندەی خەریکی چاولێکەری ڕۆژئاواین ئەوەندە ڕوومان لەم سەروەتە زانستییەی پێشینی خۆمان نییە، دیارە ئەم بابەتەی لەپێشدا باسمان کرد لەبارەی جۆرەکانی زانست هەروەها شیکاری کام زانست خێـری زیـاترە بـۆ پێشخسـتن و شـیکردنەوەو تێگەیشـتنی بابەتەکەیـە، نـەك تانـەدان یـان بەکەمگرتنی هەنگاوی گەورەی زانایانی پێشوو ، تا ئەگەر باشین باشتر بین ئەگـەر لەدواوەین بچینە پێش ، ئەگەر کەوتوین لەڕووی زانستییەوە هەستینەوە، کـام لاو

شوێن کەمترین هەڵەی تێدایە، یان کەموکوڕی ڕاستی بکەینەوە، ئیسلام و موسڵمانان لە رەخنەی بوونیات نەر نەترساون بەڵکوو بۆتە هۆکار بۆ پێشخستن و هەنگاونان بۆ سەرکەوتن.

## ئاسانکارییەکانی ئیسلام بۆ زانستخوازان و فێربوونی زانست

زۆرجار لەلای هەندێك لە عەلمانییەکان بانگەشەی بێ بنەما دەکەن لەسەر ئیسلام گوایە دژی زانستە و ناتوانێ لەگەڵی هەڵبکات، یان موسڵمانەتی ڕێگرە لە زانست ، بێ گوومان ئەمانە تەنها گومانی بێ بەڵگەو بنەمان، ئیسلام زیاتر لە (١٣) سەدە تەواوی بوارەکانی زانستی گەیاندە لوتکە، زانکۆو خوێندنگاکانی جیهان شاهیدی ئەم ڕاستیەن موسڵمانان لە ساڵی (٧١٠) ی میلادی گەیشتنە ئیسپانیا و صەقلیە کاریگەری زۆریان لەسەر تەواوی جیهان و ریسانسی ئەوروپی کرد(مارتن لوتەر) [١]، راهیبێکی ئەڵمانی و مامۆستای لاهوتیە دەڵێت: (وقد كانت الجامعات الاوروبيَة لاتزال تعتمد على كتب العلماء المسلمين التي ترجمت الى اللاتينية) [٢]، واتە: تا ئێستاش زانکۆکانی ئەوروپا پشت بە کتێبەکانی زانایانی ئیسلامی دەبەستن، کە وەرگێردراون بۆ سەر زمانی لاتینی [٣]، جگە لەوەی زۆر

(١) بروانە: ویکی پیدیا" الموسوعه الحره".

(٢) بروانە: خصائص حضارتنا ، د. مصطفى السباعي.

(٣) دیاترین ناوی بەشێك لە زانایانی موسوڵمان کە خاوەنداریەتی زانستە جیاوازەکانیان کردووە بەتایبەتی ئەوانەی کاریگەرییان لەسەر ریسانسی ئەوروپی هەبوو لەبوارو زانستە جیاوازەکان وەك: علوم الرياضيات، الفلك، الجغرافيا، الكيمياء، الطب، الطب النفسي، الميكانيكا، الهيدروليات، التكنولوجيا، البصريات. ناوەکان: ابن سينا، ابو القاسم الزهرازي، أبو بكر الرازي ، خوارزمي، أبو كامل، ثابت بن قرة، الكوهي، أبو الوفاء البوزجاني، عمر الخيام، الكاشي. الفزاري، وابوو معشر البلخي، الفرغاني، إبراهيم بن سنان، البتاني، نصير الدين الطوسي. اليعقوبيَ، ابن خرذابة، الإصطرخي، ابن حوقل، المقدسي، البكري، الإدريسي، ابن جبير، ياقوت الحموي، القزويني، أبو الفداء، ابن بطوطة. جابر بن حيان ،ابن الجزار، علي بن العباس، الزهراوي، ابن سينا، ابن زهر، ابن النفيس، علي بن العباس ،الرازي، جبرائيل بن بختشيوع، وابن سينا، سكرة الحلبيَ، رشيد ←

گرنکی بەزانست داوە لەم سەدانەی ڕابردوو بێگومان زۆرترین ئاسانکاریشی کردووە بۆ زانست و زانستخوازان، **ڕێگرو گرفتەکانی لە بەردەم زانستخوازان لاداوە تا زۆرترین زانست بەدەست بینن:**

لەوانە:

**١- دەرگای زانستی بەفراوانی کردووەتەوە.**

هەر کەسێك بیەوێت زانست فێر بێت دەرگای فراوانی بۆ کراوەتەوە و مرۆڤی وا ڕاهێناوە بەدوای زانست بکەوێ، بە زانستی کەم "اکتفا" نەکات دەروازەی زانست زۆر فراوانە لەم ئایەتانەی قورئان زیاتر ڕوون دەبێتەوە:

- ﴿ وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِن بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ ﴾ [(١)]. واتە: (ئەگەر هەموو درەختەکانی سەر زەوی قەڵەم بن و دەریاش چەندەیە ببێتە حەوت ئەوەندە مەرەکەب هێشتا زانست و زانیارییەکانی خوا تەواو نابێت).

ئیمامی نوحاس دەفەرموویێت: فقد تبين أن الكلمات ههنا يراد بها العلم[(٢)].

واتە: بۆمان ڕوونبووەتەوە ئەم وشانە لێرەدا باس کراوە مەبەست پێی زانستە.

- ﴿ وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا ﴾ [(٣)]. واتە: (بڵێ ئەی پەروەردگارم زانستم زیاتر بکە).

ئیمامی قورتبیێ دەفەرموویێت: فلو كان شيء أَشْرَفَ مِنَ الْعِلْمِ لَأَمَرَ اللَّـهُ تَعَالَى

---

الدين أبو حليفة، بنو موسى بن شاكر، حسن بن الهيثم، البيرووني، الخازن، بديع الزمان الجزري، وكمال الدين الفارسي. بروانە: علوم الحضارة الإسلامية ودوورها الإنساني: د. علي عفيفي.

(١) سورەتی لقمان ئایەتی ٢٧ .

(٢) بروانە: معاني القرآن للنحاس (٥/ ٢٩١).

(٣) سورەتی طه ئایەتی ١١٤.

نَبِيَّهُ (ﷺ) أَنْ يَسالَهُ الْمَزِيدَ مِنْهُ كَمَا أَمَرَ أَنْ يَسْتَزِيدَهُ مِنَ الْعِلْمِ[١].

واتــه : ئەگــەر شــتێك هەبووايــە باشــترو چــاكتر لــە زانســت خــودا فــەرمانی بەپێغەمبەر (ﷺ) دەكرد داوای بكات وەك ئەوەی فـەرمانی پــێ كـردووە داوای زیادبوونی زانست بكات.

ئیمامی نەسەفی دەفەرمووێت: (ما أمر الله رسوله بطلب الزيادة في شــيء إلا في العلم) [٢].

واتە: خودای گەورە فەرمانی بەپێغەمبــەر (ﷺ) نــەكرد لــەهیچ شــتێك داوای زیادی بكات جگە لەزانست.

- هذا توجيه للنبيَ (ﷺ للاسـتزادة مـن العلـم، فمـا دُمْـتَ أنـت يـا رب الحافظ فزِدْني منه[٣].

ئیمامی شەعراوی لەبارەی ئەم ئایەتە ( وَقُل رَّبِّ زِدْنِــي عِلْمــاً ) دەفــەرمووێت: ئەم ئاڕاستەیە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) بۆ داواكردنی زیادبوونی زانستە، تاوەكو ئــەی پەروەردگارم بەردەوام زانستم بۆ زیاد بكە.

**پێغەمبەر (ﷺ) لەخودا پاڕاوەتەوە و داوای زانستی كردووە.**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ، قَـالَ: كَـانَ رَسُـولُ اللَّـهِ (ﷺ) يَقُـولُ: "اللَّهُـمَّ انْفَعْنِي بِمَا علَّمتني، وَعَلِّمْنِي مَا يَنْفَعُنِي، وَزِدْنِي عِلْمًا[٤].

واتە: ئەی پەروەردگار سوودم پێ بگەینە لەو زانستەی فێـرت كـردووم، وە ئــەو زانستەم فێر بكە، كە سوودم پێ دەگەیەنێ ، هەروەها زانستم بۆ زیادكە.

---

(١) بروانە: تفسير القرطبيَ (٤/ ٤١).
(٢) بروانە: تفسير النسفي - دار النفائس (٣/ ٦١).
(٣) بڕوانە: تفسير الشعراوي (١٥/ ٩٤١٥).
(٤) بڕوانە: تفسير ابن كثير ت سلامة (٥/ ٣١٩).

**٢- قورئان بانگی مرۆڤەکان دەکات بۆ زانست لە ڕێگەی بەکارهێنانی عەقڵەوە.**

ئەگەر بەوردی تەماشای ئایەتەکانی قورئان بکەی دەبینی بزوێنەرێکی زۆر بەهێزە بۆ عەقڵ، داوا لە عەقڵ دەکات شیکردنەوەو تیڕامان بکات، وردبێتەوەو هەڵێنجاندن بکات، پەند وەرگرێ و زانست زیاد بکات، ڕازی نەبێ بەداخستنی عەقڵ و تەقلید، خۆراکی عەقڵیش بێگومان زانستە، دەیان ئایەت و فەرمودەی پێغەمبەرمان (ﷺ) داوای کاراکردنی عەقڵ دەکەن بۆ گەشەسەندن و بەهێزکردنی بوارە زانستەکان، دەیان وشەی وەك (أولو الالباب، أولی النهی، یعقلون، تعقلون، متوسمین، تفکرون، تذکرون) ی بەکارهێناوە هەموویان بەڵگەن لەسەر ئاسنکاری و هاندانی مرۆڤ بۆ پەیداکردنی زانست وزانیاری[1].

**٣- بەکارهێنانی هەستیارەکانی بۆ پەیداکردنی زانست.**

یەکێکی تر لەم ڕێگایانەی ئیسلام هانی مرۆڤەکان دەدات زانستی پێ زیاد بکات بەکارهێنانی هەستیارەکانی ئەندامەکانی مرۆڤە، دیارە زانست لە دیارترین چالاکییەکانی مرۆڤە، مرۆڤیش ئەندامی هەیە هەر بەشێکی لە ئەندامەکانی بۆ کارێك دانراوە قاچەکان بۆ ڕۆیشتنە، دەست بۆ کارکردن، چاو و دڵیش بۆ فێربوون و زانستە، خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴾[2]. واتە: (خوای گەورە ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێناوە هیچتان نەدەزانی و چاو و گوێ و دڵی بۆ دروستکردن بەڵکوو سوپاس گوزار بن).

---

(١) بڕوانە: القران والنظر العقلي، فاطمة اسماعيل، (٦٦ / ٨٠).

(٢) سوڕەتی النحل ئایەتی ٧٨ .

هــەروەها دەفــەرمووێت: ﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴾ [١]. واتە: (شوێنی شـتێك مەكـەوە كـە زانست و زانياريت دەربارەی نييە چونكە گوێ و چاو و دڵت هـەمووی بەرپرسـيارە بەرامبەری).

- شيخ الاسلام( ئيبن تيميه) دەفەرمووێت: (ثُمَّ إِنَّ اللَّهَ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى خَلَقَ الْقَلْبَ لِلْإِنْسَانِ يَعْلَمُ بِهِ الْأَشْيَاءَ كَمَا خَلَقَ لَهُ الْعَيْنَ يَرَى بِهَا الْأَشْيَاءَ وَالْأُذُنَ يَسْمَعُ بِهَا الْأَشْيَاءَ)[٢].

واتە: خودای گـەورە دڵـی بـۆ مرۆڤـەكان دروسـت كـردووە تـا شـتەكان بزانـێ، هەروەها چاوی بۆ دروست كردووە تا شتەكان پێ ببينێ گوێيەكانيش تـا شـتەكانی پێ ببيستێ.

- شـيخ عبـدالرحمن السـعدی: لـەبارەی ئايـەتی ((وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَـٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۙ )) دەفەرمووێت: (خص هذه الأعضاء الثلاثـة ، لشـرفها ، وفضلها ، ولأنها مفتاح لكل علم)[٣].

واتە: خودای گەورە ئەم سێ ئەندامـەی لەشـی مرۆڤـی تايبـەت كـردووە لەبـەر گەورەيی و ڕێزيان، هەروەها ئەمانە كليلی هەموو زانستێكن.

## ٤- بەدواكەوتنی ڕاستی وحەق، بەڵگەو يەقين بۆ بەدەستهێنانی زانست.

ئيسلام وەك سيستەمی ژيان و وەحی خودايی و پەيامی پێغەمبەران سەرچاوەی

(١) سورەتی الإسراء ئايەتی ٣٦ .
(٢) بڕوانە: مجموع الفتاوى (٩/ ٣٠٧).
(٣) بڕوانە: تفسير السعدی (ل ٤٤٥).

ڕاستی و حەق و بەڵگەو یەقینە، داواش لەمرۆڤەکان دەکات ڕێڕەوی حەق و ڕاستی بگرن و بەدوای بەڵگەو یەقین دا بگەڕێن، زانستەکانتان لە ژێرڕۆشنایی بەڵگەو یەقین بێت.

- بۆ زیاد بوونی زانست خودای گەورە داوای بەڵگەودەلیل دەکات دەفەرموویێت: ﴿ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَـٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴾ (١). واتە: (پێیان بڵێ بەڵگەکانتان بهێنن ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن).

- داوای ڕاستگۆیی و لەگەڵ بوونی ڕاستگۆیان دەکات دەفەرموویێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴾ (٢). واتە: (ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە لە خوا بترسن و لەگەڵ ڕاستگۆیاندا بن).

بۆ جێگیرکردنی زانست داوای تێکەڵنەکردنی حەق و باتڵ دەکات تا حەق نەشاردرێتەوە دەفەرموویێت: ﴿ وَلَا تَلْبِسُوا۟ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَـٰطِلِ وَتَكْتُمُوا۟ ٱلْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ (٣). واتە: (ڕاست و ناڕاست تێکەڵاو مەکەن و ڕاستی مەشارنەوە لە کاتێکدا دڵنیان، کە ڕاستییە و ئێوە دەیزانن).

- یەقین پێویستە بۆ زانستخوازان ، نابێ بەدوای گومان بکەون بۆیە داوای دوور کەوتنەوە دەکات لە گومان دەفەرموویێت: ﴿ وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنًّا ۚ إِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ۚ ﴾ (٤). واتە: (زۆربەیان تەنها شوێنی گومان دەکەون, بەڕاستی گومانیش هیچ سوودێك بە خاوەنەکەی ناگەیەنێت).

(١) سورەتی البقرة ئایەتی ١١١ .
(٢) سورەتی التوبة ئایەتی ١١٩ .
(٣) سورەتی البقرة ئایەتی ٤٢ .
(٤) سورەتی یونس ئایەتی ٣٦ .

هەموو ئەم بەڵگەو دەلیلانە بۆ ئاسانکاری و دەرگا کردنەوەیە بەڕووی زانستخوازان تا زۆرترین زانست بەدەست بهێنن ، هەوڵی زۆری بۆ بدەن لەپەیداکردنی زانست ماندوونەبن وانەزانن زانست کۆتایی پێ دێ، یان خاڵی لووتکەی هەیە نەخێر زانست بێکۆتایە: ﴿ وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ﴾ [1]. واتە: (بەڕاستی بەشێکی زۆر کەمتان لە زانست پێدراوە).

ئەمەش هەر پاڵنەرێکی بەهێزە تا مرۆڤ تا لەژیان ماوە لە دوای زانست کوڵ نەدات و بەردەوام بێت.

## ٥- لادانی ڕێگری و ئاستەنگەکانی ڕێگای زانست.

جگە لەوەی ئیسلام هەموو دەرگاکانی بەڕووی زانست و زانستخوازان کردووەتەوە تەواوی ڕێگری و بەربەستەکانی سەر ڕێگای زانستخوازانیشی لاداوە، هەرچی گومان و دوودڵی و بەدواکەوتنی هەواو هەوەس و دەروونی نا تەندروست و وتووێژی بێسوود و لاری بوونی بەحەڕام داناوەو داوای کردووە لێی دوور کەوینەوە، سیحرو کەهانە و فاڵ و نوشتەو تەواوی چاولێکەری ناتەندروستی قەدەغەکردووە، تا زانستخواز خاوەن عەقڵێکی ژیرو بیرکردنەوەیەکی ڕاست و بڕیارێکی تەندروست و سوودبەخش بێ، هەر هەنگاوێك ببێتە هۆکار بۆ داخستنی عەقڵ و بەستەلەك بوونی بیرکردنەوەو تێڕامان ڕێی لێ گرتوە و زانستخوازی لێ ئاگادار کردووەتەوە.

- خودای گەورە دەفەرموویێت بەدوای هەواو هەوەس مەکەون: ﴿ فَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلۡهَوَىٰٓ أَن تَعۡدِلُواْۚ ﴾ [2]. واتە: (نەکەن شوێن ئارەزووی نەفس بکەون و لە دادپەروەری لابدەن).

(١) سورەتی الإسراء ئایەتی ٨٥ .

(٢) سورەتی النساء ئایەتی ١٣٥ .

- چاولێکەری کوێرانە مەکەن:﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلْ نَتَّبِعُ مَآ أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ ۗ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴾[١]. واتە: (کاتێك پێیان دەڵێیت شوێنی ئەو بەرنامەیە بکەون، کە لە لایەن خواوە هاتووە دەڵێن نەخێر هەر شوێنی ئەوە دەکەوین کە باو و باپیرانمان لەسەری ڕاهاتبوون, ئایا ئەگەر باو و باپیرانیشیان تێنەگەیشتووبن هەر شوێنیان دەکەون).

- ئەوانەی بیرناکەنەوە چاویان لە ڕاست حەق کوێر کردووە و گویان کەڕ کردووە بەگیانلەبەر ناوی بردوون، چونکە هەنگاوەکانیان زانستی نیین: ﴿ إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلْبُكْمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴾[٢]. واتە: (بەڕاستی خراپترین زیندەوەران لای خوا ئەوانە کە کەڕ و لاڵن و ژیر نابن).

هەریەك لە هەواو هەوەسووجادوو چاولێکەری دەرگای زانست دادەخەن ڕێگرن لە بەردەم زانستخوازان، بۆیە قورئان تەواوی ئەم ڕێگایانەی داخستووەو هەڕەشەی لە خاوەنەکانیان کردووە نزیکی نەکەون دوورتان دەخاتەوە لە زانست.

---

(١) سورەتی البقرە ئایەتی ١٧٠ .

(٢) سورەتی الأنفال ئایەتی ٢٢ .

# زانست و هەڵگیرساندنی شۆڕش

زانست و شۆڕش دوو چەمکی لێکدراون بۆ هەستانەوەی گەلان لە هەرشوێنێك زانست هەبێ شۆڕش و هەستانەوە یان سەر هەڵدەدات یان نزیك بووەتەوە، کۆمەڵگا بەسروشتی خۆی بۆ هەر فەترەو زەمەنێك پێویستی بەشۆڕشێك هەیە مەرج نییە شۆڕش تەنها گوزارشت بێت لە جەنگ و وەرگرتنی حوکم ـ شۆڕشی زانیاری و تەکنەلۆژیاو پێشکەوتن و شارستانیەت و ئاوەدانکردنەوەو پێشکەوتن لە پێویستییەکانی بەردەوامی مرۆڤایەتین بەگشتی، ڕۆژئاوا لە چەرخی ناوەڕاست لە زەلکاوی نەفامی و دواکەووتویی دەژیا هیچ بوارێك نەبووە شانازی پێ بکات ، دیارە هەستانەوەی ڕۆژئاوا وەك هەموو گۆڕانکارییەکانی تر پێشینێکی هەبووە کاریگەری لەسەر دروستبونی ئەم شۆڕشە دروست کرد([1])، بە شاهێدی بیرمەند و نوسەر و ڕۆژئاواییەکان شۆڕشی ئەورووپا بەکاریگەری زاناو زانست و زانکۆ و خوێندنگاکانی جیهانی ئیسلامی دروست بوو، ئەمەش بەچەند قۆناغێکی جیاواز دیارترینیان قۆناغی وەرگێڕانی زانستە جۆراوجۆرەکانی موسڵمانان بۆ ڕۆژئاواو جیهانی ئەووروپی لە چەرخی (٦هجری — ١٢ میلادی) ، وەرگێڕانی کتێبەکانی

---

(١) سەردەمی ڕاپەرین و هەستانەوە سەردەمێکی زێڕین بوو، گرنگەکی زۆری هەیە لە مێژووی ئەورووپای نوێ، ئەم ڕابوونە بوو ئەورووپای ڕزگارکرد لە شەڕێکی خوێناوی (١٠٠) ساڵە، سەردەمی نوێکاری و داهێنان و شارستانیەت ژیاوە. چەند بیرمەندێکی گەورە سەریان هەڵدا جێگەی ئاماژەپێکردنە لەوانە: جۆن لوك، ئیمانئوێل کانگ، ڤۆلتێر، ئادم سمث هتد...، چەندینی تریش لەدوای ئەوە، دەوڵەتی (فصل الدين عن الدولة)یان ڕاگەیاند، لەوانە ئەمریکا، هەر لەسەرەتاوە لە ساڵی (١٧٧٦)ی زایینی دەوڵەتی عەلمانی بووە. لە دەستوردا هاتووە ساڵی (١٧٨٩) زایینی دەڵێت: (ان الدين مسالَة شخصية)، هەروەها فەرەنسا (فصل الدين عن الدولة) یەکێکە لەبەرهەمەکانی شۆڕشی (١٧٨٩) زایینی. دواتر لە تورکیا لە ساڵی (١٩٢٤) خیلافەتی ئیسلامی هەڵوەشایەوە، دەوڵەتی عەلمانی دامەزرا. کەواتە بابەتی (فصل الدين عن الدولة) هیچ پەیوەندییەکی نە لەدوورەوە نە لەنزیکەوە بە ئیسلامەوە نییە، ڕەگوڕیشەی بۆ شوێن و ئایین و ئایدیایەکی تایبەت دەگەڕێتەوە. بروانە: ( بيَان الاسلام للرد علي شبهات حول الاسلام).

جیهانی ئیسلامی لەدوو لاوە سوودبەخش بوو بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕشی ڕۆژئـاوا ، لە لایەکەوە هەستیان بەلاوازی لایەنی زانستی خۆیان کرد چەند دوا کەووتون و لـە دواوەی جیهـانی ئیسـلامین لـەبوارە جیاجیاکـانی زانسـت، لەلایـەکی تـرەوە بـۆ رزگاربونیان لە حوکمی کەنیسەو پیاوانی ئایینی و دواکەوتەیی لـەجیهانی زانسـت کـە ولاَتـی ئـەوان شـوێنێکی بـەپیت و گونجـاوە بـۆ بەرهـەمهێنانی زانسـت و هەستانەوە[١]. (غوستاف لوبۆن) [٢] دەڵێت: (فقد كـان الإسـلام هـو المحرك للعقـل الأوربيَ بعد أن أيقظته من سبات دام طوال عصور الظلام والعصور الوسطى)[٣].

واتە: (بزوێنەری سەرەکی عەقڵی ڕۆژئاوا ئیسلام بوو، دوای ئەوەی بەخەبەری هێنا لە خەوێکی دوورودرێژ لە سەردەمی تاریکی و سەردەمانی چەرخی ناوەڕاست). بەشێك لەبیرمەندانی ڕۆژئاوا زۆر هەوڵیاندا ئەم ڕاستییە بشارنەوە بەلاَم کاتێك ئیسلام گەیشتە ئەندەنوسیا نەیانتوانی دەوری موسڵمانان بەتایبەتی سەرکردە سیاسی و فکری و ئایینیەکان نادیدە بگرن، ئەندەلوس بوو بەمنارەی ڕۆژئاواییەکان بەشێکیان سەرسام بوون بەرۆشنبیری و شارستانیەتی ئیسلام و بەشێکی زۆر لە قوتابییانی فەرەنسی و ئەڵمانی و ئینگلیزی لە سەردەستی زانایانی ئیسلامی فێری زانست بوون[٤]. (بریفوت) لە کتابی (تكوين الانسانية في

(١) لەچـەرخی (٣هجـری — ٨ی مـیلادی) نووسـراوێکی زۆری ڕۆژئـاوا وەرگێڕدرایـە سـەر زمـانی عـەرەبی و موسڵمانان سوودیان لی وەرگرت، دوای ئەو چەند سەدەیە زانسـتەکانی ئـەوانیش لەلایـەن موسـڵمانانەوە پـولین کران لەگەڵ داهێنانی نوێ زانستی لەلایەن موسڵمانانەوە جاریکی تر وەرگێڕدراوەتەوە بۆ ڕۆژئاواو بەرهەمی بـۆ ئەوان شۆڕشی زانست و زانیاری بوو.

(٢) غوستاق لوبۆن: طبيَب ومؤرخ فرنسي، ولـد عـام ١٨٤١ م عـنـى بالحضـارات الشـرقية مـن آثـار: حضـارة العرب، الحضارة. بروانە: قالوا عن الاسلام (ل ٨٦).

(٣) بروانە : رسائل في الأديان والفرق (ل ١٠٢) ، وحضارة العرب (ل ٥٢٧).

(٤) ڕیوایەتێك هەیە گوایە سەروك دیرکلونی کاتێك بینی ئەم هەموو قوتابیە لەولاَتانی ئەوروپی لـەزانکۆکانی موسڵمانان لەسەر دەستی زانایانی موسڵمانان فێردەبن ، زۆر ئەسەفی خوارد.

القرن التاسع) دا دەڵێت: (تعلم كثير من المسيحيين على علماء الاسلام)[١]. واتە: بەشێکی زۆر لە مەسیحیەکان لەسەر دەستی زانایانی ئیسلام فێری زانست بوون.

هەروەها (برنارد لويس) لەسەر زوبانی (الفارو) دەڵێت: (كثير من اهل ملتي يقرؤون شعر العرب وقصصهم ويدرسون كتابات علماء الكلام والفلاسفة المسلمين)[٢]. واتە: خەڵکێکی زۆر لەگەلەکەی من شیعری عەرەبی و بەسەرهاتی ئەوان دەخوێننەوە، کتێبەکانی ئەهلی کەلام و فەلاسیفەی موسڵمانان دەخوێنن.

لێرە هەڵوەستەیەك بکەین وەك زانستخوازو گەنجێك ئێمە ئەمڕۆ پاشکەوتوو بەدەست گرفت و کێشەی پەروەردەو فێرکردن و زانست و زانیاری دەناڵێنین! کاریگەریمان بۆ خۆشمان نییە نەك لەسەر گەلانی تر هەمووی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە وازمان لە زانست هێناوە بوینە ئومەتێکی نەخوێندەوارو ئەهلی چاولێکەری.

## زانست و ئایین

زۆربەی مێژووناسان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە لەپێش شۆڕشی فەرەنسی کەنیسەو پیاوانی ئایینی بەهۆی مومارەسەی خراپی خۆیان بەناوی دینەوە هەروەها ئیستغلال کردنی ئایین بۆ بەرژەوەندی خۆیان ناشرینترین دیمەنیان نیشانی کۆمەڵگای ڕۆژئاوادا، عەقڵی لەکارخست، دەرگاکانی زانستی بەڕووی زانستخوازان داخست، بەناوی (تفويض) واتە خودا دینی بەوان سپاردوە (الثيوقراطية) زوڵم و ستەمیان زۆر لە خەڵکی کرد بەهەشت و جەهەنەمین بەخەڵك دەکڕی و دەفرۆشتەوە[٣]، ئەوەی هەوڵی زانستی بدابایە ڕێی لێ دەگیراو یان لەسێدارە دەدرا،

---

(١) بڕوانە: انتقال العلوم العربيّة والحضارة الاسلامية الى الغرب.

(٢) بڕوانە: بيَت الحكمة كيف اسس العرب لحضارة الغرب. قسم جوناپان ليونز.

(٣) چەکی لێخۆش بوون (صكوك الغفران): ئەمە پسولەیەك بوو کڵێسا و پاپا بە خەڵکیان دەفرۆشت لە بری بەهەشت، واتە هەرکەسێك ئەم پسولەی پێ بێ ناچێتە جەهەنەم بەڵکو دەچێتە بەهەشت، چەند پسولەکەی بەگرانتر لە کڵێسا بکڕێت ئەوەندە لە بەهەشت جێی خۆشتر دەبوو.

کەنیسە دەورێکی زۆر خراپی هەبوو لە تێکدانی پەیوەندی نێوان زانست و ئایین، خەڵك وا وێنای ئاینیان دەکرد وەك ئەوەی لەپیاوانی ئایینی و کەنیسەیان دەبینی بەتایبەتی ئەم هەڵوێستانەی کەنیسە دەری بڕی وەك:

١- کەنیسەی ڕوومانی کاسولێکی دەرئەنجامی هەموو زانستێکی ڕەت دەکردەوە دژی ئینجیل بووایە .

٢- کەنیسەی ئینگلیزی رەتی کردووە کەخودا ئایەتێکی تەواوی ناردبێ بەڵکوو تەنها بنەماکانی ناردووە .

٣- کومەڵێکیان بڕوایان وابوو ئەگەر دوو ڕاستی لە ئایین و زانست هەبوون مادام هەردووکیان باسیان کردووە هەر ڕاستە با لە رووکەشیشدا دژی یەك بن هەر ڕاستە وەك بابەتی زەوی ئایا چەقی زەویە یان نا؟

٤- کۆمەڵێکی تریان باوەڕیان وابوو دەیانگوت ئەگەر زانست شتێکی گوت بەلاّم ئینجیل پێچەوانەکەی گوت ئێوە بڵێن ئێمە لەگەڵ زانستین ئەو وای گووتوە[١]،

ئەمەش بووە هۆکار کۆمەڵگای ئەوروپی بیر لە عەلمانیەت بکاتەوەو بەلای عەلمانیەتدا هەنگاو بنێت بەناوی (فصل الدين عن الدولة)[٢]، لێرەدا پرسیارێك

(١) بڕوانە: (الجفوة المفتعلة بين العلم والدين) محمد علي يوسف ، (ل١٧ -١٩).

(٢) جیاکردنەوەی ئایینی ئیسلام لە ژیان بیرۆکەی (فصل الدين عن الحياة) سەدەیەکە جیهانی ئیسلامی داگیرکردووە، دوای کودەتاکەی (مستەفا کەمال ئەتاتورك) بەسەر خیلافەتی ئیسلامی. دوای ئەوە سەرمایەداری جیهانی ئیسلامی داگیرکرد، ئەم بیرۆکەیە دزەی کرد بۆناو ولاتی موسڵمانان و چووە نێو بیروهۆشی موسڵمانان. زۆربەی تاکەکانی ئێستا کاریگەری ئەم بیرۆکەیان لەسەرە. ئێستا جیهانی ئیسلامی بووتە: (اسلامية الامة، وعلمانية الدولة)، واتە: (میللەت موسڵمانە و دەوڵەت عەلمانییە). ئەم بیرۆکەیە بۆ ئەوە سەری هەڵداوە کە ئیسلامیش وەك ئایینە گۆڕدراوەکانی تر دروشم و (تقديسی) ئایینیە و بەس. ئامانجیشیان ئەوەیە ئیسلام بۆ سیستەمی ژیان نەگونجاوە و ناشێت. ئەم بیرۆکەیە هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلامەوە نییە، چونکە ئەم بیرۆکەیە لە ئەوروپا لە مێژوویێکی تایبەت سەری هەڵداوە، دوای ململانی و جەنگێکی تاڵ، کۆمەڵگەی ڕۆژئاوای گەیاندە ئەوپەڕی لێکترازان و هەڵوەشانەوە. ئەم ڕووداوەش بە سێ قۆناغی مێژوویی یەك لەدوای یەك تێپەڕی:یەکەم:. سەردەمی ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی پێشوو کە کاکڵی ئایینی ←

دروست دەبێ ئایا عەلمانیەت هەر جیاکردنەوەی ئایینە لە زانست، یان لە هەموو بەشەکانی ژیان، یان جیاکردنەوەی ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەرە (ﷺ) لە زانستی سروشتی و مرۆیی و زانستەکانی تر، بەوردی عەلمانیەت شی بکەیتەوە بۆت دەردەکەوێت، کە عەلمانیەت جیاکردنەوەی خودایە لە زانست ، بە پێوەری زانستی عەلمانیەت ئەم بوونەوەرە و مەجەڕڕەکان، مانگ و ئەستێرە ، زەوی و تەواوی دروستکراوەکان لەبۆشایەکی ئەم گەردوونە فراوانە لە بازنەیەکی فراوانی تاریك مەلەدەکەن بێ ئەوەی بزانین بۆچی دروست کراوە؟ مەبەست لێی چییە؟ بەرەو کوێ دەڕوات؟ کۆتاییەکەی لەکوێیە؟ نەبوونی ڕووئیایەکی دیارو ڕوون بۆ ئەم پرسیارە فەلسەفیانە لەلای عەلمانیەکان تێروانین و دەرئەنجامی ترسناکی هەیە! هەر بەتەنها داننەنان بەوەی خودای گەورە دروستکەر و بەدی هێنەری ئەم

---

مەسیحی بوو، دووەم: سەردەمی ناوەڕاستی مەسیحیەت، کە جیادەکرێتەوە بە پەیوەندی دووقۆڵی لەنێوان دەوڵەت و ئایین (کڵێسا). سێەم: سەردەمی ڕابوون و هەستانەوەی هزری و زانستی و ئابووری لە ئەوروپا، بەشێوازێك بیرۆکەی (فصل الدين عن الدولة) سەریهەڵدا و گەشەی کرد، تا عەلمانیەتی لێ بەرهەم هات. سەردەمی یەکەم کە سەردەمی ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانیە, بەهیچ بنەمایەکی ئایینی نەبەستراوەتەوە، ئەم چەرخە زیاتر چەرخی فەیلەسووف و بیرمەندان بوو، وەك سوقرات، ئەفلاتون، ئەرستۆ، ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی پشتی بەستبوو بە دەوڵەتی یاسا و توانا و هێزی سەربازی. لەم سەردەمەدا ئایینی مەسیحی لەشێوەی گروپ گروپی بچووك سەریانهەڵدا، بەرەبەرە فراوان بوو، تا ئایینی مەسیحی جێ پێی خۆی بەهێزکرد لەناو ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی، لەوێوە دروشمی (اعط ما لقيصر لقيصر, وما لله لله)یان بەرزکردەوە.- سەردەم و چەرخی ناوەڕاستی مەسیحی دووقۆڵی دەستی پێکرد: لە چەرخی پێنجەمی زایینی، ڕۆڵی کڵێسا ڕۆژبەڕۆژ بەهێز بوو, تا وای لێهات هەژموونی کەمتر نەبوو لە هەژموونی قەیسەر. لەم سەردەمە پەیوەندییەکە دوو لایەنە بووە لە نێوان دەوڵەت و کڵێسا. دەسەڵاتی قەیسەر و دەسەڵاتی کڵێسا بە دووقۆڵی لەوکاتەدا جیهانیان بەڕێوە دەبرد. لەساڵی (١١٢٢) زایینی. ڕێکەوتنێك لەنێوان پاپا و قەیسەر لەژێر ناوی (concordar) مۆر کرا بۆ ڕێکخستنی کارەکانیان لەنێوانیاندا، لەم سەردەمە بیرمەند و ڕۆشنبیران کەوتنەژێر فشارێکی زۆری دەسەڵات، بزوتنەوەی زانستی زۆرلاواز و لەسەرخۆ بوو ، دەسەڵاتی کڵێسا و قەیسەر زۆربەی موڵك و سامانیان داگیرکرد لە ژێر ڕژێمی دەربەگایەتی، لەگەڵ ئەم ستەمە و زۆرداریە وردە وردە ئۆپۆزسیۆن پەیدا بوو لەناو کڵێسا، لەوانە (مارتن لوتر) بزتنەوەی چاکسازی دروستکرد لە ئەڵمانیا لەساڵی (١٥١٧) زایینی، (مارتن) ڕووبەڕووی ستەمی کڵێسا ڕاوەستا و پێی وابوو ئەم زۆرداریە پێچەوانەی دروشمەکانی ئایینی مەسیحیە، هەروەها دژی (چەکی لێخۆش بوونیش) ڕاوەستا. لەم نێوەندەدا ئەوروپا شەڕێکی ئایینی نێوان کاسۆلێك و پرۆتستانیتیەکانی بەخۆیەوە بینی، (١٠٠) ساڵی خایاند لەوێ (فصل الدين عن الدولة) لەدایك بوو. [2].

گەردوونەیە مرۆڤ لە چوارچێوەیەکی تاریك و نادیار دەهێڵێتەوە و ناگاتە ئەنجام، ئایا ئەم جیهانە کێ دروستی کردووە لەلای عەلمانییەکان نابێ بڵێ خودا چونکە ئەم وەڵامە بەپێوەری عەلمانیەت زانستی نییە بۆیە وەڵامەکەش قەبووڵ نییە، چارەنوسی جیهان و بوونەوەر بۆ کوێ دەڕوات و چی لێ دێ مەبەست لە دروست بوونی چیە؟ لەلای ئەوان لێکۆڵینەوە لە مەبەست هەنگاوێکی زانستی نییە و چارەنووسی زانست تەنها لە چوارچێوەی زانستی دەسوڕێتەوە، نابێ بەڕۆژی دوایی ببەستیەوە، چونکە ئەمەش نادیارەو هەستەکان هەستی پێ ناکەن و وەڵامێکی زانستی نییە کەواتە ئەمەش قەبووڵ نیە؟ ڕووداوە گەردوونییەکان چۆن دروست دەبن؟ چۆن کارلێك دەکەن؟ کێ هەڵیان دەسوڕێنێ بێگوومان خودا ئەمەشیان لەلای عەلمانییەکان بەوەڵامی زانستی نازانن و قەبووڵ نیە! ئەمانەو سەدان پرسیاری فەلسەفی و فکری بەبێ وەڵام دەمێنێتەوە دان نانێن بە وەڵامی ئایینی هەر ئەوەیان مەبەستە خودای گەورە لەزانست جیابکەنەوە[1].

## ئامانج و مەبەستی زانستخوازی

زانستخوازان و گەنجان پێویستە بزانن بۆچی فێری زانستخوازی دەبن و مەبەست و ئامانجیان چیە؟ ڕێڕەوی زانستخوازی و هەڵگرتنی کارێکی ئاسان نییە، ڕێگایەکی دوورو سەختە، پڕ لە ئەزیەت و ئازارو ناخۆشییە! جگە لەوەی بارێکی گرانە بۆ ڕۆژی دوایی و لێپێچینەوەی لەسەرە، دیارە شارەزا بوون و تێگەیشتن لە ماناو مەبەستی فێرخوازی قورسایی لەسەر شانی زانستخوازان سووك دەکات، خۆشی و بەختەوەری لەدەروونەکان جێگیر دەکات، بە پێویستم زانی لەم چەند خاڵە بە کورتی ئاماژە بەئامانج و مەبەستی فێربوونی زانست بکەم:

---

(١) بڕوانە: النظريات العلمية الحديثة، د. حسن بن محمد حسن الاسمري، (ل ١١٧٤).

١- ناساندنی ئیسلام وەك خۆی کە پێك هاتووە لە عەقیدە و سیستەم، شەریعەت و مەنهەج.

٢- دروستکردنی کەسایەتی بەرپرسیار، گونجاو بێ بۆ کاری دەستەجەمعی.

٣- پاراستنی شوناسی کەسایەتی زانستخوازو گەنجان بەتایبەتی لە دونیای ئەمڕۆ ڕۆژانە چەندان گەنج و زانستخواز بەلاڕێ دەبردرێن.

٤- پێگەیاندنی کەسانی پیشەنگ بۆ پیشەوایەتیکردنی کۆمەڵگا.

٥- پاراستنی بانگخوازی و دروشمەکانی ئیسلام و موسڵمانان.

٦- گەیاندنی ئیسلام بە چینوتوێژەکانی تر لە ڕێگەی بانگخوازی و پەروەردەو فێرکرنەوە.

٧- ناسینی کاری بانگخوازی وەك پەیام (الرسالة) نەك پیشە (الوظیفة).

٨- ڕووبەڕوو بوونەوەی شوبهات و گومانە دروستکراوەکان، لە ڕێگەی وەڵامدانەوەی زانستی و بەڵگەدار[(١)].

## قۆناغەکانی خۆ پێگەیاندنی زانستخوازان.

خۆ پێگەیاندن پرۆسەیەکی قورسە پێویستی بە قۆناغبەندی هەیە، زانستخواز بۆ ئەم پرۆسەیە پێویستی بە سێ قۆناغی سەرەکی هەیە لەوانە:

١- قۆناغی دامەزراوی زانستی.

٢- قۆناغی بیناکردنی زانستی.

٣- قۆناغی بڵاوکردنەوەی زانستی.

ئەم سێ قۆناغە تەواوکەری یەکترن ریزبەندی و تەواوکاری هەریەکێکیان یارمەتیدەری ئەویتریان دەبێ، پێچەوانەکەی خەلەلی مەنهەجی لێ دروست دەبێ

(١) سوودم لە کتێبێ (اصول العلم ومنهجیته الاقراء والدرس) شیخ هشام البدرانی وەرگرتوە.

بۆ زانستخوازان، دەكرێ ناوی تریشی لێ بندرێ بە مەرجێك ناوەڕۆكەكەی یەك بێت.

عبدالله بن مبارك دەفەرمووێت: ( أَوَّلُ الْعِلْمِ النِّيَّةُ ، ثُمَّ الاسْتِمَاعُ ، ثُمَّ الْفَهْمُ ، ثُمَّ الْحِفْظُ ، ثُمَّ الْعَمَلُ ، ثُمَّ النَّشْرُ " .)[١]. واتە: (یەكەم زانست نیەتە، دوایی گوێگرتنە، دوایی تێگەیشتنە، دوایی لەبەر كردنە، دوایی كار پێ كردنە، دوایی بڵاوكردنەوەیە).

## یەکەم: قۆناغی دامەزراوی زانستی.

مەبەست لە قۆناغی تەئسیسی ئەم قۆناغەیە زانستخواز بۆ هەر زانستێك مەتنێكی سەرەتایی بخوێنێ و زاراوەو چەمكەكانی شارەزا بێت، بابەتەكانی ئەم زانستەش ئاشنا بێت، تا بچێتە قۆناغی دوای ئەوە، كەواتە ئەمەیان قۆناغی سەرەتاییە بۆ زانستخوازان.

## گرنگی ئەم قۆناغە:

قۆناغی تەئسیسی قۆناغێكی زۆر گرنگ و هەستیارە، قۆناغی دامەزراندن و جێگیر كردنە، ئەگەر زانستخواز لەم قۆناغە دابمەزرێ لە ڕووی زانستییەوە تەئسیسێكی بەهێز بۆ خۆی دادەمەزرێنێ لە قۆناغەكانی تر سەركەوتوو دەبێت و بە ئاسانی دەیانبڕێ، ئەگەر لەمە خەلەل بێنێ لەوانی تریش یان شكست دێنێ، یان بە كەموكوڕی قۆناغەكان دەبڕێ.

---

(١) بروانە: جامع بيان العلم وفضله لابن عبد البر » بَابُ مَنَازِلِ الْعُلَمَاءِ ، ژ (٥٤٠) .

## ئەم قۆناغە چۆن تەئسیس دەكرێ؟

تەئسیسی زانستی سەرەتا دەست پێ دەكات بە خوێندنی چەند زانستێكی كورت (مختصر)، لە هەر زانستێك پوختەیەك بخوێنێ لەژێر چاودێری زانایان ئەمەش چوار كۆڵەكەی ئەساسی دەوێت.

**كۆڵەگەی یەكەم:** كتابێكی كورت بخوێنێ تاوەك و تەواوی بابەتەكانی نێو كتێبەكە هەزم بكات، بە ماوەیەكی كەم و گونجاو بێت لەگەڵ قۆناغە سەرەتاكەی، تا تەواوی بابەت و بەشەكان و كورتكراوەكەی فێر بێت.

**كۆڵەكەی دووەم:** زانستخواز زانستەكە بە (بە تەواوی) بخوێنێ نەك بە سەریدا تێپەڕێ و زەبتی نەكات.

**كۆڵەكەی سێیەم:** كتێب و مادەی ئاسان و سادە بخوێنێ، دوركەوێتەوە لە كتێب و مادە قوڕسەكان.

**كۆڵەكەی چوارەم:** بۆ ئەم قۆناغە زانستخواز پێویستی بە ڕێنیشان دەرو سەرپەرشتیارێكی زانا هەیە تا مەنهەجی خوێندن و مادەكانی بۆ دیاری بكات تا زوو بگاتە مەبەست و مەنزڵ.

## دووەم: قۆناغی بینای زانستی.

مەبەست لە بینای زانستی ئەوەیە زانستخواز لەم قۆناغە دەست دەكات بە خوێندنی شەرح و تەفاصلی بابەت و مەسئەلەكان، بە شێوازێكی گشت گیرو هەمەلایەن و هاوسەنگ.

## گرنگی ئەم قۆناغە

ئەم قۆناغە زۆر گرنگە بۆ زانستخواز بینای زانستی خۆی دابمەزرێنێ، بابەتە زانستییەكان زەبت بكات، قۆناغی خۆ پێگەیاندنە لە تەواوی زانستەكان.

## سیماو نیشانەكانی ئەم قۆناغە:

زانستخواز لەم قۆناغەدا چەند نیشانەیەکی ئاسانی بۆ دەستەبەر دەبێت:

١- مەنهەجی خوێندنی بۆ دیار دەبێت.

٢- ڕێڕەوی زانستی و بابەتەکانی بۆ ڕۆشن دەبێت.

٣- بابەتە زانستیەکان باش حاڵی دەبیّ و هەوڵی فراوان بوون و لێکۆڵینەوە دەدات.

٤- مەهارات و داهێنان لە پەیداکردنی زانست دەکات و دەبێتە خاوەن بیرۆکەی زانستی نوێی و تازە.

٥- کاتەکانی خۆی تەواو ڕێك دەخات و سوودی زیاتر وەردەگرێت.

٦- بابەتە زانستییەکان پۆلێن دەکات و لێکیان جیا دەکاتەوە بە ئاسانی.

## ئەم قۆناغە چۆن بینا دەکرێت؟

زانستخواز چۆن ئەم قۆناغە بینا دەکات ئەمەشیان چەند هەنگاوێکی پێویستە لەوانە:

١- دەست دەکات بە خوێندنی کتێب و مادەی مام ناوەند، بە ڕیزبەندیەکی هاوسەنگ، بە شێوازێکی فراوانتر لە قۆناغی پێشوو.

٢- دەستگرتن بە مادەو کتێبە ((اصولیەکان))، لەگەڵیان بەردەوام دەبێت بە پێداچوونەوە و هەڵێنجاندن و خوێندن و خوێندنەوە.

٣- لەهەر بابەتێکی زانستی چەندان کتێب نووسراوە، لەم قۆناغەدا زانستخواز دەست دەکات بە خوێندنەوەی چەندان کتێب لە هەمان بابەت، تا زۆرترین زانیاری و زانست پەیدا بکات.

٤- خوێندنەوەی ژیانی زانایانی پسپۆڕ لەم زانستە، زەمەن و کات و پلەو پایەیان شارەزایی و پسپۆڕیان چیە؟

٥- زۆر دووبارە خوێندنەوەو بەسەرداهاتنەوەی زانستەکان تا دەبێتە مەلەکە لەلای زانستخوازان و زانستەکە لە بیر ناکرێت.

## هەڵەکانی ئەم قۆناغە لەلای زانستـخوازان.

گوتمان ئەم قۆناغە زۆر هەستیارە زانستخواز ئاگادار نـەبێت دەکەوێتـە هەڵـەی زۆرەوە لەوانە:

١- نەبوونی هاوسەنگی لەنێوان بابەتە زانستیەکاندا، واتە زانستخواز لە چەند بابەتێك زۆر شارەزاو زانایە، لەوانی تر زۆر بیٚ ئاگایە ئەمەشیان هەڵەیە.

٢- خوێنـدنی هەرِەمـەکی، زانسـتخواز جـاری وا هەیـە دەکەوێتـە خوێنـدنی هەرِەمەکی و ناچێتە سەر مـادە زانسـتییە ئەصـلییەکان، فێـری زانسـت نابێـت، تەمەنێکی زۆر دەرِوات تەنها رِۆشنبیری زیاد دەکات نەك زانست.

٣- زۆر خۆ بەگـەورە زانـا نیشـان دەدات پـێش خـۆ ئامـادەکردن و شـایاندن، هەندیٚ زانستخواز هەیە پێش ئەوەی بینـای زانسـتی خـۆی تـەواو بکـات وا خـۆی نیشــان دەدات پێگەیشــتوە و پێویســتی بــە خوێنــدن نییــە، یــان زوو توشــی بلاّوکردنەوەی زانست دەبێت و پشت لە وەرگرتن دەکات.

٤- زۆر لە خۆبارکردن و بارگرانی زیاد، زانسـتخواز ئـەم هەڵەیـە دەکـات لـە قۆتاغی بینای زانستی بارێکی زۆر لە خۆی باردەکات و دواتر توشی مەلەل دەبێت و بۆی هەڵناگیریٚ، یان وازی لیٚ دەهێنیٚ، یان ناتوانیٚ بینای زانسـتی خـۆی تـەواو بکات.

## سێیەم: قۆناغی بلاّو کردنەوەی زانست

زانستخواز دوای ئەوەی هەردوو قۆناغی بەسەرکەوتووی برِی و تەئسیسی بینای زانستی تەواو کرد دەست دەکات  بە بلاّو کردنەوەی زانستەکە لەم چەند وێستگەیە لەوانە:

١- وتار و موحازەرات.

٢- وتنەوەی وانە و ئامۆژگاری.

٣- وەڵام دانەوەی پرسیار.

٤- شەرع کردنی مادەو مەنهەجە زانستییەکان بۆ قوتابییان.

٥- نوسینی کتێب و وتار.

٦- نوسینی باس و لێکۆڵینەوەی زانستی.

٧- هەستان بە هەندێك کاری بانگ خوازی و فێرکردن لە ڕێگای بیستراو بینراو خوێندراو.

٨- کردنەوەی خولی زانستی و فکری و پەروەردەیی.

٩- دروستکردنی پێگەی ئەلکترۆنی و زانستی و بانگخوازی.

١٠-دارِشتنی پرِۆژەی زانستی و دێدەوانی جیاواز بۆ فێربوون[١].

لەگەڵ چەندان جۆر چالاکی زانستی و بانگخوازی.

## بەهرەی زانستخوازان

دیارە هەر زانستخوازێك خوای گەورە لە بوارێك بەهرەیەکی زۆری داوەتێ، وا باشە لەم بوارە زۆرترین زانست ببەخشێتەوە، بە نموونە زانستخوازی وا هەیە لە وتاربێژی زۆر سەرکەوتووەو کاریگەری زۆرە، هی وا هەیە لە نووسین و دارِشتن، یان لە پرِۆژەو کاری دەورات، یان گوتنەوەی دەرس و ئاموژگاری، یان لە نووسین و فێرکرن و پەروەردە، لە کام بوار بەهێز بێ، با لەم بوارە گرنگی بەخۆی بدات بەرهەمی زیاتر دەبێت.

- ئیمامی علی کوڕی ئەبو تاڵیب دەفەرمووێت (قيمةُ كلِّ امرئٍ ما

---

(١) بروانە: بيان مراحل التكوين العلمي لطالب العلم، عبدالعزيز الداخل – مقاله.

يُحسِنُ)(١). واته: بەهای هەموو مرۆڤێك لەوەدایه كه تێیدا سەركەوتوو چاكه.

## چەن خەسڵەتێکی جوان بۆ زانستـخوازان

زانستخواز پێویستی به چەند خەسڵەتێكی جوان هەیه تاوەكو ئەم پڕۆسـەیه بـه سەركەوتوویی ئەنجام بدات و خودای گەوره یارمەتیـدەری بێت، لەوانه:

**١- دڵ سۆزی .**

پەیداكردنی زانست خودا پەرستییه، خوداپەرستیش بـەبێ دڵسـۆزی نـابێ، بـه تایبەتی زانستی شەرعی و میراتگرایەتی پێغەمبەر (ﷺ)، بۆ ئەوەی ئـەم خـودا پەرستیه له لای خودا قەبووڵ بێـت دەبـێ زانسـتخواز دڵسـۆز بێـت بـۆ خـودا، لـه ئیمامی ئەحمەدیان پرسی دڵسۆزی له زانست چـۆنه؟ فـەرمووی زانسـتخواز نیـەت بهێنێ به دڵسۆزی جەهالەت و نەزانی له خۆی دوورخاتـەوه، چـونكه زانـاو نـەزان وەك یـــەك نـــین، خـــودا دەفـــەرموێت: ﴿ قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَۗ ﴾(٢). واته: (بڵێ: ئایـا ئـەو كەسـانەی كـه زانـان و شـارەزان لەگـەڵ ئـەو كەسانەدا كه نەزان و نەشارەزان یەكسانن؟! "دیاره هەرگیز یەكسان نین).

پێغەمبـەر (ﷺ) هەڕەشـەیەكی زۆر ترسـناك دەكـات لـەبارەی ئەوانـەی لەپەیداكردنی زانست نیەتی خراپیان هەیه و دەفەرموێت: (مَنْ طَلَبَ الْعِلْمَ لِيُجَارِيَ بِهِ الْعُلَمَاءَ أَوْ لِيُمَارِيَ بِـهِ السُّفَهَاءَ أَوْ يَصْرِفَ بِـهِ وُجُـوهَ النَّـاسِ إِلَيْـهِ أَدْخَلَـهُ اللَّـهُ النَّارَ)(٣).

واتـه: ( هـەر كەسـێك بـەدوای زانسـت دا بگـەڕی بـۆ ئـەوەی شـانازی بەسـەر

(١) ئەم وتەیه زور بلاْوه لەنیو زانایان و دەدریته پاڵ ئیمامی علـی بـەلاّم زور بـەدوای دا گـەڕام سەرچـاوەیەكم نەدوزیەوه تەنها لەلای شیعەكان نەبێ.
(٢) سوڕەتی الزمر ئایەتی ٩.
(٣) ترمذي له سونەنەكەیدا گێڕاویەتیەوه (٣٢/٥) ژ(٢٦٥٤) ، وه حاكم له مستدرك (١٦١/١).

زانایانەوە بکات، یان بۆ ئەوەی دەمەقرِێ لەگەل گێل و کالفامـان بکـات، یـان بـۆ ئـەوەی سـەرنجی خـەڵك بـۆ خـۆی رابکێشـێ واتـە مـەدحی بکـەن، خـودا دەیخاتـە جەهەنەمەوە).

## ٢- نەرم ونیانی.

ڕێگای زانستخوازی هەوراز و نشێوی زۆر تێدایە، پێویست دەکـات زانسـتخواز زۆر لەسـەر خـۆو ئـارام بێـت تـا زانسـتەکە وەردەگرێـت، پێغەمبـەر (ﷺ) دەفەرموێت: ( إِنّ الرِّفقَ لا يَكُونُ في شيءٍ إِلَّا زَانَهُ، وَلا يُنْزَعُ مِنْ شَيءٍ إِلَّا شَانَهُ)[١]. واتە: (نەرم ونیانی لەهەر شتێك بێت جوانی دەکات. وەلەهەر شتێك دوور بخرێتەوە ناڕێکی دەکات).

## ٣- بەردەوام بوون.

زانست شەو و ڕۆژو باشترین کاتی پێویستە، بۆیـە زانسـتخواز دەبـێ بـەردەوام بێت دانەبڕێ هیچ کاتێك لە زانست، ئینجـا دەتـوانێ بەشـێك لـە بـەحری زانسـت وەرگرێ، ئەبوو یووسف دەفەرمووێت: (الْعِلْمُ شَيْءٌ لا يُعْطِيـكَ بَعْضَـهُ حَتَّـى تُعْطِيَـهُ كُلَّكَ)[٢]. واتە: (زانست شتێکە بەشێکت ناداتێ تاوەکو هەمو ژیانی نەدەیتێ).

## ٤- هیمەت بەرزی.

ئەم کاروانە دورو درێژە هیمەت بەرزی دەوێ، زانایان لەبەر هیمەت بەرزییان لە (٧) ساڵی و (١٠ ) ساڵی دەستیان بە لەبەرکردنی قورئـان و زانسـتەکان کـردووە، ئیمامی شافعی دەفەرموێت: (حفظت القرآن وأنا ابن سبع سنين، وحفظت الموطأ وأنا ابن عشر سنين)[٣].

---

(١) موسلیم گیراویەتیەوە (٤/٢٠٠٤) ژ(٢٥٩٤) .
(٢) بروانە: الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع للخطيب البغدادي، (١٥٤٩) .
(٣) بڕوانە: طبقات الفقهاء الشافعيين، ابن كثير، (١- ٣٧).

واتە: (قورئانم لەبەر کرد تەمەنم حەوت ساڵ بوو موطئی ئیمامی مالیکم لەبەر کرد تەمەنم دە ساڵان بوو). ئەمە هیممەت بەرزیە.

### ٥- یەکلابونەوە و لێبڕان بۆ زانست.

زانست دڵی دەوێت پێشی عەقڵ و لاشەی، دڵێکیش بە شتی ترەوە سەرقاڵ بێ ناتوانێ زانست وەرگرێ بۆیە پێویستە زانستخواز خۆی یەکلا بکاتەوە.

### ٦- وەرگرتنی زانست لە ڕێی زاناو مامۆستایەك.

زانستخواز بەتەنها ناتوانێ ڕێگەی زانستی دروست بگرێتە بەر پێویستە زانایەك ڕێگای بۆ دیاری بکات و لەکاتی دروستبوونی گرفت و گومانێك بگەڕێتەوە لای زاناکەی خودای گەورە دەفەرموێت:﴿ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴾[1]. واتە: (لە زاناو شارزایان بپرسن ئەگەر شتێکتان نەزانی).

## گرفت و ڕێگرییەکانی بەردەم زانستخوازان.

ئەنجامدانی کارێکی دونیایی سادەو ساکار چەندان ڕێگری و گرفتی لە بەردەم دروست دەبێت، بوون بە میراتگری پێغەمبەر(ﷺ) و زانای پایەبەرزو هەڵگری پەیامی خودا، بێ گومان گرفت و ڕێگری زۆر زیاتر دێتە ڕێی، هەندێکیان لە ناخی خۆیەتی و هەندێکیان لە دەرەوەن، بە کورتی ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین، تاوەکو زانستخواز بەرچاوی ڕوون بێت و نەکەوێتە نێو ئەم گرفتانەوە.

### ١- ئامانجی پەیداکردنی زانست بۆ دونیاداری

خودای گەورە خۆشییەکانی ژیانی داوەتە تەواوی مرۆڤەکان، ئەوانەی

---

(١) سورەتی النحل ئایەتی ٤٣.

سوودبەخشن بۆی حەڵاڵ کردوون و پێی خۆشە بەندەکانی لە نازو نیعمەت دا بن، لە خۆشگوزەرانی دا بژین، بەلاّم کاتێك زانستخواز ئامانجی سەرەکی لە پەیداکردنی زانست دەگۆڕێ بۆ پەیداکردنی پارەو پول و سەروەت لەسەر حیسابی زانستەکەی توشی خۆشەویستییەکی نا تەندرووست دەبێ بۆ دونیا!، ئەمشیان پێغەمبەر (ﷺ) پەنای لەم جۆرە گرتووە فەرموویەتی (لا تجعلِ الدُّنيا أكبرَ همِّنا)[1]. واتە: خودایە دوونیا نەکەی بە گەورەترین ئاوات و ئامانجمان.

- هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت (مَنْ تَعَلَّمَ عِلْمًا مِمَّا يُبْتَغَى بِهِ وَجْهُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ لَا يَتَعَلَّمُهُ إِلَّا لِيُصِيبَ بِهِ عَرَضًا مِنْ الدُّنْيَا لَمْ يَجِدْ عَرْفَ الْجَنَّةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَعْنِي رِيحَهَا)[2].

واتە: هەر کەسێك زانستێك فێربێ کە مەبەست پێی لە پێناو خودا بێ خۆی فێر نەکات تەنها بۆ ئەوەی بەشێکی لە دونیا دەست بکەوێت ئەمە لە ڕۆژی قیامەت بۆنی بەهەشت ناکات).

- سوفیانی سەوری دەفەرموێت: (ئەگەر زانایان گەندەڵ بوون کێ خەڵك چاك بکات، فەسادیشیان لادانیانە بۆ لای دونیا بە ناشەرعی)[3].

- ئیمانی ئاجەری دەفەرموێت: (ئەگەر زانایانی پێشوو ترسابن لە خۆشەویستی دونیا لە زەمانی خۆیاندا، ئەمڕۆ لە زەمانی ئێمەدا چی)[4].

## دووەم: پێداویستییەکانی ژیان.

جاران زانستخواز زۆرترین کات لەگەڵ وەرگرتنی زانست و کۆڕو مەجلیسی

(١) ترمذی گێراویەتیەوە (٥٢٨/٥) ، ژ (٣٥٠٢). هەروەها حاکم گێڕاویەتیەوە (٧٠٩/١) ژ (١٩٣٤).
(٢) ئیبن ماجە لە سونەنەکەیداگێراویەتیەوە (٩٢/١) ژ (٢٥٢) ، هەروەهاحاکم لە مستدرك (٦٠/١) ژ (٢٨٨).
(٣) بروانە: جامع البيان العلم و فضله، ابن عبدالبر(٧١١/١).
(٤) بروانە: اخلاق العلماء للآجری، (ل٨٩) .

زانایان بوو، لە ئێستادا داخوازی و پێداویستی ژیان زۆر بووە، زانستخواز زۆربەی کاتەکانی سەرقاڵە بە پەیداکردنی پێداویستییەکانی ڕۆژانەی، ئەمەش کاتێکی زۆری دەوێ بە تایبەتی بۆ بابەتە کەمالیاتەکان، واتا شتە زیادەو جوانکاری ژیان زۆر بووەو زانستخوازی سەرقاڵ کردووە، بۆ تێپەڕاندنی ئەم بەربەستانە پێویست دەکات زانستخواز دوورکەوێتەوە لە جوانکاری ژیان و تەنها گرنگی بە پێویستییەکانی بدا، تاوەکو زۆرترین کاتی لە پەیداکردنی زانست سەرف بکات.

## سێیەم: کات بەفیڕۆدان.

سەردەمی عەولەمە کات زۆر بێ بەرەکەت بووەو ژیانی داگرتووین، تەنانەت زانستخوازیش زۆربەی کاتەکانی بە بەدواداچوونی هەواڵ و زانیاری و حاڵەتی سیاسی بەسەر دەبات، لە کاتێکدا زۆربەیان سەرقاڵ کردن و غافڵاندنی کۆمەڵگایە و دوورە لە ڕاستی، بەتایبەتی لەو کاتەی جڵەوی سیاسەت لە دەست عەلمانیەکانە، زۆربەی سیناریۆیە بۆ فریودانی خەڵك، زۆرترین کاتی زانستخواز خۆ سەرقاڵ کردنە بە فەیسبووك و ئەنتەرنێت و خوێندنەوەی کورتە وتارو شتی بێ سوود، کە بۆ زانستخواز نابێتە زانست، تەنها زانیاری گشتین، ئەمە بۆتە گەورەترین بەربەست و کۆسپ لەسەر ڕێگای زانستخوازان.

## چوارەم: چوونە بەردەرگای دەسەڵاتداری زاڵم

بەداخەوە لە سەردەمی ئێستا ڕۆژانە زانستخواز و هەندێك بەناو مەلا خۆیان دەدۆڕێنن و تەسلیمی عەلمانیەکان دەبن، بەندە هەندێك تێبینیم هەیە لەسەر ئەوەی کە دەوترێ نابێ بەهیچ شێوەیەك زاناو زانستخواز بچنە بەر دەرگای دەسەڵات داران، ئێمە دەبێ بە وردی ئەم بابەتە شی بکەینەوەو بیخەینە بەر تیشکی شەرعی خودا نەك قسەی خۆمان، بۆ جیاکردنەوەی ئەم بابەتە پێویستمان بەم خاڵانە هەیە بۆ شی کردنەوەی:

١- زاناو زانستخواز ئەگەر بۆ كاری خۆیان نەبوو بەڵكو بۆ كاروباری گەل بوو قەیناكا بچنە بەر دەرگای دەسەلاتداران، ئەمەش لە بازنەی فەرمان بە چاكەو نەهی لە خراپەكردنە، بە مەرجێك لەسەر حیسابی كەسایەتی زانستخوازەكە نەبێت.

٢- زاناو زانستخواز بۆ كاری بانگخوازی بچن بە مەرجێك لەسەر حیسابی ئیسلام نەبێت و سازش لە پرەنسیپەكانی نەكات.

٣- زاناو زانستخواز ئەگەر بۆ گەیاندنی وشەی حەق بوو دروستە بچن بۆ لای دەسەلات داران، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت (افضل الجهاد كلمة الحق عند سلطان الجائر)[١]. واتا: ( باشترین جیهاد وتنی وشەی حەقە لە لای دەسەلاتداری زاڵم ).

٤- زاناو زانستخواز بە تەنها نابێ بچنە لای دەسەلاتداران، چونكە فریودان و دروست كردنی سیناریو ئاسانترە، بەلام چونیان بەدەستەجەمعی بەهێزتر و پارێزراو ترە، باشتریش دەتوانن ئامۆژگارییان بكەن.

٥- زاناو زانستخواز نابێ هیچ داخوازیەكی كەسییان هەبێ، چونكە هەموو داخوازیەكی كەسی سازشە لە پرەنسیپ و لەسەر حیسابی دینە.

٦- زاناو زانستخواز پێویستە بچنە لای ستەمكاران حاڵ و باڵی میللەت و دین و پاراستنی ژیانی خەڵكیان بۆ ڕوون بكەنەوە، چونكە لە وانەیە نزیكەكانی لەبەر بەرژەوەندیی خۆیان پێیان نەڵێن، ئەگەر زاناو زانستخوازان ئەم خالانەیان ڕەچاو كرد بچنە لای دەسەلاتداران سوودی بۆ دین و بانگخوازی دەبێت.

---

(١) بەیهەقی لە شعب الإیمان گێڕاویەتیەوە (٩٣/٦) ژ (٧٥٨١) هەروا ابن ماجه (١٣٢٩/٢) ، ژ (٤٠١١).

## خاڵە ترسناك و لە خشتە بەرەكانی زانستخوازانی بەر دەرگای دەسەلاتدارانی زاڵم:

### ١- دەرگای دەسەلاتدارانی زاڵم فیتنەیە

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (ومن أتى أبوابَ السلطانِ افتُتِنَ ، وما ازدادَ أَحَدٌ من السلطانِ قُرْبًا إلا ازدادَ من اللهِ بُعْدًا) [1]. واتا: ( هەركەسێك بچێتە دەرگای دەسەلاتداران توشی فیتنە دەبێ، هەر چەندە لە دەسەلاتدار نزیك ببنەوە ئەوەندە لە خودا دور دەكەوێتەوە).

بێگومان بە پێی ڕاڤەی زانایان لەم فەرمودەیەدا مەبەست لە وشەی ((فیتنە)) واتا تاقی كردنەوە، هەروەها نزیك بوونەوە لە دەسەلاتداران لەسەر حیسابی دین و عەقیدەو ئیمان بێ.

عومەری كوری خەتاب دەفەرموێت: (ئەگەر بینیتان زاناو زانستخواز پەنایان بردە بەر دەرگای دەسەلاتداران بزانن ئەمانە دزن، ئەگەر بینیتان پەنایان بردە بەر دەرگای دەوڵەمەندان بزانە ئەوانە دین بەژین دەفرۆشن) [2] .

كەواتا چوونە بەر دەرگای دەسەلاتداران بە پێوەری (مەصالح) و (مفاسد) دەبێ، ئەگەر لە بازنەی فەرمان بە چاكەو نەهی لە خراپە بێ، و توانای گۆڕینی هەڵسوكەوت و بڕیاری دەسەلاتدارانت هەبوو، بۆ خزمەتی ئیسلام و موسوڵمانان بوو، لەسەر حیسابی دین و مەبدەئ و عەقیدە و ئیمان نەبوو، شتێكی باشەو با ئەنجام بدرێت. ئەگەریش لە جیاتی گۆڕینی بڕیاری دەسەلاتدار، بڕیاری خۆت گۆڕی، یان دینت لەسەر دانا، یان بە دوای پارەو پول و ئیمتیازاتی شەخسی بووی، ئەوا كارەساتەو فیتنەو دوركەوتنەوەیە لە خوداو ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ)، دەبێ دوركەوینەوەو دینمان بە قوربانی ژینی خەڵك نەكەین.

---

(١) ئیمامی احمد گێڕاویەتەوە (٣٧١/٢) ژ(٤٤٠) ، هەروا ئەبو داود لە سونەنەكەیدا (١١١/٣) ژ(٢٨٦٠) .
(٢) بڕوانە: الاداب الشرعیة لابن مفلح، (٢\١٥٥) .

ئەم کۆسپ و بەربەستانە بە وتەیەکی جوانی ئیمامی ئەحمەد کۆتایی دێنین، کاتێك لە نووسراوێکدا بۆ سعیدی کوری یعقوب دەنوسێت: (أما بعد: فإنّ الدنيا داءٌ، والسلطان داءٌ، والعالِم طَبيبٌ" فإذا رأيتَ الطبيبَ يَجُرُّ الداء إلى نفسه فاحذَره)[1]. واتە: (بەراستی دونیا دەردە، دەسەلاتداریش دەردە، زاناش پزیشکە، ئەگەر بینیت پزیشك نەخۆشی بۆلای خۆی ڕادەکێشێ ئەوە لێی دوور کەوە).

**زانستخواز:** وەك واقیعێکی بەرچاو پەند لەو بەناو مەلا و زانایانە وەرگرە لەو سەردەمەی خۆتدا، ئەو بەناو مەلایانە تا بۆ خودا و لەگەڵ خودا بوون، لەنێوان خەڵکی مسڵمان و دیندار بوون چ مەکانەت و پلە و پایە و خۆشەویستێکیان هەبوو، هەموو شتێك لە بن دەستیان بوو، تەنانەت دەسەڵاتدارەکان زۆر بە ناچاری دەهاتنە بەردەستیان و دادەنیشتن، کەچی دوای ئەوەی چونە بەردەرگای دەسەڵاتداری زاڵم و عەلمانی بەتەنهاو بۆ بەرژەوەندی شەخصی ئامانجیان تەنها بڕوانامەو پارەو پلەو سودی تایبەتی خۆیان بوو! ئێستا زەلیل و بێحورمەت کەوتوون ، لەنێو دڵی خەڵك و جەماوەر سووك و ڕیسوا بوون، کەس گوێ لە وتارو قسەیان ناگرێت، بچنە هەر شوێن و مەجلیسێك خەڵك دەڕوات و شوێنەکە چۆڵ دەکرێت .

## پێنجەم: پشت بەستن تەنها بە کتێب بە بێ گەڕانەوە لای زانایان

کۆسپێکی تری بەردەم زانستخوازان نەگەڕانەوەیە بۆ لای زانایان بە تایبەت لەم سەردەمەدا، نوسراو و ڕای جیاواز یەکجار زۆر بووە، هەزاران کتێب و نووسراو لە جیهانی ئیسلامی بلاْوبووەتەوە، چەندان کتێب بە مەبەستی تایبەتی نووسراون، بە دیمەن و ڕووی سەرەکی باسی قورئان و سوونەت و مەبدەئە، بەلاْم لە ناوەڕۆك یان لە گۆشەیەك ژەهری ڕیشتووە و گەنجانی بە لاڕێدا بردووە، وەك ئەم فیکرانەی

---

(١) بڕوانە: بيان العلم اصليه، عبدالكريم الحميد (ل٢٦).

بەناوی سەلەف، بەناوی قورئان و سونەتی پێغەمبەر (ص)، بەناوی گوێڕایەڵی دەسەڵات و وەلی ئەمر، پشتگیری لە ستەمکاران و عەلمانی دەکەن، پشتگیری لە قەزافی و حسنی مبارەك و سیسی و دەسەڵاتدارەکانی تری عەلمانی دەکەن لە جیهانی ئیسلامی! بەڵام لەسەر تەسبیحکردنێك سەلام لە براو موسڵمانێکی دیندار و یەکتاپەرست ناکەن، ئەمە هۆکاری نەبوونی وەرگرتنی زانستە لەلای زانایان، بۆیە تەنها پشتبەستن بە کتێب بەبێ گەڕانەوە لای زانایان زانستخواز بەلاڕێی دا دەبات. ئیمامی شافعی دەفەرمووێت: (مَنْ تَفَقَّهَ مِن بُطُون الكتُب ضَيّعَ الأحكام)[1]. واتا: (هەرکەسێك فێری زانست بێ تەنها لەنێو کتابانە (ئەحکام لە دەست دەدات).

## شەشەم: پەلەکردن لەوەرگرتنی زانست.

ڕێگای زانستخوازی ڕێگایەکی دور و درێژە، ڕێگای لەم جۆرەش نابێ پەلەی تێدا بکەی، ئەوانەی لەسەر خۆبوون بەپێی هەنگاوەکان زانستیان وەرگرتووە بونەتە دەریای زانست و زۆر سەرکەوتوو بوون ، ئەوانەی پەلەشیان کردووە لە بەروبوومی زانست بێبەش بوون، وەك ئەم یاسایەی دەڵێت: (من استعجل الشيء قبل أوانه عوقب بحرمانه)[2]. واتا: ( هەر کەسێك پەلە بکات لە لێکردنەوەی شتێك کە پێ نەگەیشتبێ بێ بەش دەبێت لە بەروبوومەکەی) ووتویانە ئیمام شەعبی ئەو هەموو زانستەت لە کوێ بوو؟ فەرمووی: ( بنفي الاعتماد ، والسير في البلاد ، وصبر كصبر الجماد ، وبكور كبكور الغراب ) [3]. واتە: (پشتم بە کەس نەبەست، بە

(١) بروانە: تذكرة السامع والمتكلم، (ل٨٣).

(٢) بروانە: شرح مجلة الأحكام (ل٨٧).

(٣) بروانە: تذكرة الحفَّاظ" ئیمامي ذهبي (١/٨١)،

ولاّتاندا گەڕام، سەبرم گرت وەکو سەبری بێ گیانەکان، بەیانیانیش زوو بە دوای زانست دەگەڕام وەك بەیانیانی قەلەڕەش).

## حەفتەم: نەبوونی پلە بەندی (التدرج).

کوردەواری دەڵێ: (( سۆفیاتی بەرە بەرە، هەر شیرە دەبێتە کەرە )) زانایان هەموویان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی زانستخواز دەبێ بەشێوازی پلەبەندی زانست وەرگرێ، چ لە نێوان زانستە جیاوازەکان، یان لە وەرگرتنی یەك زانست، ئەمەش قورئان فێری کردووین دەفەرموێت:﴿ وَقُرْءَانًا فَرَقْنَٰهُ لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا ﴾ (١).

واتە: (ئەو قورئانەشمان بەشبەش بۆ ناردووی، هەتا بەرە بەرەو بەشێنەیی و لەسەرخۆ بۆ خەڵکی بخوێنیتەوە . بەشبەش و بڕگە بڕگەو بەپێی پێویست وردە وردە دامان بەزاند).

## هەشتەم: تاوان و گوناحکردن.

هەر چەند زانستخواز لە خوا ترس بێ ئەوەندە کاری زانستخوازی بۆ ئاسان دەبێت، خوای گەورە تەواوی دەرگا کراوەکانی بە خوا ترسان و تەقوا بەستاوەتەوە، بە تایبەتیش وەك دەرموێت : ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُ ﴾ (٢). واتە: (لەخوا بترسن خوا فێری زانست و کاروباری ئایینتان دەکات).

یان بە هۆکاری فێربوونی کەسێك زانستخواز توشی لە خۆبایی بوون و خۆ

(١) سورەتی الإسراء ئایەتی ١٠٦ .
(٢) سورەتی البقرة ئایەتی ٢٨٢.

بەگەورە زانین بێت خوای گەورە ڕقی لەوانەیەو هەڕەشەی لیّ کـردوون دەفـەرمویّت:

﴿ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَحًاۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴾[١].

واتە: (بەفیزەوە ڕووت وەرمەگێڕە لەخەڵکیی و رووت گرژ مەکە، بـەڵکو هـەردەم رووخۆشـبە، بەدەعیە و فیز مەڕۆ ڕێوە لەزەویدا، بەڕاستی خوا هـیچ دەعیـە بـازو شانازی کەرێکی بەخۆ خۆشناوێت).

هـــــەروەها :﴿ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْأٓخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًاۚ ﴾[٢]. واتە: (ئەو خانەیەی تر (بەهەشت) دادەنێین بۆ ئەو کەسانەی نایانەوێ دەعیەو خراپەکاریی بکەن لە زەوییدا ، پاشە ڕۆژی چاکیش هـەر بـۆ پارێزگارانـە نـەك بـۆ لەخۆ بایی بووان بەکورسی، یان بەسامان و دارایی).

## نۆیەم: ساردبوونەوە.

ڕێگای زانست قورسایی زۆری تێدایە ، زۆربەی زانستـخوازان لـە نیـوەی ڕێگـا سارد دەبنەوە، ئەمەش دەبێتە کۆسپێکی گـەورە بـۆ زانستـــخوازان، بـۆ زاڵــبوون بەسەر ئەم گرفتە بە کورتی پێویستی بە چەن خاڵێك هەیە لەوانە:

١- خوێندنەوەی ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) و یاوەران.

٢- خوێندنەوەی ژیانی زانایان و پیاوە گەورەکان و هەڵکەوتووەکان.

٣- سەردانی زانایانی نزیك لە خۆت بکە، کە خاوەن هیمەتی بەرزن.

٤- خوێندنەوەی کتێب لەسەر ورە بەرزی .

٥- دوعاکردن و پاڕانەوە.

٦- هاوڕێی خاوەن هیمەت و بوێر.

٧- تەماشاکردنی دواڕۆژی زانایان و خێرو پاداشتیان .

---

(١) سورەتی لقمان ئایەتی ١٨ .

(٢) سورەتی القصص ئایەتی ٨٣ .

**دەیەم: نەبوونی نەخشە ڕێگا بۆ فێربوون.**

ئەمەش کۆسپێکی گەورەیە، زۆر پێویستە زانستخواز کات و شوێن و نەخشە ڕێگای گونجاو دابنێ بۆ ڕێکخستنی مادەکانی نەك بە شێوەیەکی هەڕەمەکی.

**یازدە: خوێندکاری تەمبەڵ و خراپ.**

یەکێك لە کۆسپە هەرە خراپەکانی بەردەم زانستخوازان برادەری تەمبەڵە، ساردی دەکاتەوەو نایەڵێ لە کاروانی زانستخوازی بەردەوام بێت، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ)، دەفەرمویێت: (الْمَرْءُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ) [1]. واتە: (مرۆڤ لەسەر دینی برا دەرەکەیەتی، با هەر یەکێك لەئیوە تەماشا کات کێ دەکاتە هاوڕێی خۆی) .

**دوازدەم: پشت بەستن بە ئومێدی بێ بەرنامە**

زۆر جار زانستخواز تەنها ئومێد دەخوازێ و هەنگاوی بۆ نانێ، هەر دەڵێ مانگێکی تر ، ساڵێکی تر ، کاتێکی تر وا دەکەم، لەسەر ئەم ئومێدە بێ بەرنامە بۆ دارێژراوە دەژی، زانستخواز دەبێ پەلە لەکاری خێر بکات و بە عەمەلی دەست پێ بکات، : ﴿فَٱسْتَبِقُواْ ٱلْخَيْرَٰتِ﴾ [2]. یان قۆتاغێك بە باشی نابڕێ و لەبەریان ناکات دواتر مادەکانی تریشی لەسەر کەڵەکە دەبێ هەر بەم ئومێدە دەژی ئەمەش کۆسپێکەو دەبێ خۆتی لێ بەدوور بگری.

---

(١)حاکم لە مستدرك گێڕاویەتیەوە (١٨٨/٤)، ژ (٧٣١٩) هەروا ئیمامی أحمد لە مسند (٣٣٤/٢)، ژ (٨٣٩٨) .

(٢) سورەتی البقرة ئایەتی ١٤٨ .

## مەنهەجیەتی فێربونی زانستخوازان

خوێندن و فێربوون پڕۆسەیەکی وردە، بەبێ دیارکردن و دانانی مەنهەجی دیاری کراو پرۆسەکە نا تەواو دەبێ و ناگاتە ئامانج، بۆیە زانستخواز دەبێ لە کاتی دەستپێکردنی ئەم پڕۆسەیە مەنهەجێکی دیاریکراوی هەبێ لەسەری بڕوا، تا کاتی بە فیڕۆ نەدات و ڕێگای لێ دووورودرێژ نەبێتەوە، دیاریکردنی مەنهەجی خوێندن پڕۆسەیەکی سەردەمی نییە تازە بەرهەم هاتبێ، سەلەف لە پێشدا گرینگییەکی زۆریان بەم بابەتە داوە، خشتەیەکی وردیان داناوە بۆ زانستخوازان، بۆ ئەوەی زانستخواز بەرچاوڕون بێت و نەکەوێتە هەڵە، سەرەتا خەلەلەکانی مەنهەجیەتی خوێندن و فێربوون باس دەکەین دواتر دێینە سەر مەنهەجیەتی فێربوون. چەند خەلەلێکی مەنهەجی هەیە زانستخواز توشی دەبێ بەهۆی سادەیی و سەرەتایی قۆناغەکەیەوە یان حەماسەتی زۆری بو فێربوون، لەوانە:

١ ـ دەستپێکردنی کتێبە گەورەکان پێش بچووکەکان.

٢ ـ دەستپێکردنی بابەتە خیلافیەکان پێش ئەوەی سەرەتایەکی دامەزراوی زانستی هەبێ.

٣ ـ نەبوونی هاوسەنگی لەنێوان لاگیری مەزهەبی و بەڵگە، زانستخواز زۆر جار هاوسەنگی لەنێوان دەلیل و مەزهەبی لێ تێك دەچێ، یان زۆر گرینگی بە مەزهەب دەدات و پشت لە بەڵگە دەکات، یان بە پێچەوانەوە تەنها دەست بە بەڵگە و دەلیل دەگرێت پشت لەڕاوبۆچوونی مەزهەبەکان دەکات و دەبێتە هۆی تێکچوونی مەنهەچیەتی فێربوون.

٤- گرینگیدان بە بابەتی لاوەکی فقهی و پشت کردن لە ئوصوڵیات، وردکردنەوەی جوزئیات لەسەر حیسابی کولیات.

٥ـ تێکەڵکردنی ماددەکان و نەبوونی ڕیزبەندی و پلەبەندی لە مادە زانستییەکان.

٦ ـ خۆ خەریککردن و لەبەرکردنی هەندێ (متون) لە بری قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر(ص).

٧ ـ پەیڕەوکردنی شێوازی لاسایی لە فێربوون و لاسایکردنی هەندێ کتێب.

٨ ـ نەبوونی یەك مەنهەجی لە مزگەوت و خوێندگاکان، سەرئەنجام بووەتە پارچە پارچەکردنی زانستخوازان.

## گرینگترین ڕێکاری مەنهەجی فێربوون بۆ زانستخوازان

بۆ ئەوەی مەنهەجێکی تەندروست و پڕ لە ئامانج دابڕێژین، زانستخواز بە ڕێگایەکی ئاسان و صەحیح دابڕوات پێویستیمان بەم ڕێگایانە هەیە :

١- لادانی ئەم خالآنەی پێشوو باسمان کرد، لەبارەی لادانی مەنهەجیەت.

٢- ڕزگارکردنی دانانی مەنهەجی خوێندن بۆ زانستخوازان لە دەست تاکەکان، تاك هەرچەندە بەهێز بێت، ناتوانی وەك پێویست مەنهەجێکی کامڵ و تەندروست بۆ زانستخوازان دابڕێژیت بۆیە پێویستە لێژنەیەك ئەم کارە بکات.

٣- هەڵسەنگاندنی واقیعی خوێندن و مەنهەجێك بۆ ئەوەی دەربکەوێت خەلەلی مەنهەجیەتی خوێندن لەکێیە تا لەوێوە گۆڕانکاری تێدا بکرێت.

٤- پێداچونەوە بە هەندێك لەو مەنهەجانەی تا ئێستا خوێندراون لەلایەن زانستخوازانەوە، زادەی مرۆڤەکانن، دەکرێت بە هەڵە دانرابێت، یان بۆ ئەم سەردەمە نەنووسرا بێت، یان لاوازو گونجاو نییە .

٥- پلەبەندی لە وەرگرتنی زانست، کاتێك زانستخواز دەیەوێت زانست فێربێت سەرەتا دەبێت ئەصڵی زانستەکە فێربێت دوایی بێتە سەر شەرحەکەی .

٦- دەستپێکردن سەرەتا بە کتێبە ئاسان و سەرەتاییەکان .

٧- بەردەوامی و پێکەوە لکاندن لە زانستخوازی ، زوو گەرمبوون و زوو ساردبوونەوە هەڵەی مەنهەجی زانستخوازانە .

٨- پەلەنەکردن لە ئەنجام و فێربوونی زانست.

٩- زۆرترین کات بۆ زانستە سەرەکییەکان دانیێ، وەك قورئان و سونەت و تەفسیر ...هتد.

١٠- گرینگیدان بە نووسینەوەی پەراوێز و تێبینی و بابەتە بەسوودەکان .

١١- کۆکردنەوەی نێوان زانستی شەرعی و زانستە مرۆییەکان.

١٢- دوورکەوتنەوە لە کتێبە قورس و درێژەکان[١] .

## سوودەکانی دارشتنی مەنهەجی زانستی بۆ زانستخوازان

گوتمان مەنهەجیەت زۆر گرنگە بۆ زانستخوازان بە خاڵ چەند دانەیەکی لێ باس دەکەین تاوەکو زانستخواز دەست بە مەنهەجیەت بگرێ:

١- کۆتایی هێنانە بە پاشاگەردانی .

٢- زانستەکان بە شێوازی پلەبەندی وەردەگرێ.

٣- ڕێگای زانستی بە ڕاستی دەبڕێت.

٤- لە هەر زانستێك ئەندازەیەکی هاوبەش وەردەگرێت.

٥- ڕێگا بۆ زانستخوازان ئاسان دەکات.

٦- تا ڕادەیەك بۆ هەر زانستێك توخمێکی تایبەت وەردەگرێت.

٧- زانستخواز بە شێوازی تنۆکی ئاو زانستەکان وەردەگرێ لەسەری قورس نابێ، دواتر تەواوی کۆ دەکاتەوەو لە هیچیان بێ بەش نابێ.

٨- بابەتە نوێیەکان ئاگادار دەبێت چونکە ئێستا گۆڕدراون.

٩- دو شێوازی جیاواز وەردەگرێ، یەکیان تەزکیەی دەروونی، ئەویتریان فێربوونی زانستە.

---

(١) بڕوانە: المنهجيه فى التعليم الشرعى ، مقاله: د.عمر مجيد حسنه ، هەروەها: المزيد من المنهجية في الطلب العلم محمد المنصيد . مقالة

١٠-دەگاتە مەبەست و ئامانجی دیاریکراو.

١١- هەموو ژیانی لە یەك زانست سەرف ناكات، چونكە زانستەكان زۆرن تەمەنیش كورتە، بە مەنهەجیەت ئەم گرفتەی لە كۆڵ دەبێتەوە. ئیمامی غەزالی دەفەرمویێت (ولا تستغرق عمرك في فن واحد منها طلبا للاستقصاء فان العلم كثير والعمر قصير)[١]. واتە:هەموو تەمەنت لە یەك زانست سەرف مەكە بەزۆر لە دوا گەڕان، زانستەكان زۆرن تەمەنیش كورتە.

١٢-كاتەكان ڕێك دەخات، سووربوونت زیاد دەكات لەسەر بەردەوامی لە پەیداكردنی زانست[٢].

## خوێندن لە مزگەوتەكان

پەیوەندیەكی زۆر بەهێز هەیە لەنێوان مزگەوت و فێربوون، مزگەوت هەر جێگەی نوێژ و خوا پەرستی نییە ، بەڵكوو یەكێك لە كارە سەرەكیەكانی مزگەوت لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) فێربوون بووە ، لە مێژووی مسڵمانان مزگەوت شوێنێكی سەرەكی بووە بۆ فێربوون و زانیاری .

ئیبن بادیس دەڵێت : ( المسجد والتعليم صنوان في الاسلام من يوم ظهر الاسلام، فما بنى النبي (ﷺ) يوم استقر في الدار الاسلام بيته حتى بنى المسجد، ولما بنى المسجد كان يقيم الصلاة فيه ويجلس لتعليم اصحابه، فالرتبط المسجد بالتعليم كارتباطه بالصلاة فكما لا مسجد بدون صلاة كذلك لا مسجد بدون تعليم، ولهذه الحاجة مضى النبى (ﷺ) على عمارة المسجد بهما فما انقطع عمره كله عن الصلاة، وعن التعليم في مسجده، حتى في مرضه الذي توفي فيه، ثم مضى المسلمون

(١) بڕوانە: احياء علوم الدين، ئیمام غەزالی ( ١- ٦٠).
(٢) بڕوانە: نصائح و درر فى طلب العلم، محمد فقهاء، مقالە.

على هذه السنة في امصار الاسلام يقفون الاوقاف على المساجد للصلاة والتعليم ومن أظهر ذلك وأشهره اليوم ، الجامع الازهر، جامع الزيتونة، جامع القرويين) (١).

واتە : (مزگەوت و فێرکاری دوو بران لە ئیسلامدا لەو ڕۆژەی ئیسلام هاتووە ، پێغەمبەر (ﷺ)،ماڵی خۆی دروست نەکرد تا مزگەوتی دروست کرد، کاتێك مزگەوتی دروست کرد نوێژی تێدا ئەنجامدا، صەحابەکانیشی فێری زانست کرد، مزگەوتی بەستاوە بە فێربوون، وەك چۆن بەنوێژی بەستاوەتەوە، چۆن مزگەوت بەبێ نوێژ نابێت، بەهەمان شێوەش بێ فێربوون نابێت، ئیسلام چەندە پێویستی بە نوێژە ئەوەندەش پێویستی بە فێربوونە ، ئیسلام بەبێ فێربوون نابێت ، لەبەر ئەم هۆکارە پێغەمبە (ﷺ) مزگەوتی درووست کرد ، پێغەمبەر (ﷺ) هەموو تەمەنی لە مزگەوت بەسەر برد بە نوێژو فێربوون ، تەنانەت لە کاتی نەخۆشیشەوە ، دوای ئەوە مسڵمانان لە هەموو وڵاتانی ئیسلامی ئەم بڕیارەیان گرتە بەر، وەقفی تایبەتیان دانابوو بۆ مزگەوت و فێربوون، لە دیارترین مزگەوتەکانی ئەمڕۆ زانکۆی ئەزهەر و زانکۆی زەیتونە و زانکۆی قەرەوینە).

لەگەڵ ئەوەی ئەمڕۆ خوێندن لە زانکۆکان زۆر بووە و گرینگی زۆری پێدەدرێت، بەڵام مزگەوت بۆ زانستە شەرعییەکان دەوری باڵای هەیە، لە گرینگی خۆی نەکەوتووە، بەڵام لە مزگەوتەکان توشی چەند گرفتێکی مەنهەجی بووە پێویستە ئاماژەیان پێبکەین:

**١- نەبوونی هاوشیوە لەنێوان زانستخوازان.**

ئەوانەی لە مزگەوت دەخوێنن ئاستی زانستیان لەگەڵ تەمەنیان یەك نییە، ئەمەش بوّتە گرفت بۆ فێربوون و قوتابی توشی وەڕەزی دەکات.

---

(١) بروانە: اثار ابن باديس ، (٣- ٣٢٥).

**٢-نەبوونی نەخشەڕێگایەکی مەنهەجی.**

هیچ نەخشە ڕێگایەك نییە بۆ دیاریکرنی پلەبەندی کتێبەکان لە مزگەوتەکان ئەمەش پەرش و بلاْوی لەلای زانستخواز درووست دەکات .

**٣- دورودرێژی کاتەکانی خوێندن.**

لەبەر جێگیرنەکردنی کات لەگەڵ دەرسەکان زۆر دەرس هەیە ساڵ دەخایەنێت و زانستخواز پێی بێتاقەت دەبێت و توشی ساردبوونەوە دەبێت .

**٤-نەبوونی خشتەیەکی پێداچوونەوە و بەدوادا چوون .**

تا ئیستاش لە مزگەوتەکان کەمتر وایە خشتە بەکاربێت بۆ زانستخوازان.

**٥- دابڕانی زۆر بە هۆکاری سەفەر کردنی مامۆستا، یان قوتابی یان هەر هۆکارێکی تری ئەمنی ، هەروەها لەوانەیە دەرسی مزگەوت بە ئیلزامی نازانن دەبێتە هۆی دابڕانی زانستخوازان لە دەرس.**

**٦-ددانننەهینان نەکردن بە بڕوا نامەکانیان لەلایەن حکوومەتەوە، ئەمەش ساردی بۆ زانستخواز درووست دەکات .**

**٧-قورسکردنی هەندێك ماددەی زانستی لەسەر زانستخوازان بەشێوەیەك نەتوانن بەردەوام بن،** لەکاتێکدا دایکمان عائشە وەصفی پێغەمبەری دەکرد دەفەرموێت: (کان کلام رسول الله (ﷺ) کلاماً فصلاً یفهمه کلُ من سمعه)[1] .

واتە : (وتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) وتەی دیارو ڕوون و ئاشکرابوون ئەوەی گوێی لێبوایە تێدەگەیشت)[2] .

(١) ئەبو داود لەسونەنەکەیدا گێڕاویەتیەوە (٢٦١/٤) ژ(٤٨٣٩) .

(٢) بڕوانە: المنهج فی التعلیم الشرعی . د.عمر مجید حسنه.

## پێداچونەوەی مەنهەجی خوێندن لە مزگەوت و قوتابخانەو کۆلیژەکانی زانستی شەرعی

بابەتی پێداچونەوەی مەنهەجی خوێندن لە مزگەوت و قوتابخانەو کۆلیژەکانی زانستی شەرعی تێدا دەخوێنین بابەتێکی گرنگە، بە تایبەتی ئەم مادەو بابەت و کتێبانەی لە پێشدا خوێندراوە لەوانەیە لەگەڵ سەردەمی ئێستا گونجاو نەبێ، یان نەتوانێ وەك پێویست لەگەڵ ئەم سەردەمەدا بڕوات، بێ گومان ئەم مادەو مەنهەجانەی خوێندراون لە پێشدا دیارە لە کۆتاییدا مرۆڤ داینــاوەو زادەی دارشتن و زانستی مرۆڤەکانن، ئەوانیش بەپێی ئاستی زانستی و ژینگەو سەردەمی خۆیان دایان ناوە، بۆ ئەوەی مادەو مەنهەجێك بێت عەقڵ و داهێنان و پێشکەوتن دابڕێژرێ پێویستە پێداچونەوەیان پێدا بکرێت.

### مادەکانی تەفسیر:

بە نموونە: خوێندنی مادەکانی هەندێك لەتەفسیری قورئان بە شێوازێك دەخوێندرێت تەرکیزی تەنها لەسەر لایەنی ڕەوانبێژی و ڕێزمان و زمانە، کەمتر دەپرژێتە سەر بواری فکرو فەلسەفەو داهێنان و دارشتنی عەقڵی سەلیم و داهێنانی تازەو ماناو مەبەستە سەرەکییەکانی قورئان وەك عەقیدەو ئەخلاق و مرۆڤ و بونەوەر و ژیان و کۆمەڵگا، ئەم مەنهەجە ناتوانێ ڕووبەڕووی لادەرو مولحیدەکانی سەردەم بێتەوە، یان وەڵامی گومان و تەنانەت بابەتە زانستییە سەردەمیەکانیش بداتەوە، لە کاتێکدا ئەصل لە قورئاندا ئەم بنەما فکری و شارستانیانەیە بە هەموو پێوەرە زانستیەکانیشەوە.

## مادەکانی فیقهی.

له بارەی خوێندنی ماده فقهیەکانەوه هەمان گرفتیان هەیەو بە تایبەتی بەشێکی زۆر باسی عەبدو جاریەو کۆمەڵێك ئەحکامی سەردەمی پێشووه، ئێستا کاتەکەی بەسەر چووەو ئەم بابەتانە نەماون، یان زۆر کەم بوون، هەروەها له زۆربەی مزگەوت و قوتابخانەو کۆلێژەکان یەك مەزهەب دەخوێندرێت، تەرکیزیش لەسەر بەڵگە فقهیەکانە نەك بەڵگەی قورئان و سوننەت، ڕاستە زانایان ئەم مەبەستەیان نییە ، چونکه ئەوان هەر لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سونەت دا نووسیویانە ، بەلاّم هەر لەکوتاییدا بۆچوونی فەقیهەکەیه، کەچی زانستخواز وای تیّ دەگات چونکه هەر ئەوەی بینیوە.

## مادەکانی زمانەوانی.

مادەکانی زمانەوانی وەك نەحو، سەرف، لوغە، دەخوێندرێن بەستراونەتەوه به کۆمەڵێك نمونەی عمرو، زید، و ئەوانە هیچ پەیوەندیەکیان بە ژیانی ڕۆژانەی تاکەکانەوه نییە، نەبەستراونەتەوه بە قورئان و سونەت و بنەماکانی زمانی عەرەبی، تاوەك و زانستخواز فێری بەڵگە هێنانەوه بێت له قورئان وسوننەت، جگه لەوه تا زانستخواز بزانیّ بۆیه (نەحو و سەرف) دەخوێنی تا فێری قورئان وسوننەت بێت و لێی تیّ بگات.

## مادەکانی ڕەوانبیژی.

لەبارەی بەلاغەو بەیان و بەدیع و مەعان، ئەمەشیان ئەوەندە ئالۆز کردووه زانستخواز له برِی ئەوەی پەرۆشی بێت لێی دوور دەکەوێتەوه، هیچ پەیوەندیەکی بە هەڵێجاندنی مانای جوان و داهێنانی بەرزو ڕوونکردنەوەی دیاری قورئانەوه نییە، کۆمەڵێك شیعری سەردەمی پێشو شی دەکاتەوه لەوانەیە زانستخواز هەتا له ژیان مابیّ کاری پێی نەبیّ.

## مادەکانی لۆژیک.

لـەبارەی مەنتیقـەوە ئـەم زانسـتە هەرچـەندە راجیـایی زۆری لەسـەرە لـەنێوان غەزالی و ئیبن تیمیە و ئەوانی تر ئایە ئەمە گرنگە یان نا؟ پێویستە یان نا؟ بـەلاّم بەگشـتی کـە دەخوێنـدرێت بـە شـێوازێك لـە بنـەما ئەصـلیەکان لای دەدات بـۆ جوزئیات، یـان لـەوەش زیـاتر دەچـێتە نێـو وردەکـاری بـێ سـوودو زۆر ئـاڵۆز بـە شێوازێك قوتابی نەك فێری زانست نابێت، بەڵکوو جاری وا هەیە سەریشی لێ تێك دەچێت.

## مادەکانی زانستی کەلام.

لە بارەی زانستی کەلامیشـەوە، ئەمـەیان گرفتێکـی تـری مەنهـەجی زانسـتی شەرعییە! بۆتـە دەروازەیـەك بـۆ مشـتومڕ و قڕقـڕەی بـێ سـوود، بـە ئەندازەیـەك زانستخواز سەری لێ دەرناچێ لەم هـەموو ململانـێ و کـەلام و قسـەو باسـی بـێ سوود.

## مادەکانی (اصولی) فیقە.

لە بـارەی زانسـتی اصـولی فقـەوە بێگومـان دەرگـای تێگەیشـتنە لـە شـەرع، داڕشتنی بنەمای فکری، پێوەری یاساکانی سەردەم اصولی فقە ، هەروەها ڕووحـی شـەریعەت و مەقاصـیدەکان دەرگاکـەی اصـولی فقهـە، کەچـی لـە پێشـدا وەك زانستێکی رووت دەخوێندرا بێ ئەوەی بکرێتە بنەمایەك بۆ هەڵێنجانـدنی ڕووحـی شـەریعەت و تێگەیشـتن لـە مەقاصـیدە سـەرەکییەکانی قورئـان و فـەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)، هـەروەها بەسـتانەوەی بـە سیاسـەتی حـوکم و بـەڕێوەبردن بـە تایبەتی لە ئێستادا ئەم بەشە زۆر گرنگە.

## مادەکانی عەقیدە.

کتێبەکانی عەقیدە واتا دامەزراندنی ئیمان و بنەماکانی، مادەو مەنهەجەکانی پێشوو، باس باسی فکرو ڕێڕەوەکانی پێشووە، ئێستا ئەم فکرانە نەماون، وەك فکری موعتەزیلەو خەواریج و ڕێڕەوەکانی تر، دیارترین و ڕوونترین بابەت، کە بە شێوازێکی زۆر دوورودرێژ قسەی لەسەر کراوە لە قورئان بابەتی ئیمان و عەقیدەیە، کەچی کتێبەکانی عەقیدە زۆر کەم ئەم ئایەتانە شی دەکەنەوە ماناکانیان لێك دەدەنەوە، جگە لەوەش هەر کتێبێکی عەقیدە نووسرابێتەوە لە پێشدا بۆ سەردەمی خۆی بووە و کێشەیەکی عەقیدەی سەردەمی خۆی پێ چارەسەر کردووە، لەوانەیە ئەم گرفتە ئێستا نەبێت، یان بە شێوازێکی تر بێت، یان خاوەن کتێبەکە تێگەیشتنی خۆی بێت، بۆ نموونە عەقیدەی تەحاوی بۆ سەردەمی خۆی نووسراوەتەوە و تێگەیشتنی ئیمامی تەحاوی لە ئایەتەکانی عەقیدە و ئیمان، وەك مادەی عەقیدە نووسراوەتەوە، دواتر ناوی لێنراوە عەقیدەی تەحاوی، ئەمڕۆ ململانێ ئیمانی لە جیهانی ئیسلامی لەبارەی عەلمانیەت و ئیشتراکیەت و سەرمایەداری و عەقیدە دروستکراوەکانە. نەك مەعتەزیلەو خەواریج و ...هتد. زانستخواز بۆیە کتێبی عەقیدە دەخوێنێ بۆ ئەوەی ئیمانی دامەزراو بێ، هەروەها عەقیدەو ئیمانە لادەرو نا ڕاستەکانیش بناسێ.

کاتێك کتێبەکانی (قصة الإيمان) و (الإيمان بالله) ی محمد قطب، و کتێبەکانی تری عەقیدەی سەردەم دێنە گۆڕەپانی خوێندن دەتوانن بناغەی ئیمانی بۆ زانستخوازان دابمەزرێنن، هەروەها بیردۆزو تیۆرە لادەرو نا دروستەکان دیاری بکەن[١].

---

(١) بڕوانە: المشروع الاسلامی المعاصر امام التحديات، د. محسن عبدالمجيد، (ل ٦٦) .

کەواتە پێویستمان بەوە هەیە پێداچونەوەیەکی تەواو بە مەنهەج و مادەکانی زانستخوازان دا بکەین بە شێوازێك مادەکان دابڕێژرێن تا ببێت بۆ بالاَی مرۆڤایەتی بەگشتی و موسولّمانان بە تایبەتی، دارِشتنی مەنهەجی زانستی لە چوارچێوەی بنەماو مەبەست و مەقاصیدەکانی قورئان بێت و تاوتێی بونەوەر بێت و لە ڕێی سونەتەکانی پێغەمبەرمان (ﷺ)، وەك یاسای جێبەجێ کردنە لەسەر واقیع تەتبیق بکرێت.

# جۆرەکانی مەنهەجی فێربوون لە جیهان

لەجیهانی ئەمڕۆ چەندان جۆر لە مەنهەجی فێربوون لەقوتابخانە و زانکۆکان دەخوێندرێ شێوازو جیاوازیەکەشی بۆ بنەما فکری و ئایدیولۆژیاو بیرو باوەڕەکان دەگەڕێتەوە. بۆ بەرچاوڕوونی زانستخوازان و گەنجان بەکورتی ئاماژە بە چەند جۆرێکیان دەکەین:

## ا-فێربوونی ئیسلامی:

### هۆکاری لاواز بوونی زانست و مەنهەجی زانستخوازان

لە پێشدا بە کورتی ئاماژەمان بەوە کرد، کە موسڵمانان بۆ ماوەی چەند سەدەیەك گەیشتنە لوتکەی زانست و زانستخوازی بە هەموو بوارەکانیەوە، بوونە هۆکاری سەرەکی بۆ سەرهەڵدانی شۆڕشی رۆژئاوا تا لە نەزانی و تاریکی رزگاریان بێت و ببنە خاوەنی شۆڕشی زانیاری و تەکنەلۆژیای سەردەم، کەچی بۆ ماوەی سەد ساڵە واتە لە دوای ڕوخانی خەلافەتی ئیسلامی موسڵمانان بە گشتی و کوردستان بەتایبەتی لە ڕووی زانست و مەنهەجی زانستخوازی زۆر لاواز بووەو پاشەکشەیەکی بەرچاوی بە خۆیەوە بینیوە و تەواو لە مەیدانی داهێنان و خزمەتی زانستی بە جێماوە، رۆژئاوا هەموو جومگەو بوارەکانی زانستی بە شێوازێکی سەرکەوتوو و بەهێز پڕ کردووەتەوە[1]. بۆ هەستانەوە سەرپێ و گەڕانەوەی جارێکی تری لووتکەی زانست و مەنهەجی زانستخوازی پێویستمان بە دیاریکردنی هۆکارەکانی لاوازبوونی مەنهەجی زانستی هەیە تاکوو ئەم خاڵانەی دەکرێ

(١) بەستەلەك بوونی زانست سەرەتاکەی لەجیهانی ئیسلامی لەسەدەکانی ١٧ – ١٨- ١٩ – سەرەتای ٢٠ دەستی پێ کرد.

چارەسەر بکرێ کاریان لەسەر بکرێت و هەوڵی چارەسەریان بدەین بۆ ئەم مەبەستە بە کورتی ئاماژە بەم خاڵە سەرەکییەکانی لاواز بوون دەکەین:

## یەکەم: لاوازی دەزگاکانی خوێندن ( المؤسسات التعلمية ).

دام و دەزگاکانی خوێندن لە جیهانی ئیسلامی هاوشان لەگەڵ خێزان و بەشەکانی تری فێربوونی زانستی گۆڕەپانێکی فراوانە بۆ پێگەیاندنی قوتابیان و زانستخوازان, پێگەی یەکەمی دەستپێکردن و هێزو توانای زانستییە بۆ پێگەیاندنی کادرو بیرمەندو و زانای سەرکەوت و هەڵگری پەیامی ڕاستەقینە، بۆیە پێویستە لەسەر دەزگاکانی خوێندن لە جیهانی ئیسلامی لەگەڵ گۆڕانکاری و پێشکەوتنی ژیان هەنگاو بنێن و نوێکاری لە سیستەمی خوێندن و مەنهەج بکەن, نابێ دونیا لە گەشەکردنێکی زانستی بەهێز بێ و دەزگاکانی فێرکردنیش سیستەم و مەنهەجی ٥٠ ساڵ لەمەوبەری تێدا بخوێندرێت، دونیای زانستی نوێ لە دۆڵێك بێت و دەزگاش لە دۆڵێکی تر, سیستەمی خوێندن نەگۆڕ و چەسپاو نیە تا نەتواندرێ دەستکاری بکرێ بێگومان بۆ هەر زەمانێك پێویستە مەنهەج بە شێوازێکی سەردەمیانەو پێشکەوت و دابندرێتەوە تاوەکو زانستخواز و گەنج و قوتابی هۆشیار و دانا و زیرەك و واقیع بین بێ, دەزگاکانی زانستی دەبێ پێگە و گرنگی خۆیان نیشان بدەن پشت ئەستوور بن بە تواناو فەرهەنگی ئوومەت, ئامانجی دیاریکراویان هەبێ تاوەك و بتوانن مەنهەج و سیستەمی تازەو پێشکەوت و بکەنە بنەمای خوێندن لەگەڵ سەردەم و قۆناغی ئێستا بتوانێ هەڵبکا، تاکی دەرچوو لەم دەزگایانە لە لووتکەی ڕۆشنبیری و زانستی و گەشەپێدان دابێت نەك کەسێکی ناواقیعی و تیۆریکی بێ بنەمای جێبەجێکردن و بێ ئاگایەك لە جیهانی ئەمڕۆی لێ دەربچێ. نابێ سیستەم و مەنهەجی دەزگاکانی خوێندن هەر خەریکی وەرگێڕانی حەرفی و کۆمەلێك زاراوەی وابەستە بەزەمەنێکی دیاریکراو بێت،

پێویسته دارِشتنی نویٚ و تازەی خـۆی هـەبێت, مـەنهـەجی هەمەلایـەن و تایبـەتی خۆی هەبیٚ نەك بەشێکی لە رۆژئاواو بەشێکی لە رۆژهەلاٚتەوه وەرگرتبیٚ, هەروەها لەسەر دەزگاکانی فێرکردن لە جیهـانی ئیسـلامی پێویسـتە کۆمـەلێك مەنهـەجی جیـاواز لـە هـەموو بوارەکـانی زانسـت لەسـەر یاسـاو ڕێسـاو بنـەمای زۆر بـەهێز دابندریٚ ڕەچاوی بنچینەو بنەما و ئامانج و بابەته گشتییەکان بکات، تا جوانی و گەورەیی و فراوانی سیستەمی خوێندن و فێربوون لە ئیسلام دەربکـەویٚ، هـەروەها تاك یان زانستخواز ببێته خاوەن عەقلٚ و بیرو هۆشـیاری و ڕۆشـەنبیریەکی گشـتی بتوانیٚ لە هەنگاوی رۆژانەی خۆی جیٚ بـەجێی بکـات و لـە نێـو کۆمـەلگا ڕەنـگ بداتەوه, بتوانیٚ ڕووبەڕووی تەواوی گومان و لاریەکان بێتەوه بەشێوازێکی زانستی و ورد، بۆ ئەم مەبەسته دەبیٚ هێزو توانا زانستییەکانی پسپۆڕو شارەزاکانمان بەکار بهێنین و ڕێگەیان بۆ ئاسـان بکرێـت, دەرگایـان بـۆ بکرێتـەوه ، کـار ئاسـانیان بـۆ بکرێت تا بە بیرو تێڕوانینێکی شارستانیانه مەنهەجی ئـەو سـەردەمه دابڕێژنـەوەو هاوشان لەگەلٚ زانسـته تازەکـانی مرۆیـی و گەشـەپێدان، هـەروەها کردنـەوەی بـە شێوەی زانستی بە تێڕوانینێکی ئیسلامیانه وەك زانسته کۆمەلاٚیەتی و ئابووری و ڕاگەیاندن و گەشەپێدانی مرۆیـی و زانسـته مرۆیـەکان و پەیوەنـدی نێودەولـەتی و دیبلۆماسـی و فکـری سیاسـی و فقهـی سیاسـی و ئیـدارەو سیسـتەمی حـوکم و هاوولاٚتی بوون و مەدەنیەت, تا خوێندکار بزانیٚ خوێندنی ئیسلامی یان مەنهەج و پەروەردەو فێرکردنـی ئیسـلامی تـەنها بـواری زانسـته شـەرعییەکان ناگرێتـەوه ، بەلکوو تەواوی زانستەکانی ژیان دەگرێتەوه, توانای بەرهەمهێنانی دەیان زانسـتی نوێی هەیه تا دەگاته بواره تەکنەلۆژیاو بایەلۆجی و ئەوانی تریش.

هەروەها دەزگاکانی فێرکردن دەبیٚ تەواوی پێداویستییەکانی فێربـوون لـە ڕووی کردەنـی فەراهـەم بکـات، تـا زانسـتخواز بتـوانیٚ ڕۆژانـه بـە کردەنـی زانسـتەکان

جێبەجێ بکات و مومارەسەیان لە سەر بکات, لە هەمانکاتدا دەزگاکانی فێربوون پێویستە هەوڵی کردنەوەی ناوەندی لێکۆڵینەوەی زانستی بدات، بەلاّم دەبێ لێکۆڵەر و کەسانی پسپۆر تێیدا کار بکەن، تەنانەت ئەم بەشانەی باسمان کرد، نابێ بکرێ تەنیا دوای فەراهەمکردنی تەواوی وەسائیل و پێداویستییەکانی لەگەڵ مامۆستاو پسپۆڕو شارزا لە بوارەکانی خۆیاندا. ئەوانەی لە پێشدا باسمان کرد هەموویان پێویستیان بە توانا مادی و مەعنەوی هەیە، بەبێ فەراهەمکردنی پێداویستییەکان سەرکەوتوو نابێ.

هەر کارێکی زانستی و فێرخوازی نایەتە بەرهەم تەنها بەهەوڵی شەو و ڕۆژی کرداری بەردەوام لەگەڵ بەرچاوڕوونی و ئامانج و دیاریکردنی روئیا, ئەمانە تەنها دروشم و قسەکردن نیە پێویستی بە کرداروو جێبەجێکردن هەیە، لەگەڵ نەخشە ڕێگاو دیاریکردنی ستراتیژی دوورخایەن.

## بۆ وردکرنەوەو کورتکردنەوەی کارەکانی دەزگاکانی فێرکردن لە سەرەتا پێویستمان بەم خالأنە هەیە

١- وردبوونەوە و جیاکاری و شیکردنەوەی بابەتە زانستی و زانیاری و فێرکاریەکانی نێو قورئان و سونەتی {صحیح}ی پێغەمبەر (ﷺ) و ئاشناکردنیان و تێگەیشتنیان بەرەچاوکردنی دیراسەی بوارە مەبەستیەکەی بۆکەسانی فێرخواز و رۆشنبیر، چۆنیەتی نەخشەدانان و شێوازی گەیاندنی بە شێوازی مەنهەج و سیستەمی خوێندن.

٢- بەهەمان شێوە وردبوونەوە و شیکردنەوە و جیاکاریەکی ورد لەم سەروەتە زۆر و مرواریە زانستیە فقیانەی لە کەلەپووری ئیسلامیدا هەیە هەلێنجادنی بابەتە جوان و گرنگ و پێویستیەکان، ئاسانکردنیان بۆ زانستخوازو قوتابی و گەنجەکانمان، کارکردن لەسەر مەنهەجی زانستی و سیستەمی سەرکەوتوو بۆ

پێگەیاندنی زانستــخوازان و قوتابیـان بـەبێ گەڕانـەوە بـۆ قورئـان و فـەرموودەی صـەحیحی پێغەمبـەر و کەلـەپووری ئیسـلامی نـاتوانی تـاکێکی پەیامـدار پـێ بگەیەنی، چونکە ئەمانە و بنەمای گرنگن بۆ حالەتی زانستی و ئینتیمای تەواو.

٣- لەسەر دەزگاکانی فێربوون و زانکۆکانی زانسـتە ئیسـلامییەکان پێویسـتە گرنگی بەکەسانی پسپۆڕو شارەزا بدەن بۆ لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زانستی گرنگ لەسەر بابەتە فێرکاری و پەروەردەییەکان لە قورئان و سونەتی صەحیحی پێغەمبەر و کەلـەپوری زانایـان هـەڵبنجێنن و بیکەینـە مەنهـەج و سیسـتەمی خوێنـدن بـۆ زانستــخوازان و قوتابیـان، بـە شـێوازی سـەردەمیانە وە بەرەچـاوکرنی پاراسـتنی ڕەسەنی ئیسلامی و مەنهەجی ڕاسـت و دروسـتی ئیسـلامی. شـێوازی مەنهـەجی لاسایی و لاواز لە بوارە جیاوازەکان وای لـە زانستــخوازان کـردووە زۆر بـە لاوازی دەرکەون، نەتوانن لەگەڵ واقیعی زانستی سەردەمی ئەمڕۆ مومارەسـە بکـەن، لـە زۆر بابەتەکان هەر تێ ناگەن تەنانەت نـاتوانن وشـەیەکیش هاوبەشـی بکـەن بۆیـە دەزگاکانی زانستی و فێربوون دەبێ دوورکەونەوە لەم مەنهەجە سـادەو تەقلیـدی و لاوازە.

٤- لەسەر دەزگاکانی فێربوون پێویستە گرنگی بە هۆشیاری گشتی بدات ، بە تایبەتی بۆ سەرکردەو زاناو بانگخوازەکان، تا بەرچاوڕوون بن و ئاگاداری تـەواوی ڕووداو و پێشهاتەکان بن، بە تایبـەتی ئـەو ڕووداوانـەی پەیوەنـدییان بـە جیهـانی ئیسلامی و موسوڵمانانەوە هەیە .

٥- هــەروەها گرنگــی بـدات بــە مەســەلە گرنگــەکانی ئــەم ســەردەمە کــە پەیوەندییان بە ئومەی ئیسلامیەوە هەیە، نەخشە ڕێگایان بۆ دابنێ واتە پلەبەندی بۆ کێشەکان بکات بە شێوازی گرنگ ترو گرنگ، هەنگاویان بۆ بهاوێژێ، لە ڕێـی کردنەوەی کۆنفراس و کۆڕو سیمینارو نـەداوەتی گشـتی و لێکۆڵینـەوەی زانسـتی،

گرنگی بەم قەزیانە بدرێت دەرگا بۆ ئەو کەسایەتیانە بکرێتەوە تا بەشداری کارای تێدا بکەن و لە زانکۆ و دەزگاکانی خوێندن ڕەنگ بداتەوە.

٦- کردنەوەی خوولی تایبەت بۆ خوێنکار و زانستخوازان، کە باشترین کاری ئەمڕۆی پێگەیاندنە بووەتە وەسیلەیەکی زۆر سەرەکی، دەکرێ ئەم خولانە تایبەت بکرێن بۆ بوارە جیاجیاکانی زانست، زانستخوازان تێیدا بەشداری بکەن لەگەڵ وەرگرتنی زانستەکەش پەیامی ڕاستەقینەی هەڵگری زانستخوازان فێر بکرێن، تا زانستخواز تەقلیدی نەبێ و زانستەکەی خۆی وەك هەڵگری پەیامداری هەڵگری نەك خاوەن پیشەیەك.

٧- ئەم ڕێبەرە جگە لەوەی بۆ بەرچاوڕوونی و ڕێ ڕۆشنکردنەوەی زانستخواز و گەنجان و قوتابیانە، بەلاّم ئامانجی سەرەکی **هەستانەوەی ئومەیە**، بۆیە دەبێ دەزگاکان لە ڕووی فێرکردنەوە زۆر گرنگی بە پێگەیاندنی کادیری زانستی بدەن، بە تایبەتی ئەم زانستانەی خزمەت بە ڕەسەنیەتی مەنهەجی ئیسلامی دەکەن، هەروەها خزمەت بەتەواوی مرۆڤایەتی دەکەن، تا بە هەستانەوەی دەزگاکانی فێرکردن و بانگخوازی بچێتە پێش و هەنگاو بۆ سەرکەوتن و پیشەنگی میللەتان بدات، وەك ئەوەی لە پێشدا بەم زانستانە پیشەنگی میلەتان بوو.

٨- زانستخواز و گەنج و قوتابی دەبێ ڕوانگەیەکی گشتگیریان هەبێ لەسەر چەمك و مەفاهیمەکانی وەك: یەکتاپەرستی، تزکیە، جێنشینی، ئاوەدانکردنەوە، بەها، ڕەوشت، هەروەها روئیایان بۆ بوونەوەر، سروشت، مرۆڤ، ژیان، کۆمەڵگا ، زۆر ڕوون دەبێ بۆیە پێویستە لەسەر دەزگاکانی فێربوون ئەم چەمکانە بکاتە تەوەری مەنهەجی خوێندن[1] .

(١) بڕوانە: أزمة العقل المسلم، عبدالحميد أبوسليمان، (ل ٢٢٢).

## دووەم: پشت گوێ خستنی بەرزەفتکردن(الضبط).

ئەگەر تەماشای حاڵی فێرکردن بکەین دەبینین (زەبت و رەبتی)کەم بووە, هەرکەس بۆ خۆی چی پێ خۆشە ئەمە هەڵدەبژێ زانستخواز بۆ خۆی مەنهەجی خۆی دیاری دەکات و مامۆستاش لای خۆیەوە مەنهەج دیاری دەکات, بەم شێوازە مەنهەجی خوێندن تاڕادەیەك ستاندەر و یەك ئاڕاستە نییە، تا لەسەر شێوازێکی تایبەت و ورد بڕوات و بخوێندرێ, جیاوازی مەنهەج لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر وای کردووە تاکەکان لە ڕووی پێگەیاندنەوە جیاوازبن و نەتوانن یەك ئاڕاستە وەرگرن ئەم حاڵەتەش بیرکردنەوە و تێڕامان و یەك ڕێزی و یەك هەڵوێستی لاواز دەکات, وەك ئەوە وایە هەر یەك لە شوێنێکی جیاواز پەروەردە بوو بێت، بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفتە پێویستمان بەم هەنگاوانە هەیە:

أ- دانانی لیژنەیەکی پسپۆڕ بۆ دانانی یەك مەنهەجێکی ستاندەر لەسەر بنەمای پسپۆڕی و شارەزایی لەدانانی مەنهەجی خوێندن.

ب- دەبێت بەزۆری بێت.

ت- کات بۆ مامۆستا و قوتابی دیاریکراو بێت.

پ- شوێنی دەزگاکانی فێرکردن شێوازێکی ڕێك و پێك و ئیدارەیەکی توندوتۆڵی هەبێت.

ج- خشتەیەکی ورد بۆ وانە و زانستەکان تەرخان بکرێ.

ح- سیستەمی لێپرسینەوە و پاداشت پەیڕە و بکرێ.

خ- سەر ناسی بۆ دیاریکردنی تاکەکان بۆ شوین و خواستی خۆی لەکام بوار توانا دارەو ویستی لەسەر بێ.

## سێیەم: پشتگوێ خستنی ماددەکانی ئاداب و ئەخلاق لە مەنهەجی خوێندن.

یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی پاشەکشەی مەنهەج و فێربوون لە جیهانی ئیسلامی پشتگوێ خستنی ماددەکانی ئاداب و ئەخلاق, لادانی ماددەکانی ئەخلاق و ئاداب بە ناوی ئەوەی زانست تەنها پێویستی بە ئامرازەکانی زانست و کەرەستەکان هەیە، دەستگرتن بەم هۆکار و ئامرازە زانستیانە بە تەنها دەمانگەیەنێتە مەبەست، بێگومان ئەوەش هەڵەیەکی زۆر کوشندەیە! هەر زانستێك هەر چەند بەهێز و پێویست بێت ئاداب و ئەخلاقی لەگەڵ نەبێت ئەبێتە زانستێکی کوشندە و مرۆڤەکان پێ لە ناو دەبات! وەك ئەم زانستە سەربازییانەی ئێستا ڕۆژئاوا درووستی کردووە لە چەکی ئەتۆمی و مووشەك و زرێ پۆش ....هتد, بووەتە مایەی لەناوبردنی مرۆڤەکان و تاکەکانی بەختەوەر نەکردووە هۆکارەکەشی نەبوونی ماددەکانی ئاداب و ئەخلاقە لە خوێندنگا جیهانییەکانی ڕۆژئاوا.

عوتبەی کوڕی ئەبو سوفیان بۆ پەروەدەکردنی منداڵەکانی بە عبدالصمدی دەگوت:( لیَكن أول ما تبدأ به من إصلاحك بَنِيَّ إصلاحك نفسك، ......... وعلمهم سِيَرَ الحكماء وأخلاق الأدباء)[١].

واتە: لە خۆتەوە چاکسازی بکە، ژیانی دانایان و ڕەوشتی ئەدیبان فێری منداڵەکانت بکە.

جۆن سیمۆن[٢] دەڵێت: (ليست وظيفة المدرسة مقصورة على التعليم فقط فإن بثَ الفضيلة والإقدام من أهم وظائف المدرسة)[٣].

---

(١) بڕوانە: حلية الأولياء وطبقات الأصفياء (٩/ ١٤٧).

(٢) -

(٣) -

واتە:پیشەی قوتابخانە تەنها كورت نەكراوەتەوە لە فێربوون، بەڵكو بلاوكردنەوەی ئاداب و ئەخلاق و پێشكەوتن لە گرینگترین كار و پیشەی قوتابخانەیە.

## چوارەم: پشتگوێخستنی ڕەخنە و پێشنیار و تێبینی جوان.

هەموو زانستێك بە ڕەخنە و پێشنیار گەشە دەكات و پێشدەكەوێت لە قۆناغی كۆتایی لە جیهانی ئیسلامی تا ڕادەیەك دەرگای ڕەخنە داخرا یان بڵێین لاوازی بەخۆوە بینی، بە تایبەت لە بواری فیقهـ[1]، ئەمەش وای كرد زانست و مەنهەج و وانەكان وەك خۆیان بمێننەوە, لەگەڵ چوونە پێشی زانستی سەردەم و گۆڕانكارییەكان نەتواندرا هەنگاو بنرێت و لەگەڵ قۆناغەكەدا هاوتەریب بێت. بەشێك لە زانستخوازانیش وا پەروەدەكران نابێت ڕەخنە بگرن یان بڵێین دەرفەتیان پێنەدرا ئەمەش بووە هۆكارێكی تری لاوازی و سستی فێربوون و خوێندن.

## پینجەم: پشتگوێخستنی ڕاهێنان و كاركردن بە زانست و زانیاری.

مەبەست لە زانست خۆفێركردن و ڕاهێنان و كاركردنە, هەر زانستێك كاری پێ نەكەی شوێنەواری خۆی نابینرێت لە واقیع، زانستخواز دەبێت ڕابهێندرێت لەسەر ئەو زانستەی ، كە فێری بووە و دواتر بیكاتە كردەوە لە ژیانی ڕۆژانەی خۆی. صحابە دەفەرموون:( كُنَّا إِذَا تَعَلَّمْنَا عَشْرَ آيَاتٍ مِنَ الْقُرْآنِ لَمْ نَتَعَلَّمِ الْعَشْرَ الَّتِي بَعْدَهَا حَتَّى نَعْرِفَ حَلَالَهَا وَحَرَامَهَا وَأَمْرَهَا وَنَهْيَهَا.)[2].

---

(١) - قوناغی داخستنی دەرگای ئیجتیهاد بۆ ماوەیەكی زۆر كاریگەری زۆری لەسەر پێشكەوتن و فێربوون هەبوو ڕاستە ئەمە لەچەرخی چوارەم بوو بەلاّم تا دوا قوناغی ڕوخانی خەلافەتیش كاریگەری نەرینی هەر مابوو.

(٢) بڕوانە: تفسير القرطبيَ (١/ ٣٩).

واتـە: ئێمـە ئەگـەر فێـری ١٠ ئایـەت بـواین لـە قورئـان خۆمـان فێـری ١٠ ئایەتەکەی دوای ئەو نەدەکرد تا وەکو حەڵاڵ و حەرام و فەرمان و قەدەغەکراوەکان فێر نەبوباین.

## شەشەم: هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامە دوور لە زانست.

ململانێی بە دەستهێنانی بڕوانامە بۆتە دیاردەیەکی گشتی, خاڵێکی سـەلبیە لە ئێستادا بۆ زانستخوازان لـە جیـاتی خۆمانـدووکردن بـە خوێنـدن و خوێندنـەوە ئاوات و ئامانجی دەبێتە بە دەستهێنانی بڕوانامە، ئەوەی زانسـتی هـەبێت ئەگـەر بڕوانامەشی نەبێت جێ دەستی دیـارە ، کارەسـات ئەوەیـە زانسـتت نـەبێت تـەنها بڕوانامەی هەبێت، بەبێ زانست ئەمە هەموو ڕۆژێـك و چـاوپێکەوتنێك، مردنێـك ئاسانتر دەبێت لەمە. بۆیە زانستخواز نابێت تەنها بۆ بڕوانامە هەوڵ بدا سەحابەی پێغەمبەر (ﷺ) لە لوتکـەی زانسـت و بـەرزی پێشـکەوتن بـوون کەچـی خـاوەن بڕوانامە نەبوون. بێگومان گرنگیدان بەبڕوانامە زور کارێکی باش و پێویستە بەلاّم بەمەرجێك راست و دروست و واقیعی و زانسـتیانە بێـت خاوەنەکەشـی شایسـتەی بڕوانامەکە بێت و بەهەوڵی خوی بەدەستی هینابێ.

## حەوتەم: گرینگی نەدان بە مێژووی سەرکەوتن و شکستی میللەتانی پێشوو.

لە پڕۆگرامی خوێندن زۆر پێویستە مێژوو و بەسەرهاتی میللەتانی تێدا بخوێندرێ، قورئان دەیان بەسەرهاتی لەسەر میللەتان باس کردووە, چۆن هەستاونەتەوە یان چۆن ڕووخاون و هۆکاری چی بووە؟چۆن دەتوانن جارێکی تر پیشەنگی میللەتان بن؟ لە کۆتاییدا دەفەرموون: ﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ [(١)]. واتە: (بەڕاستی لەبەسەرهاتی ئەوانەی پێشوو پەندو و ئاموژگاری هەیە بۆ خاوەن عەقڵەکان).

شارستانیەت و ئاوەدانکردنەوە و چاکسازی هۆکار و چارەسەری لەژیانی میلەتانی پێشوو بەرچاو روونییە و فێربوونە بۆ زانستخواز، کاتێك پشتگوێ خرا بووە هۆکارێکیتر لە دواکەوتنی زانست.

## هەشتەم: غەزوی فکری

أ- ترسناکترین هۆکار بۆ لاوازی زانست و فێربوون لەجیهانی ئیسلامی هەڵمەتی کردنەوەی دەزگاکانی تەبشیری بوو .

ب- دوای دەزگا تەبشیرییەکان کردنەوەی دەزگا داگیرکارییەکانی سەلیبیەت بوو، دوای ڕووخانی خەلافەتی ئیسلامی ڕێگایان بۆ تەخت بوو بەئاسانی شوناسی موسڵمانان بسڕنەوە و شوناسی خۆیان لەڕێی دەزگا تایبەتییەکانی خۆیان بلاّوکەنەوە، بەتایبەتی خوێندن.

---

(١) سورەتی یوسف ئایەتی ١١١ .

ت- لەم دوو هەڵمەتە ترسناكتر هاتنی عەلمانیەت بوو لەساڵی (١٩٢٤) بەسەرۆكایەتی (مستەفا كەمال ئەتاترك)[١]، كاتێك كۆتایی بەخەلافەتی ئیسلامی هێندرا، دەوڵەتێكی عەلمانی لەتوركیا ڕاگەیاند، دەستیان بەگۆڕینی مەنهەجی زانستی ئیسلامی كرد لە شوێنی ئەوە عەلمانیەتیان بلاْوكردەوە، لە ٢/ئازاری ١٩٢٢ پەرلەمانی توركی بڕیارێكی بەژمارە (٤٢٩) دەركرد كە وەزارەتی ئەوقافی تێدا هەڵوەشاندەوە، یاسایەكی تری دەركرد بە ژمارە (٤٣٠) لە پەرلەمانی توركیا تێیدا بڕیاری یەكخستنی خوێندنی داو خستیە ژێر ركێفی وەزارەتی معاریف. لەهەمان كاتدا كەمال ئەتاتورك بڕیاریدا بەداخستنی قوتابخانە ئیسلامییەكان و نووسینەوە و فێربوونی بە زمانی عەرەبی ڕاگرت و كردیە لاتینی، بەشێوازی فەرمی خوێندنی ئایینی كۆتایی پێ هێنا[٢].

## نۆیەم: گرنگی نەدان و پشتگوێخستنی سیاسەتی خوێندن (السیاسة التعلیمیة).

مەبەست لە سیاسەتی خوێندن ئەم مادەو مەنهەجانەیە لە بنچینەو بنەمای تەواوی خوێندنگاكان دەخوێندرێ، وەك بنەمایەك بۆ تەواوی مادەكانی تر، كەواتە سیاسەی فێربوون دەبێتە بنەمای سەرەكی و مادەكانی خوێندن و نەخشە ڕێگاو ئامانجی خوێندنیش هەر لەسەر ئەم بەشە بینا دەكرێ. لە تەواوی خوێندنگاكانی دونیا پەیڕەوی ئەم خاڵە بنەڕەتە دەكرێت، تەنها ئەمە لە زانكۆكانی جیهانی ئیسلامی نەبێ لەم سەردەمە پەیڕەو ناكرێت، لەوەش كارەسات تر ئەوەیە جگە لە

(١) (مستەفا كەمال ئەتاتورك). دامەزرێنەری كۆماری توركیای عەلمانی لەسەرەتای كارەكانی بانگەشەی عەلمانیەتی دەرنەخست، هاوپەیمانیەتی لەگەڵ زانا و سۆفیەكان و شێخەكان بەست، بەناوی چاكسازی و گۆڕانكاری لە دەوڵەت، بەسەر پشتی خەڵكی ئایینپەروەر گەیشتە سەر تەختی حوكم! ئینجا بڕیاری لەناوبردنی خەلافەتی ئیسلامیدا(١).

(٢) بڕوانە: ملخص بحث عن اوضاع التعلیم الاسلامي في جمهوریة تركیا العلمانیة..د.علي شفق .

ئاینیە ئاسمانییە گۆڕدراوەکان تەنانەت عەلمانیەکانیش مادەی یەکەم و ئەساسی لە خوێندنگاکان دەکەن بە ئایدولۆژیاو زانستخوازو قوتابی بە دەرس دەیان خوێنێ، بەلاّم هەندێ بۆچوونی نوێی کەسایەتی ئیسلامی، کە لە سیاسەت شکستیان هێناوە لە جیاتی ئەوەی دان بە شکستی سیاسی خۆیان دابنێن، دێن یەخەی ئیسلام دەگرن یان دەڵێن پێویست ناکات خەڵك و زانستخواز لەسەر عەقیدەو ئایدەلوژیا پەروەردە بکرێت بەڵکوو تەنها عەدالەت بەسە بۆ بنەمای کارکردن[(١)]، دەیانەوێ ئەمە لە بواری فێرکردنیش پەیڕەو بکەن، بێگومان ئەمە هەڵەیەکی زۆر گەورەیە، لەم وێنانەی خوارەوە سیاسەتی فێربوونی جیهان و ئایینەکانمان بۆ دەردەکەوێت بزانە ئەوان چۆن بنەمای زانستخوازیان لەسەر سیاسەتی فێربوون داناوەو قوتابی لەسەر پەروەردە دەکەن و لە منداڵییەوە ڕای دەهێنن.

## ١- خاچپەرستە دەمارگیرەکان:

ئەو خاچپەرستانەی دەمارگیریەکی کوێرانەیان هەیە بۆ نەصرانیەت یەکەم وانەی خوێندنیان لە سیاسەتی فێربوون ئیمان هێنانە بە عەقیدەی نەصرانی، غەیری خۆیان تەکفیر دەکەن، هەوڵی بلاّوکردنەوەی دینی نەصرانی دەدەن، هەموو وەسیلەیەکیان بۆ فەراهەم دەکەن جگە لەوەی پشگیری تەواوی مادی و مەعنەوییان دەکەن.

---

(١) بۆچونی سەردەمی ئایدولوژیا بەسەر چووە و باوی نەماوە تەنها پیوستمان بەعەدالەت هەیە ، هەڵەیەکی گەورەیەو بەشێك لەئیسلامییە سیاسییەکان تێی کەوتوون لەسیاسەتکردن شکستیان هێناوە یەخەی پرانسیپەکانی ئیسلامی دەگرن، دیارە عەدالەت مەبدەئیکی گەورەو بنەمایەکی سەرەکیە لەئیسلام دا بەلام هەمو ئیسلامیش نیە ، ئیسلام مەنهەج و شەریعە و ئیمان و عەقیدەیە ئەگەر تەنها عەدالەت مەرج بێ ئەوا ئەوروپا لە لووتکەی ئیسلامیبوونە کەچی عەدالەت هەیەو ئاگرپەرست و بت پەرست لەسەدەی ٢١ دا لەلووتکەیە وەك لەسیاسەی خوێندنیش لەم پەرتوکەدا ئاماژەمان پی کردوە هەموو فکرە و ئایدیاکان گرنکی تەواو بە ئایدیولوژیا و عەقیدە دەدەن .

**٢- یەهودیە خۆپەرستەکان(ئەنانییەکان):**

ئەمانەش بەهەمان شێوە یەکەم مادەی زانستی دەیخوێنن مادەی بڕوا هێنانە بە عەقیدەی دینی یەهودو وەلاو و ئوبەڕایە بۆ ئەم دینە و گوێڕایەلیکردنە، نەوەکانی خۆیان لەسەر گوێڕایەلی بۆ دینی یەهوودی پەروەردە دەکەن، لەگەڵ ئەوانەش هەندێ بواری زانستی و شارستانیەت و مەدەنیەت و خزمەتی کۆمەڵگاشی لەگەڵ دەدەن.

**٣- عەلمانییەکان:**

عەلمانیەت لەگەڵ ئەوەی زۆر بانگەشەی مەدەنیەت و زانستخوازی دەکەن، بەلاّم بەکردار سەلماندیان کە هیچ پەیوەندییان بە زانستەوە نییە، لە کوردستان هەرچی جومگەکانی وەزارەتی خوێندنی بالاّو پەروەردەو فێرکردنە مەنهەجی عەلمانیەتیان تێدا پەیڕەو کرد، پۆل بە پۆل ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە زەمانی حکومەتی عێراقی بەعس داندرابوو لایانداو فکری عەلمانیان تێدا بلاّو کردەوە، هەرچی قوتابخانەی زانستە شەرعییەکان بوو دایان خستن، لە پەرلەمان هەوڵی بە یاساکردنی جیندەریان دا، دیارترین کارەکانی عەلمانیەت لە کوردستان دامەزراندنی پلاتفۆرمی دابڕان بوو لەژێر ناونیشانی (ئاین بۆ تاك و دیموکراسیەت بۆ هەموان)، واتا بەپێی ئەم درووشمە دەبێ ئاین لە خوێندن و فێربوون دوور بخرێتەوە عەلمانیەت جێبەجێبکەن.

**٤- شوعیەکان:**

شوعیەکان کاتێك دەیانەوێت سیاسەتی خوێندن بۆ ولاّتێك دابڕێژن یەکەم مادەی مەنهەجی ئەوان پێ گەیاندنی نەوەیەکە بە فکرەی (مولحید) بڕوانەبوون بە خودا، هەروەها بەها بالاّکانی کۆمەلاّیەتی و ئەخلاقی، نەوەکانیان لەسەر بڕوابون بە دیالێکتیك و مادیەت و شوعیەت پەروەردە دەکەن، جگە لە مانە هەوڵی گوێڕایەڵی تەواو دەدەن بۆ سەرکردەکانی شوعیەت و مل کەچ بوونیان.

**٥-داگیر کارەکان (الاستعمار):**

داگیرکارەکان بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتی خوێندنی سەرەتا وڵاتەکان دەخەنە ژێر دەستی خۆیان ئینجا ژیرانە بەپێی نەخشەو پلانێکی دارێژراو ماددەکانی فێربوون دەخەنە قوتابخانەکانەوە، ئەوەکانی لەسەر خۆشەویستی بۆ وڵاتە داگیرکەرەکان پەروەردە دەکەن، دووریان دەخەنەوە لە خۆشەویستییان بۆ ئایین و نەتەوەکەیان، ڕایاندەهێنن لەسەر قبوولکرنی ژێردەستەی و ملکەچبوون بۆ داگیرکاریەکانیان .

**٦. بێ باوەڕە ماددیەکان:**

ئەوانەی هیچ باوەڕێکیان نییە بەئایین تەنها بەمادە نەبێت مەنهەجی سیاسەی خوێندنی نەوەکان فێری وەلائوو خۆشەویستی دەکەن بۆ مادیەت، وایان پەروەردە دەکەن، کە ئەم بوونەوەرە درووستکەری نییە و ئەوەی پێویستە بڕوای پێبکەی تەنها ماددەیە و دوای ئەم ژیانە هیچ ژیانێکی تر نییە بەناوی ڕۆژی دوایی ، بێگومان هەموو ئەم مەدرەسە فکریانە بۆ چەواشەکاری خەڵك زۆر بابەتی تر تێکەڵ دەکەن، وەك شارستانیەت و زانست و مەددەنیەت و هتد... هەر بۆ ئەوەی بەئاسانی پلانەکانیان ئاشکرا نەبێت.

**٧. خاوەن بیرۆکەی قەومی و نیشتیمانیەکان:**

ئەوانەی هەڵگری نەزعەی سەرمایەداری و سۆشیالیستی و دیموکراتی و دیکتاتۆری و عەلمانیەتن لە هەر شوێنێك بن ماددەو مەنهەجی سیاسەتی تەعلیمیان پەروەردەکردنی نەوەیەکە ئەم نەزعەیە هەڵگرێ، ئیمانی پێ هەبێ، کاری بۆ بکات و لەنێو ناوەندەکانی خوێندن پەیڕەوی بکەن(١).قەومیەت لەپێش

(١) بروانە: غزو في الصميم، دراسة واعية للغزو الفكري والنفسي والخلقي والسلوكى، عبدالرحمن حسن حبنكة الميداني، لا (١٣ - ١٥).

دین و ئیمانی خۆیان دادەنێن، کردوویانە بەکاری سەرەکی و بنەمای پێکەوەژیان ، خۆشویستن و ڕق لێبوونەوە لەسەر قەومیەت بینا دەکەن ڕقیان لەقەومەکانی تـرە و بوغزو قینیان لەبەرامبەر دروست دەکەن چەقی ژیان دەبیتە قەومیـبوون.

**٨- موسڵمانەکان:**

ئـەم مەدرەسـە فکـری و ئایینیانـەی باسمـان کـرد لـەڕێی ڕاسـت لایـان داوە، ئاراستەی زۆر خراپیان وەرگرتووە، لەگەڵ ئەوەش شەو و ڕۆژیان خستۆتە سـەریەك تا بتوانن لەسەرجەم ناوەنـدەکانی خوێنـدن مادەکـان لـەڕێی سیاسـەتی خوێندنـەوە پەیڕەو بکەن، دیارە ئیسلام خۆی و مەنهەج و ڕێبازەکەی حەق و ڕاستە، هیچ لاری و گومڕایەکی تێدا نییە، لەگەڵ زانست و زانیاری و ویژدان و عەقڵ و لۆژیك تێـك نـاگیرێ، بـەڵکوو تەواوکـەری یـەکن، لـەماوەی (١٣) سـەدە لـە ڕێگـەی خوێندنگاکانیانەوە توانییان مادەو مەنهەجەکان بکەنە پەیڕەو تەواوی زانسـتخوازو قوتابی و گەنجانی لەسەر پەروەردە بکـەن، چـەندان نـەوەی پێگەیانـد تـا ئێسـتاش کاریگەری گەورەیان لەتەواوی خوێندنگا جیهانییەکان ماوە، مەنهەجیان بۆ تەواوی مرۆڤایەتی دارِشت، خزمەتی مرۆڤایـەتییان کـرد بـەبێ جیـاوازی، بۆیـە پێویسـتە ئێستا موسڵمانان یەکەم هەنگاویان دانانی نەخشە ڕێگایـەکی سیاسـەی تـەعلیمی بێت ، دووبارە بونیات نانەوەی فێرکردن و زانسـتە مرۆیـەکان, نـەوەکانی داهـاتوو لەسەر قورئان و سونەت و کەلەپوور و تەواوی زانستە پیشەییەکان پەروەردە بکەن، مرۆڤایەتی دووبارە بخەنەوە سەر سکەی ئەخلاق و بـەها، مرۆڤـەکان بەگشـتی لـەم کوشتن و تالاَن و یەکترسڕینەوە ڕزگار بکـەن، ئـەمڕۆ مرۆڤایـەتی بـەهۆی زانسـتی بێبەهای مرۆڤایەتی و ئەخلاقی کەوتۆتە بەر هەڕەشەو خەریکـە بەتـەواوی لەبـەین بچێت.

ئێستا لەزانکۆکانی جیهانی ئیسلامی، سیاسەتی خوێندن عەلمانیەت بالأدەستە

بەهۆی دەسەلاّتی سیاسی خوسەپێنی عەلمانیەت ، قوتابی ئەو ماددانەی دەیخوێنیّ فێری هیچ بنەمایەکی سەرەکی نابێت، لەدینەکەی کەئیسلامە لەکاتێك دا قوتابیان ڕێژەی سەرەکییان لەتەواوی جیهانی ئیسلامی لەسەروی (٩٠٪) تەوەیە، هەر هەنگاوێك بۆ گێڕانەوەی بەها و ڕەوشت و تەنانەت سیاسەت و حوکمیش بدریّ بەبیّ چاکسازیکردن لەسیستەمی خوێندن و دامەزراندنی سیاسەتی تەعلیمیکی سەرکەوتوو، هیچ بەرهەمی نابیّ، بۆ ئەم بابەتە دەبیّ ئالیەتی ورد بدوزرێتەوە بەتایبەتی لەڕێی پێشکەشکردنی پرۆژە یاسای خوێندن و مەنهەجی سەرکەوتوو لەپەرلەمانەوە تا بتوانین بەشێوازی فەرمی ماددەکانی خوێندن چاکسازی تیدا بکرێت.

## گرنگی سیاسەتی فێربوون (السیاسة التعلیمیة).

وتمان سیاسەتی فێرکردن گرنگترین بنەمای سەرەکی فێرکردنە، بۆیە گرنگی تایبەتی خۆی هەیە بە کورتی ئاماژە بە هەندێك خالّ دەکەین:.

١- بۆ گەیشتن بە ئامانجی سەرەکی، نەخشەڕێگاو دامەزراندنی بنەمایەکی ئایدلۆژی بۆ کۆمەلّگا پێویستمان بە سیاسەتی خوێندن هەیە.

٢- فێربوون بووەتە دیارترین روکنی هەستانەوەو شارستانیەت، بۆ گەشەپێدانی ولاّت و خزمەتکردنی بنەما مرۆییەکان پێویستمان بە بەستەرێك هەیە لە نێوان بەهێزبوونی جومگەکانی دەولّەت و فێربوون ئەمەش تەنها بە سیاسەتی فێربوون دەکرێت.

٣- سیاسەتی فێرکردن دووبارە رەکیزەی سەرەکیە بۆ پێگەیاندنی سەرکردەو سیاسی و ڕۆشنبیر و بیرمەند و تەواوی کەسایەتیە بەهێزەکانی نێو کۆمەلّگا.

٤- بۆ نەخشە کێشانی داهاتوو هەروەها پێگەیاندنی نەوەیەکی نویّ لەسەر

بنەمای زانست و زانیاری و ڕۆشنبیریەكی تەواو ، هەروەها گەشەسەندنێكی تەواو بۆ سێكتەرەكانی دەوڵەت و سیستەمی خوێندن ، دەزگا زاستییەكانی خوێندن داڕێژەریەتی.

هەموو پرۆسەیەكی خوێندن پێویستی بە نەخشە ڕێگاو كات و دیاریكردنی زەمەن و ئامانج هەیە، هەروەها دیاریكردنی پرنسیپ و بەها و تەواوی پێویستییەكانی خوێندنی سەركەوتوو، ئەمەشیان دووبارە تەنها بەسیاسەتی خوێندن دەكرێ[(١)].

## شوێنەواری خراپی سیاسەی تەعلیمی عەلمانیەت و داگیركاران (الإستعمار):

ولاّتە داگیركارەكان وەك فەرەنسا و ئینگلتەرا و هۆڵەندا دەورێكی زۆر خراپیان بینی بەرامبەر بە زانست لە جیهانی ئیسلامی، لە ڕێگەی پەیڕەوكردنی سیاسەتی تەعلیمی لەو ولاّتانەی لە لایەن ئەوانەوە داگیركرابوون وەك مصر و جەزائیر و مغریب . جگە لە داگیركاری لە ڕێی سەربازیەوە، گەورەترین داگیركارییان كرد لە ڕووی زانستیەوە بە داخەوە ڕێژەیەكی یەكجار زۆر لە سیاسەتمەدارو زانستخوازو تەنانەت بەشێكی زور لەزانایانی ئاینیش ئاگاداری ئەم ڕاستیە نین، بۆیە لێرەوە بەپێویستی دەزانین چەند شوێنەوارێكی خراپی داگیركاران لەسەر زانست و فێربون باس بكەین:

**١- هەر لەسەرەتا ڕێگایەكی زۆر ترسناكیان گرتەبەر، لە ڕێگەی سیاسەتی تەعلیمی لەسەر دوو بنەمای بنچینەیی.**

---

(١) بڕوانە: مقالة: أهمية السياسة التعليمية في العملية التعليمية، د. على بن عبد الألمعى.

**بنەمای یەکەم:** بێهێزکردنی دەزگاکانی خوێندن و فێربونی ئیسلامی.

**بنەمای دووەم:** ڕەچاوکردن و چاودێریکردنی زانست و فێربوونی سەردەم بەو شێوازەی خزمەت بە داگیرکاری ئەوان بکات.

## ٢- ڕەخساندنی ژینگەیەکی گونجاو بۆ لاڕێبوون و گەشەکردنی فکری لار (منحرف).

داگیرکاران ژینگەیەکی زانستی لادەریان ڕەخساند، ئەم ژینگەیە وای کرد ڕێڕەوی فکری لارو لەنگ کارا بکرێت و کاریگەری لەسەر ئومەی ئیسلامی دروست بکات، لە کاتی داگیرکاری بەریتانیا فکرەو نەزەریەی داروینیان بلاوکردەوەو خستیانە نێو دەزگاکانی خوێندن وەك انور جوندی دەڵێت (وقد أشارت بعض مصادر التغرس إلى أن الاستعمار والغزو الثقافي قد استغل نظرية داروين لخلق تيار المادية التي برزت فيه من بعد و ممثلة في نظريات لورانس و فرويد و دوركاريم و ماركس)[1].

"واتە: هەندێك لە سەرچاوە ڕۆژئاواییەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کە ئیستیعمارو غەزوەی فکری نەزەریەی داروینیشیان ئیستغلال کردووە بۆبەکار هێنانی تەوژمی مادی، کە لە دووای ئەو سەری هەڵداوە نوێنەری نەزەریاتی لۆرانس و فرۆید و دورکایم و مارکس بووە"

ئەم ژینگەیە بووە نەهامەتی بۆ بوارەکانی فێربوون لە جیهانی ئیسلامی، بەشێك لە نووسەرو کەسایەتی کەوتنە نێو ئەم شەپۆلە لادەرە وەك (تەها حسین) (علی عبدالرازق) بە نووسینی کتابی (الاسلام و اصول الحکم) لە کاتی ڕوخانی خەلافەت هەروەها (**منصور فهمي**) خاوەنی تێزێکی دکتۆرا لە بواری ئافرەت

(١) بڕوانە: موسوعة التبشير والاستشراق والدعوات الهدامة، انور جندی، (٧٢/٥).

بەسەرپەرشتی پیاوێکی یەهوودی بەناوی (لیڤی برول) وە (اسماعیل مظهر) دامەزرێنەری گۆڤارێك لە دیارترین گۆڤارەکانی رۆژئاوایی بوو، (محمد حسین هیکل) یش دەوری خراپەی لەسەر فێربوون لەوانی تر کەمتر نەبوو.[١].

ئەم ژینگەیە ئەو کات ڕۆژئاوا دروستی کرد لە ڕووی فکری و سیاسی و فێرکردنەوە بۆیە بووە نەهامەتی بۆ موسڵمانان، دیارە هەر ژینگەیەك موسڵمانان بۆ خۆیان دروستی نەکەن تێیدا زەرەرمەند دەبن سوودو بەرهەمەکانیش بۆ ئەمانە.

## ٣- درووست کردنی دووفاقی (الازدواجیة):

داگیرکاران حاڵەتێکی دووفاقییان دروستکرد لە بوارەکانی فێرکردن و بە عەلمانی کردنی خوێندن و زانست، قەبارەو گرنگی زانستە ئیسلامییەکانیان دەزانی و ئاگاداری بوون زۆر بە وردی دیراسەیان کردبوو ئینجا ژینگەیەکی دووفاقییان لەنێوان زانستی ئیسلامی و زانستی سەردەمی داگیرکاری دروست کرد، وردەوردە زانستی ئیسلامییان لە جیهانی ئیسلامی و دەزگاکانی فێرکردن لاواز کرد و گرنگیان پێ نەدا، لە بەرامبەردا گرنگیەکی زۆریان بە بڵاوکردنەوەی زانستە سەردەمیەکاندا، بەڵام بە فکرو بەرنامەو نەخشەی داگیرکاری.

ئینجا هەنگاویان نا بۆ عەلمەنەکردنی تەواوی مادە و مەنهەجەکان ڕێگایان لە مەنهەج و مادەی زانستی ئیسلامی بەرتەسك کردەوە و ڕێگرییان لێکرد.

ئەم دووفاقی و تێکەڵییە تا ئێستاش لە دەزگاکانی خوێندن کاری پێ دەکرێ و زاڵە بەسەر خوێندنگاکانەوە.

## ٤- قوڵکردنەوەی داڕووخانی دەروونی لە بوارەکانی فێرکردندا

هێزی داگیرکار توانی داڕووخانێکی دەروونی زۆر بەهێز لەنێو مسوڵمانان بڵاو

(١) بڕوانە: تحولات الفكر والسياسية فی الشرق والغرب، د. محمد انصاری (ل ٣٣) .

بکاتەوە وا لە تاکەکان بکات قەناعەتیان پێ بێنێ، کە مسولّمانان ئومەتێکی نەخوێندەوارو ئومیین، ئاراستەی کردن بەرەو شارستانیەتی ڕۆژئاوا لە ڕێی ماددەو مەنهەجی خوێندنەوە، بیرۆکەی ئەوەیان داڕشت کە ئیسلام دژی زانستەو ناتوانێ پێش بکەوێ و داهێنان بکات، بە پێچەوانەوە لە ڕێی ئەم مادانەوە هەرچی زانست و شارستانیەت و پێشکەوتن و داهێنانە دایانە پاڵ یۆنان و ڕۆمان و ئەفریقی کۆن و ئەوروپای تازە، منالّ هەر لە سەرەتاوە لەسەر ئەم بیرۆکەیە گەورە دەبوو، کە ڕۆژئاوا سەرچاوەی پێشکەوتن و داهێنانە ئیسلامیش نەزانی و پاشکەوتنە.

داگیرکاران توانییان تاکی مسولّمان شارەزا بکەن لە ڕێی دەزگاکانی خوێندن لە شارستانیەت و ڕۆشنبیری و زانستی ڕۆژئاوا هیچ زانست و زانیاریەکی ئەوتۆیان نەبوو لەسەر ڕۆشنبیری و شارستانیەت و ئادابی ئیسلامی جگە لەوەش کتێب و نوسراوی ئیسلامییان قەدەغە کرد.

ئەم حاڵەتە سەرەتا لە ولاّتی مصر زۆر بە بەهێزی کاری لەسەر کرا تا وای لێهات دایك و باوکی مسولّمانان قوتابخانەیەك نەبوو منالّەکانیان بنێرن بۆ بەر خوێندن مادەو مەنهەجەکانی دژی ئیسلام و مسولّمانان نەبێ، بەڕای بەندە ئەم جۆرە هەڵسوکەوت و پیلانانە دژی مەنهەجی ئیسلامی لە ئێستادا لاواز بووە، بەلاّم هەرێمی کوردستان چونکە لە تەواوی بوارەکانی تریش لە دواوەیە سەرقاڵی ئەوەیە لە خوێندنگاکانی هەرێم ئەم جۆرە هەنگاوانە بهاوێ بۆ ئەوەی ڕۆژئاوا ڕازی بکات و هۆشیاری تاکی مسولّمان لاواز بکات و درێژە بە حوکمی بنەماڵەو جەهل و نەزانی بدات, بەندە قسەیەکی هەیە دەڵێم: (لە هەر شوێنێك زانست و زانیاری و پێشکەوتن هەبێ ئیسلام تێیدا بەهێزە، لەهەر شوێنێك زانست و زانیاری و پێشکەوتن لە دواوە بێت مسولّمانان تێیدا لاوازن) دەکرێت ئەم پێوەرە بە چاوی ڕۆژئاوا سەیر بکەین ئێستا لە ڕۆژئاوا دەسەلاّت و دەولّەتداری هەمووی عەلمانییە

کەچی ڕۆژ بە ڕۆژ ڕێژەی مسوڵمانان و مزگەوت لە زیاد بوون و گەشەسەندن دایـە، بەلاّم لە جیهانی ئیسلامی لەگەڵ ئەوەی خەڵکەکە موسڵمانە کەچی ڕۆژ بە ڕۆژ لـە لاوازی و پاشەکشـەدایە. ئەمـەش بـۆ ئـەوە دەگەڕێتـەوە ئیسـلام دینـی زانسـت و زانیاری و فیترەت و لۆژیك و پێشکەوتنە.

## ٥- دەزگاکانی فێربوون بوونە سەرچاوەی بەرهـەمهێنانی پیـاوانی تەوژمی ڕۆژئاوایی (التيارات الغربية):

ئەگـەر ئاوڕێـك لـە تەوژمـە ڕۆژئاوایـەکان بدەینـەوە بـە هـەموو جـۆرو نـاوە جیاوازیەکانـەوە دەبینـی لـەم دەزگـا زانسـتیانە پـەروەردە بـووە کـە داگیرکـار (الاستعمار) بەڕێوەیان بردووە، ئەم دەزگایانە لەم سەردەمەدا شارەزاو زانای بواری بیرکاری و هەندەسەو کیمیاو فیزیاو جیۆلۆجی و تەقـەنی پـەروەردە نـەکرد بـەڵکوو ئەم پیاوانەی بەرهەم هێنا، کە هەڵگری فکری ڕۆژئاوایی و تـەوژم و ڕەوت و بـیری غەربی بوون، دواتر لە جیهانی ئیسلامی بوونە سەرکردەو سەرۆك و خاوەن دەزگـاو زانکۆی زانستی.

## ٦- کردنەوەی دەزگای تایبەت بۆ تیۆرە کۆمەڵایەتییەکان (النظريات الاجتماعية):

جیهانی ڕۆژئاوا زیاتر لە چوار چەرخ سەرقاڵی نەزەریاتی کۆمەڵایـەتی و فکـری بوو، بـەلاّم بـەکاتێکی زۆر کـەم جیهـانی ئیسـلامی خسـتە دوودڵـی و حاڵـەتێکی سایکۆلۆژی، بە بڵاوکردنەوەی نەزەریاتی کۆمەڵایەتی لە کاتێکدا نەزەریەی داروین هێشتا گەرماوگەرم بوو ئەمەشـیان لـە ڕێـی دەزگاکـانی فێربـوون و ڕاگەیانـدن و ڕۆژنامەوانی خستە گۆڕەپانەوە بە تایبەتی ئەم بابەتە کۆمەڵایەتیانـە مەجالەکـەی فراواترەو تەمومژاویە، نەزەریە کۆمەڵایەتییەکان بە هاوکاری نـەزەریاتی داروینـی بەهێزو گڕوتینێکی زۆرەوە هێنایانە نێو جیهانی ئیسلامی، دەرگای بەڕووی زانستە

جیاوازەکانی کۆمەلآیەتی و دەروونی و مێژوو زمان و یاساو ئابووری و سیاسی و ئەوانی تردا کردەوە، خوێندنی بالاّ لە جیهانی ئیسلامی بوو بە بەشێك لە زانکۆکانی ئەوروپاو غەرب. دەرگای زانستی داخست و دەرگای گفتوگۆی بێ ئەنجام و نەزەریاتی بێ بنەمای کردەوە بەم شێوازەی خزمەتی ئیمپریالزم بکات.

دیارە ڕۆژئاوا خاوەنی سەدان زانکۆو خوێندنگای بەهێزە لە دیارترین زانستە سەردەمی و مرۆییەکان بەلاّم "استعمار" ڕێی لە تەواوی زانستی بەسوود گرت بێتە جیهانی ئیسلامی تەنها ئەمانە نەبێ کە گرفتی فکری و کۆمەلآیەتی بۆ موسلّمانان درووست دەکەن [1].

## دەیەم: نەبوونی ئامانج و ڕۆئیای دیار.

بەشێکی زور لەخوێندنگا و زانکۆ و حوجرەکانی مزگەوت و کولێژەکانی زانستی شەرعی ئامانج و روانینی دیاریان نییە ، بۆچی بینا کراون ؟ زانستخواز بەرەو کێ دەبەن؟ بوچی دامەزراون؟ ئامانجیان چیە؟ کوتاییان بەرەو کێیە؟ کاتێك زانکۆ و دەزگاکانی زانستیمان نەزانن ئامانجیان چیە زۆر بەسروشتی زانستخوازیش ئەگەر ئامانجێکی دیاریکراویشی هەبێ لەسەرەتا، لەدواییدا لەنێو ئاپوڕای بێ ئامانجەکان ئامانجی خۆی بزر دەکات، هەموو زانکۆ و خویندنگا و دەزگایەك کەدادەمەزرێ بۆ ئامانج و مەبەستێکی تایبەت دادەمەزرێت بەتایبەتی خوێندن، کە بنەماو بنچینەی هەستانەوە و پیشکەوتن و شارستانیەتی میللەتان و دەوڵەتە، بەتایبەتی خوێندنگاکان لەجیهانی ئەوروپی، بەپێچەوانەوە کارەساتی جیهانی ئیسلامی، دوای شەپۆلی غەزوی فکری لەلایەن ئەوروپاوە هەرچی ئامانج و

(١) بڕوانە: موسوعة الجنة (٢٩١/٩).

مەبەستیش هەبوو لەدەستمان دا ، زانستخواز زانکۆ تەواو دەکات نازانی بۆچی خوێندوە ؟ خزمەت بەکێ بکات؟ کام دەوڵەت و نیشتیمان و کومەڵگا بەرەو پیش ببات، روحی خزمەتکردنی ئایین و نیشتیمان و مروۆ و خاك و ژینگەی لەناخ دا نیە! فێر نەبووە، کە ئامانج لەزانست، خزمەتکردنی مروۆ و ژیان و بونەوەرە، هەستانەوەو ڕۆشنبیری و شارستانیەت و بیناسازی و ئاوەدانکردنەوەیە، نەبوونی ئەم ڕوانین و ئامانجە گەورەو فراوانانە وای کردوە دەزگاکانی زانستی بەلاوازی بمێننەوە و نەتوانن خزمەت بەدین و ژینی میللەت بکەن.

## یازدەهەم: غیابی فکری ئیسلامی لە مەنهەجەکانی خوێندن:

لەم سەد ساڵەی دوایی مەنهەجی خوێندن دابڕانێکی کاتی بەخۆیەوە بینی لەگەڵ فکری ئیسلامی، ئەمەش بووە یەکێك لەدیاترین خاڵە لاوازەکانی مەنهەجی خوێندن لەجیهانی ئیسلامی، هەروەها بۆشایەکی زۆر پەیدا بوو لەنێوان زانست و کردەوە، مەنهەجی خوێندن بەهۆی دابڕانی لەگەڵ فکری ئیسلامی واتا ڕوح و پەیامی ئیسلامی! وای کرد هەرخوێندکارێك کەزانست تەواو دەکات وەك پیشە تەماشای بڕوانامە و زانستەکەی بکات، نەك وەك پەیام، بەو هۆیەوە چەندان زانای گەورە بەتایبەتی لە کوردستان جیاوازییان لەنێوان فکری عەلمانی و ئیسلامی نەکردووە، کاریگەرییان لە ڕووی فێرکردن و گوتنەوەی زانستەکانەوە زۆر بووە، بەلاّم لەڕووی خزمەتکردن بە روحی پەیامی ئیسلامی و پرنسیپی و فیکری و سیاسیە و حوکمەوە زۆر کەم بووە ، ئەم هۆکارە زۆر جار بووەتە هۆی ئەوەی نەوەکانی خۆیان تەواوی زانستە شەرعیەکانیان خوێندوە، بەلاّم هەڵگری فکری عەلمانی بوون، مامۆستای گەورە و زانای پایەبەرز بووە لەڕووی زانستەوە بەڵام کوڕەکانی کاراکتەرێکی گەورەی بلاّوکردنەوەی فکری عەلمانی و جاری واش هەیە

ئیلحادی بوونە، هۆکارەکەی نەبونی پەیوەندی نێوان مەنهەجی خوێندن و فکری ئیسلامی بووە، هەروەها بابەتی نەبوونی پەیوەندی نێوان زانست و کردەوە زۆر لاواز بووە لە مەنهەجی خوێندن، واتە نەتواندراوە زانستخواز ڕابهێندرێت لەسەر جێبەجێکردنی زانستەکەی بەرێگەی کرداری، بۆیە خوای گەورە ڕوو لە ئیمان داران دەکات دەفەرموێت :﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ﴾[1]. واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! بۆچی شتێ دەڵێن و ڕەفتاری پێناکەن؟ خوا لە لای سەختە، کە شتێ بڵێن و کاری پێنەکەن ).

زانستخواز دەبێ زانست و کردار بەیەکەوە ببەستێتەوە، هەروەها دین و ژین بەیەکەوە پەیڕەو بکات لە یەك کاتدا، مەنهەجی خوێندن لە لای موسڵمانان دەبێ دین و ژین بەیەکەوە گرێ بدات و ژیانی پێ ئاوەدان بکاتەوە، ﴿ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱسۡتَعۡمَرَكُمۡ فِيهَا ﴾[2]. واتە: (چونکە هەر ئەوە لەم زەوییە ئێوەی بەرپاکرد و بەدیهێنان و کردنیشی بەئاوەدانکەرەوەی زەوی).

ئەمە گەورەترین چالاکی مرۆڤەکانە لەسەر زەوی, مەنهەجی خۆیندن تا وەکو گشتگیر بێ دین و ژین، زانست وکردار، مەنهەج و فکری ئیسلامی بەیەکەوە پەیڕەو بکات زانستخواز دەباتە قۆناغی سەرکردە و خاوەن مەبدە و ڕاستەڕێ بوون، بنەمای ئەمانەش ئیمانە، زانست بە بێ ئیمان یان ئیمانی بێ زانست، یان زانست و ئیمانی بە بێ کردار، هەموویان ناتەواون، زانست لە عەقڵەوەیە و ئیمانیش لە دڵەوەیە، کرداریش دەست و پەیوەندیەکانن، هەرسێکیان ڕێنوێنی و هیدایەت و ڕێگای ڕاست بەرهەم دێنن.

---

(١) سوڕەتی الصف ئایەتی ٢-٣ .
(٢) سوڕەتی هود ئایەتی ٦١ .

بێگومان خاڵی تر زۆرن لەسەر لاوازی دەزگاکانی خویندن لەجیهانی ئیسلامی، بەلاّم بەم (١١) خاڵە دەست هەڵدەگرین تا لەسەر خوێنەرو خاوەن فکری هەستانەوە قورس نەبێ و کار بۆ جێبەجێکردن و بەهێزکردنیان بکات.

## پێناسەی فکری ئیسلامی

وتمان بەکارهێنانی چەمکی فکری ئیسلامی تاڕادەیەك تازەیە بۆیە پێناسەیەکی دیاریکراو و تایبەتی نییە، بۆ پێناسەی وردی ئەم چەمکە پێویستمان بە پێناسەی وشەی فکرە .

### پێناسەی (فکر).

لە (لسان العرب)**دا** (فکر) (اعمال الخاطر فی شيء) لێکدراوەتەوە. واتە کردەیەکی خورپەییە لە شتێکەوە[1] .

لە (مقاييس اللغة)دا (فکر) (تردُّد القلب فی شیئ) لێکدراوەتەوە. واتە دوودڵ بوون و ڕامان لە شتێك[2] .

دیارە لە قورئاندا گرنگییەکی تایبەت بە فکر دراوە و لە (٢٠) شوێندا باسی فکر هاتووە، بەلاّم بە شێوەی خەسڵەتی (هاوەڵکار)ی کار (الفعل) هاتووە بە سیفەی ناو و چاوگ نەهاتووە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ﴾[3]، واتە: (بە ڕاستی ئەو بیری کردەوە و پەیامەکەی هەڵسەنگاند).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ أَفَلَا

(١) بڕوانە: لسان العرب (٥/ ٦٥).
(٢) بڕوانە: مقاييس اللغة لابن فارس (٤ / ٤٤٦) .
(٣) سورەتی المدثر ئایەتی ١٨ .

﴿تَتَفَكَّرُونَ﴾[١]، واتە: (ئەی محمد (ﷺ) پێیان بڵـێ:: ئایا کـوێر و چاوساغ وەك یەکن؟ ئایا بۆ بیرناکەنەوە و تێنافکرن لەو ڕاستیانە).

هـەروەها دەفـەرمووێت: ﴿فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ﴾[٢]. واتـە: ( کەوابوو ئەم جۆرە بەسەر هاتانە بگێڕەرەوە بۆ ئەوەی (دایچڵەکێن و) بیر بکەنەوە.

## پێناسەی فکر لە ڕووی بەکار هێنانیەوە.

لە (مفردات الفاظ القران) دا دەڵێت (الفكر قوة مطرقة للعلم الى معلوم وجولان تلك القوة بحسب نظر العقل، وذلك للانسان دون الحيوان، ولا يمكن ان يقال الا فيها يمكن ان يحصل لـه صـورة فـی القلـب) [٣]. واتـە: (هێزێکـی لیێـدەری زانسـتیە بـۆ زانراوێك، لەگەڵ خۆهێنانی ئەم هێزەش بە گوێرەی تێروانینی عەقڵـە، تایبەتـە بـە مرۆڤ نەك گیاندار، ناگونجێ بگوترێ تەنیا کاتێك دەبێت کە وێنەیەك لە دڵـدا جـێ گیربووبێت).

## سەردەمیەکان بەم شێوەیە پێناسە یان کردووە.

(شێخ دکتۆر تەها جابر ئەلعەلوانی) دەڵێت: (الفكـر اسـم لعمليـة تـردد القـوى العاقلة المفكرة في الانسان، سواء أكان قلبا أو روحا أو ذهنا بالنظر والتدبر، لطلب المعـاني المجهولـة مـن الأمـور المعلومـة، أو الوصـول إلى الأحكـام أو النسـب بـين الأشـياء). واتـە: ناوێکـە بـۆ کردەیـەکی ڕامـانی بـەهێزی عـەقڵی و یـادەوەری و بیرنامەیە لە مرۆڤدا، ئینجـا ئـەم جوڵەیـە جوڵـەی دڵ بـێ یـان ڕۆح یـان مێشـك، ئەمــەش بــە وردبوونــەوە و تێڕامــان بــۆ بەدەســتهێنانی واتــای نادیــار لــە شــتە

---

(١) سورەتی الأنعام ئایەتی ٥٠ .
(٢) سورەتی الأعراف ئایەتی ١٧٦ .
(٣) بڕوانە: مفردات الفاظ القران , راغب الاصفهانی (٣٨٤/١) .

زانراوەکان، یـان گەیشـتن بـۆ زانینـی ئـەحکامێك ، یـان دیاریـکردنی ڕەچـەڵەکی شتەکان[١] .

## پێناسەی فکری ئیسلامی وەک یەک چەمک.

چـۆن پێناسـەی (فکـر) لـە زاراوە و چـەمك و بەکارهێنانـدا جیـابوو، چـەندین پێناسەی هەبوو بەهـەمان شـێوە پێناسـەی فکـری ئیسـلامیش چـەندین پێناسـەی هەیە. بەشێکیان باس دەکەین.

١. (دکتۆر موحسین عەبدولحەمید) دەڵێت: (الفکـر الإسـلامي یعـني: کـلّ مـا أنتجه فِکْـر المسـلمین منـذ مبعـث الرّسـول (ﷺ) إلى اليـوم في المعـارف الکونیّـة المتصلة بالله - سبحانه وتعالى - والعالم والإنسـان ، والّـذي یعبّـر عـن اجتهـادات العقْل الإنساني لتفسیر تلك المعـارف العامّـة في إطـار المبـادئ الإسـلامیّة، عقیـدة وشریعة وسلوکاً)[٢]، واته: (هەموو بەرهەمە وەدەستهاتووەکانی فکری موسڵمانانە لـە کـاتی هـاتنی پێغەمبـەر (ﷺ) تـا ئـەمڕۆ، لـەو زانیاریانـەی بونـەوەر کـە پەیوەنـدییان بـە خـوای گـەورە و زانسـت و مرۆڤـەوە هەیـە هـەروەها ئەوانـەش دەگرێتەوە، کە مرۆڤـ تێدا (ئیجتیهاد) دەکات بەعەقڵ بۆ تەفسیرکردنی زانیارییە گشتییەکان لە بازنەی (مەبادئە) ئیسلامیەکان، لە بوارەکانی (عەقیدە و شـەرع و سلوك) .

(فقه و زانستی قورئان و زانسـتی فـەرموودە و تەفسـیر و عەقیـدە) و تـەواوی زانستەکانی تریش بە فکری ئیسلامی دەژمێردرێت.

٢. (مستەفا حلمی) دەڵێت: الفکر الإسلامي یعني: (نتاج الفکْر الّـذي تصـدّی

---

(١) بڕوانە: الازمة الفکریة المعاصره، د. گه جابر العلوانی.

(٢) بڕوانە: تجدید الفکر الاسلامی، د. محسن عبدالحمید.

للفلْسفات والنّظريّات الغربيّة، ناقدًا لها وواضعًا البديل الإسلامي محلّها)، واتە: (ئەم بەرهەمی فکریەیە کە بەرهەڵستی فەلسەفە و تیۆرەکانی ڕۆژئاوا دەکات و ڕەخنەیان لێ دەگرێت و جێگرەوەی ئیسلامی لە شوێنەکانیان دادەنێن[١].

٣. (موحەممەد حوسێن عەبدوڵلا) دەڵێت: الفكر الإسلامي يعني: (الحكم على الواقع من وجهة نظر الإسلام)[٢]. واتە: (بڕیار و حوکم دانە لەسەر ڕووداوەکانی سەردەم بە پێی تێڕوانینی ئیسلام).

ئەمانە چەند پێناسەیەك بوون هەڵمانبژارد، بەتێڕوانین لەم پێناسانە چەند تێبینیەکمان بۆ دەردەکەوێت. لەوانە:

١. مەبەست لە (فکر) دەکرێ بڵێین ئەو پەی پێبردنەیە کە مرۆڤ لە ڕێی بەکارهێنانی عەقڵەوە بەدەستی دێنێ، ئەو کات کەواتە (فکر) وەك (ئالەت و ئامرازێك) بەکاردێت بۆ پرۆسەی بیرکردنەوە.

٢. یان ئەوەتا (فکر) بەرهەمی ئەو پێشهات و تێڕوانینیانەیە بۆ بابەتە پێشنیارکراوەکان دەکرێت، دوای بازنەی بیرکردنەوەکە فراوان دەبێت ، یان بەر تەسك دەبێتەوە ، بەگوێرەی پێناسەکانی فکری ئیسلامی، ئەگەر پێناسەکە بەرتەسك بکرێتەوە ئەوا بازنەی بیرکردنەوەکەش بەرتەسك دەبێتەوە و گۆشەگیر دەکرێت تەنها لە تێڕوانینی عەقڵی ئەوکات فکر دەدرێتە پاڵ مەزهەبێك یان تائیفەیەك یان سەردەم و یان بازنەیەکی تایبەت.

٣. لەکاتێك کە فکر دەدرێتە پاڵ وشەی ئیسلامی ئەوکات یان مەبەست پێ بیرکردنەوەی عەقڵی مرۆڤە لەژێر ڕۆشنایی ئیسلام، بۆیە هەندێك لە بیرمەندانی ئیسلامی پێناسەیان کردووە، دەڵێن ئەم پرۆگرام و بەرنامەیە، کە موسڵمانان بیری

(١) بڕوانە: الفكر الاسلامى فى مواجهة الغز و الثقافى، مصطفى حلمي.
(٢) بڕوانە: دراسات فى الفكر الاسلامى، ابو اليزيد أبو زيد العجمي.

لێ دەکەنەوە یان پێویست دەکات بۆ داهاتوو بەرنامەی بۆ دابڕێژن[١].

٤. بەم پێوەرە کردەیەکی هزرییە بۆ گواستنەوەی زانیارییەکان لە نادیار و نەزانراوی بۆ زانست و زانیاری، زانا پێشینەکانیش ئەم واتایەیان بەکارهێناوە، وەك (ئیبن سینا) و (ڕازی) و (ئیبن خەلدون) و (جرجانی) کۆیان کردووەتەوە لە پێناسەیەك دەڵێن (الفكر ترْتيب أمور معلومة لتـؤدّي إلى مجهـول)، واتە: (فکر ڕێکخستنی کاروبارە زانراوەکان بۆ سەرکێشانی پەنهانەکان یان نادیار) ئەم پێناسەیە فکر و مەنهەج بەیەکەوە دەبەستێتەوە.

٥. یان ئەوەتا مەبەست پاڵ دانە فکر بۆ لای ئیسلامی: ئەو بیر و هزرەیە کە موسڵمانان لە ژێر ڕۆشنایی ئیسلام بەرهەمیان هێناوە، دوای ئەو دەرهاویشتە و ئامانجەکانی جیاواز دەبن بەپێی دیاریکردنی پێناسەکەی، هەندێکیان کە دەڵێن فکری ئیسلامی مەبەستیان بەرهەمی بیر و هزری زانایانی ئومەتی ئیسلامی و لێکۆڵینەوەکانیان بە پێوەر و بنەماو مەرجەکانیەوە، ئەمەش ناچێتە بازنەی بێ هەڵەبوون (العصمة)، هەروەها (وەحی)یش داخڵی فکری ئیسلامی نابێت، واتە (کتاب و سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ). بەم پێیە ئەوانە جیاوازی دەکەن لەنێوان ئیسلام و فکری ئیسلامی، خۆشیان دەپارێزن لە تێکەڵکردنیان.

تێبینی: ئەم جۆرە پێناسەیە ڕەخنەی لێگیراوە چونکە هەندێك لە ڕۆژهەلاتناسەکانیش ئەم جۆرە پێناسەیان هەیە بەم فراوانیە بە مەرج و بنەمای شەرعی، چونکە فکری ئیسلامی لەسەر ئیسلام هەژمارناکرێ ناکرێت تەنها دەبێت (هەماهەنگ) بێت لەگەڵ قورئان و سونەتی پێغەمبەر (ﷺ). کەواتە بەم پێیە فکری ئیسلامی کە کردەی بیر و هزری تاکی زانا و بیرمەندی ئیسلامیە، ئەگەر هەڵێنجراوی قورئان و سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) بوو هەروەها تێك نەدەگیرا لەگەڵ

---

(١) بڕوانە: دور حرية الراي فى الوحدة الفكرية بين المسلمين ، عبدالمجيد المختار (ل ٢٩) .

ئەخلاقیات و سلووك و بنەما سەرەكیەكانی ئیسلام، ئینجا شارستانیەت بێ یان فەرهەنگ و كلتور ، یان زانستە سەردەمیەكان بێت ، مادام بیر و هزری موسڵمانان دایان هێناوە و لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سونەتی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوا ڕاست و دروست و تەندروستە.

## لە كۆتایی پێناسەكان:

(فكری) ئیسلامی لەم سەردەمەدا دەكرێ جگە لەم پێناسانە، پێناسەی تریشی بۆ بكرێ، چونكە ئێستا لە جیهانی ئیسلامی لەبەرامبەر فكری ئیسلامی، فكری عەلمانی بەهەموو جۆرەكانیەوە وەك لیبراڵی و سەرمایەداری و ئیشتراكی هتد...، پیادە دەكرێت.

كاتێك ناسنامەی تاكێكی عەلمانی دیاری دەكەی دەڵێی هەڵگری فكری سەرمایەدارییە، یان لیبرالیە، یان ئیشتراكیە یان سۆشیال دیموكراتە، ڕاستە فكری ئیسلامی وەك لەپێشدا پێناسەمان كرد بەروبووم و بەرهەمی بیروهزری موسڵمانانە، بەڵام ئێستا بەڕای من دەكرێ بڵێین فكری ئیسلامی پێناسەی دووەمیش هەڵدەگرێ ئەویش (شوناسی ئەو كەسەیە كە هەڵگری بنەما و بیر و بەرنامە و ڕەوشت و و سلوكی ئیسلامە و بڕوای پێیەتی و كاری پێدەكات و بانگەشەی بۆ دەكات).

## پەیوەندی نێوان مەنهەجی خوێندن و فکری ئیسلامی

ئەگەر فکر پەیوەست بێ بە عەقڵ عەقڵیش کاریگەری لەسەر دڵە، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا ﴾[1]. واتە: (ئاخۆ هێشتا ئەوانە بەزەوییدا نەگەڕاون؟ تا ببنە خاوەن دڵانو و ڕاستییەکانی پێ دەرك بکەن).

ئەم دڵە ڕووناکی زانست و ئیمان هەڵدەگرێ بۆ ئەوەی ئاستی فکری بەرز بکاتەوە لەوێشەوە فکری ئیسلامی کردەوەی چاك بەرهەم بێنێ بە شێوازێك ڕەنگدانەوەی زانست و ئیمانی بێ لە ناخی کەسەکەوە لەژێر ڕۆشنایی عەقڵ و دەروون و دەست و پەیوەندیەکانی بێت.

ئەمە پێناسەیەکی ژوورەوەی تاکەکانە بۆ فکری ئیسلامی بێ گومان ئەمە دەبێ لەگەڵ ژینگەی دەرەوەی یان بڵێین واقعی کرداری تێکەڵ بکرێت سەرچاوە بکرێ لە بازنە گەورەکە کە ئیسلامە (دین و ژینە) عاملی سەرەکی ئومەی ئیسلامیە.

جیاکردنەوەی دین لە ژین، یان جیاکردنەوەی مەنهەجی زانستی لە دین، یان جیاکردنەوەی ئەصل لەگەڵ سەردەم، گشتیان هەڵەن و لە چوارچێوەی تەواوی خۆی دەردەچێت، ئەگەر ئەمە ناوەڕۆکی فکری ئیسلامی بێت، بە هەموو جۆرێك جیا بکرێتەوە لە مەنهەجی زانست و خوێندن لارو لوێر دەبێ ، بەم پێیە دەتوانین بڵێین فکری ئیسلامی کردەوەی چاکی مرۆڤەکانە لە ناخی خۆیانەوە سەرچاوەی گرتووە، لە زانست و ئیمان و دڵ و عەقڵی ئیماندار ڕەنگی داوەتەوە لە جیهانی دەرەوە، لە چوارچێوەی بازنەی فراوانی ئیسلام خزمەت بە مرۆڤایەتی دەکات لە ژێر دروشمی:

---

(١) سوڕەتی الحج ئایەتی ٤٦ .

﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ ﴾ (١). واتە: (دیسان بڵێ: بە ڕاستی نوێژ و حەج و قوربانی و ژیان و مردنم گشت هەر بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکانە کە هیچ هاوەڵێکی بۆ نییە هەر بەوەش فەرمانم پێدراوە، دەبێ هەربۆخوا بژییم وبمرم دیارە کەیەکەم کەسیشم لەڕیزی موسڵمانانی ئەم ئوممەتەدا).

دەبێ ڕوونی بکەینەوە کە خودای گەورە فەرمانی کردووە بە دوای مەنهەجەکەی بکەوین لە هەموو شتێك، ئەوەی هەڵگری مەنهەج و فکری ئیسلامی تەندروست بێت گونجاوە بۆ سەرکردایەتیکردن و پێشەنگی میللەتان، لەسەرمانە فکرێکی گونجاو لەگەڵ سەردەم لە چوارچێوەی ئەصالەت و مەنهەجیەتێکی زانستی بەرپا بکەین، سەرکردایەتی مروڤایەتی بکات لە چوارچێوەی ڕیسالەی جیهانی محمد (ﷺ) لەم بارەیەشەوە خودای گەورە بەڵێنی چەسپاوی پێداوین: ﴿ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ (٢).

واتە : (خوای میهرەبان جۆرێکی تر لەپاداشی موسڵمانە ملکەچەکان باس ئەکات و ئەفەرمووێ: بێگومان خوا بەو کەسانەتان کە بڕوایان هێناوەو کارە چاك

---

(١) سورەتی الأنعام ئایەتی ١٦٢ – ١٦٣ .
(٢) سورەتی النور ئایەتی ٥٥ – ٥٧ .

و جوانەکانیان ئەنجامداوە، بەڵێنی دا: لەم زەمینەدا بیانکا بە جێنشین و، کلیلی دەسەڵاتداری دونیایان تەسلیم بکا ، واتە: بیانکات بە خەلیفەی ڕووی زەویی هەروەك چۆن موسڵمانانی پێش ئەوانی کردە جێنشین. سەرپەرەشتی کارو فەرمانی خەڵکی بکەن، ئەوا ئیش وکاری مەردوم بەچاکی دەڕوا. ئەودین و ئایینەش خوا خۆی بۆی پەسەند کردوون، ریشەدارو سەقامگیر و دامەزراو دەکا بۆیان وە ترس و بیمەکەشیان بۆ دەگورێ بە ئارامی و ئاسوودەیی ئیتر ئەو کاتە تەنها من بپەرستن و هیچ شتێکش نەکەنە هاوبەشم ئەوسا هەرکەسێکیش - پاش ئەوە-کافر بوو، واتە: پاش هاتنە دی بەڵێنەکە ئا ئەوانەن فاسیق و دەرچوو لە سنووری شەرع (ئەی ئیمانداران!) نوێژی کامڵ بکەن و، بەشێك لە دارایيتان بەناوی زەکاتەوە بدەن وەلە پەیامبەریش (ﷺ) فەمانبەرداریی و گویرایەڵی بکەن تابەشکو بەر رەحمەت و بەر سۆزی خوا بکەون).

## مەرجەکانی چەسپاوی لەم ئایەتانە:

١- خودای گەورە پەیمانی داوە.

٢- مەرجی یەکەم لە چەسپاوی ئیمان هینانە واتە بەبی ئیمان چەسپین نایەتە دی.

٣- مەرجی دووەم کردەوەی چاکە بەمانا فراوانەکەی واتا هەمو بەش و کردەوە چاکەکانی ژیان بگریتەوە.

٤- ئینجا دەیانکاتە جێنشیینی خۆی لەسەر زەوی.

٥- ئەو دینەیان بۆ چەسپین دەکات کەپێی رازین.

٦- هەمو ترس و توقاندنیکیان لەسەر لادەبات و بویان دەگۆڕێ بە ئەمن و تەناهی و ئارامی.

٧- ئینجا دوای چەسپین دەبی خودا بپەرستن و هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەن.

٨- ئەوەی هەلگەڕێتەوە لەبازنەی فاسق بوون دەژمێردرێت.

٩- ئینجا دوای چەسپین نوێژ بەرپا بکەن .

١٠-زەکات بدەن.

١١-گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پێغەمبەر بکەن.

١٢-ئەگەر ئەمانەتان کرد، خودا دەتان خاتە نێو رەحم و بەزەیی خۆی.

کەواتە چەسپینێك تەواوی بوارەکانی سیاسی، ئابووری، فەرهەنگی، فکری، کشتوکالی، پیشەسازی، بگرێتەوە، ئەمەشیان تەنها لە چوارچێوەی تێگەیشتنێکی قووڵ و فەهمێکی فراوان و بنەڕەتی دەبێت بۆ فکری ئیسلامی، تا ولآت ئاوەدان بکاتەوە و فکرەکان روونتر بکات ئارامی بە دڵ و دەروونەکان ببەخشێت[١] .

## پەیوەندی فکر بە زانست

پێمان سەیر نەبێ فکر ئەوەندە فراوان و هەمەلایەنەیە، پەیوەندی بەهەموو بەشە سەرەکیەکانەوە هەیە ئایین لە تێڕوانینی ئیسلامی لە بنەڕەتدا ئیمان و زانست و کردارە ، باشە فکر لە کوێی ئەم سێ چەمکەدایە؟ لەدرێژەی باسەکەمان کە لەپێشدا باسمان کرد فکر وەك بنەمای سەرەکییە، گوتمان فکر سەرچاوەیە بۆ ئیمان ، ئیمانیش ڕاستەوخۆ پەیوەندی هەیە بەزانست، لەقورئاندا زۆر باسی ژمارە دەکرێت. دەکرێت بڵێین ڕاستە و هەڵەیە، بەڵام زۆرجار ژمارەی هاوشێوە لەنێوان دوو چەمك هەیە، سەرنجت ڕادەکێشی. بۆ نموونە، (٨١١) جار لە قورئاندا باسی وشەی ئیمان و لێوەرگیراوەکانی هاتووە، (٧٨٢) جار باسی زانست و لێوەرگیراوەکانی هاتووە، (٢٩) جار باسی ماریفەت (معرفە) و لێوەرگیراوەکانی

(١) بڕوانە: أسس و موجهات بناء المنهج الجامعي المؤصَّل، محاسن ادريس الهادى.

هاتووە، دەکاتە (٨١١) جار، هاوشێوەی وشەی ئیمان ئەمە بێ حیکمەت نییە دەکرێ بڵێین ئیماندار دەبێ زانا بێت [١].

کەواتە ئیمان و زانست ، تەواوکەری یەکترن ئیمانش بناغەکەی فکرە . پێغەمبەرمان (ﷺ) ئاماژەی پێداوە، دەفەرموێت: (یەزیدی کوڕی عومەیرە) دەفەرموێت: کاتێك (مەعازی کوڕی جەبەل) لەسەرە مەرگ بوو, گوتیان ئەی (باوکی عەبدولرەحمان) ئامۆژگاریمان بکە، فەرمووی دانیشن ئینجا گوتی بەڕاستی زانست و ئیمان تەواوکەری یەکترن، هەرکەس دەستیان پێوەبگرێ بە دەستیان دێنێت، سێجار ئەوەی دوبارەکردەوە (٢).

بەڵام لەبیری نەکەین کام زانست ئەم زانستەی کە قورئان بەشێوەیەکی یەکجار فراوان باسی کردووە، کە (شمولی) زانستی سروشتی و (ماددی و سلوك) و دەروون و کۆمەڵناسی و مرۆیی و بیروباوەڕ و فقه و مامەڵەکردن و ئەندازیاری و پزیشکی و ئاوەدانکردنەوە و - تەواویی زانستەکانی تر دەکات. لەگەڵ ئەوەش زانستی سەرەکی و هەرەبەرز ناسینی خودایە، ڕێی ڕاستەقینەی ئیسلامە، تێگەیشتنی قورئانە، جێبەجێکردنی فەرمایشی پێغەمبەرمانە (ﷺ). خودای گەورە پێغەمبەرانی هەریەك بەشێوازێك فێری جۆرێکی تایبەت لە زانست کردووە لەوانە:

١. پێغەمبەر (یەعقوب) ی (سلاّوی خوای لەسەر بێت)ی فێری کۆمەڵێك زانست کرد. ﴿وَإِنَّهُۥ لَذُو عِلۡمٍ لِّمَا عَلَّمۡنَٰهُ﴾[٣]، واتە (چونکە ئەو خاوەن زانیارییەکی فراوان بوو، لەوەی فێرمان کردبوو).

٢. پێغەمبەر سولەیمانی (سلاّوی خوای لەسەر بێت) فێری زمانی باڵندەکان

---

(١) الاعجاز العددی فی القران الكريم - نوفل عبدالرزاق (ل ٥٦) .

(٢) بڕوانە: المستدرك علی الصحيحين (١ / ١٤٦) .

(٣) سورەتی یوسف ئایەتی ٦٨ .

کـــرد. ﴿وَقَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمۡنَا مَنطِقَ ٱلطَّيۡرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَيۡءٍۖ﴾[(١)]. واتـــە (سولەیمان وتی: خەڵکینـە! ئێمـە فێـری زمـان و دەنـگ و ئـاوازی باڵنـدە کـراویین تێگەیەنراوین و ئەزانین چی ئـەڵێن. لەهـەموو شـتێك لەوانـەی پێویسـتمان پێیـان هەیە- بەشێکمان پێدراوە).

٣. پێغەمبەر داودی (سلاڵوی خوای لەسەر بێت) فێری دروست کردنـی ئالـەتی جـەنگ کــرد. ﴿وَعَلَّمۡنَٰهُ صَنۡعَةَ لَبُوسٖ لَّكُمۡ لِتُحۡصِنَكُم مِّنۢ بَأۡسِكُمۡۖ﴾[(٢)]. واتە: (فێریشمان کرد کە چەندین جۆر پۆشاکی جەنگیی دروست بکـا بۆتـان، خـوا جۆرەها قەڵغان و زرێی نیشاندا کە دروستی بکات بۆ خۆپاراستن لەکاتی جەنگـدا. تا لە زەبری یەکتر لە کاتی جەنگەکاندا بتانپارێزێ ).

٤. پێغەمبەر یوسف (سلاڵوی خـوای لەسـەر بێـت)ی فێـری خـەون لێکدانـەوەی کرد. ﴿ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّيٓۚ﴾[(٣)]، واتە (دیارە ئەوە لە بەهرەی پەروەردگارمـەو ئەو فێری کردووم).

٥. (زووالقـرنین) فێـری کـاری ئەنـدازیاری کـرد. ﴿قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيۡرٞ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجۡعَلۡ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُمۡ رَدۡمًا ءَاتُونِي زُبَرَ ٱلۡحَدِيدِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيۡنَ ٱلصَّدَفَيۡنِ قَالَ ٱنفُخُواْۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارٗا قَالَ ءَاتُونِيٓ أُفۡرِغۡ عَلَيۡهِ قِطۡرٗا﴾[(٤)]، واتە (زولقەرنەین وتی: ئەو زانیاریی ومالْ و سامان و دارایی ودەسەڵاتەی کـە پـەروەردگارم پێیـداوم چاکترە لەوەی ئێوە ئەمدەنێ سامان پێویست نییـە، بـەڵکو ئێـوە بـەهێزی بـازووی

(١) سوڕەتی النمل ئایەتی ١٦ .
(٢) سوڕەتی الانبیاء ئایەتی ٨٠ .
(٣) سوڕەتی یوسف ئایەتی ٣٧ .
(٤) سوڕەتی الکهف ئایەتی ٩٦ .

خۆتان یارمەتیم بدەن ئەوسا لەنێوان ئێوە و ئەواندا بەربەستێکی ئەستوور دروست دەکەم دەسا لەتە ئاسنی گەورەم بۆ بێنن و کەڵەکەی بکەن ئەوانیش ئاسنیان لەسەریەك کەڵەکە کرد تا دیوارێکی دروستکردو ئەم بەرو ئەوبەری کێوەکەی پڕکرد ئەوجا وتی: بەدەوریيدا ئاگر هەڵکەن وخۆشیکەن وبیدەمێنن ئەوانیش کارەکەیان ئەنجامدا تا پارچە ئاسنەکان هەموو بوونە ئاگرو سووربوونەوە ئینجا وتی: ئێستا مسی قاڵ و تواوەم بۆ بێنن با سەریا بیڕێژم، ئەوانیش داواکەیان جێبەجێ کردو، ئەمیش ئاسنەکەی گوشیی و بوو بەیەك پارچەو سەدێکی قایمی دروستکرد ).

٦. پێغەمبەر نوح (سلاوی خوای لەسەر بێت)ی فێری دروستکردنی بەلەم و کەشتی کرد. ﴿وَٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا وَوَحۡيِنَا﴾[1]، واتە: (دەبێ لەبەرچاو خۆمانەوەو بەپێی سروش و فەرمانی خۆمان کەشتیەك دروست بکەیت).

٧. بەرزترین پلەی زانستی بە پێغەمبەر (ﷺ) بەخشی، ئەویش فێری خوێندنەوە و زانست بوو، فەرمووی: ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ﴾[2]، واتە (ئەی محەممەد! (ﷺ) بخوێنە ئەوەی وەحیت بۆ دەکرێ بەناوی ئەو پەروەردگارەتەوە، کە هەمووشتێکی دروستکرد. بخوێنە، پەروەردگاری تۆ لەهەموو کەسێك بەخشندەترەو خاوەن ڕێزێکی بێ سنوورەو هیچ کەسێکی ناگاتێ. ؟! ئەو خوایەی کەبەهۆی قەڵەمەوە ئادەمیی فێری زانست و نووسین کرد ).

(ئیبن قەییم) دەفەرموێت: بەرزترین شت کە مرۆڤ بەدەستی بهێنێ دڵ پێی بگات، بەندە پێی بەرزببێتەوە لە دونیا و دوارۆژ زانست و ئیمانە ، خودای

---

(١) سورەتی هود ئایەتی ٣٧ .

(٢) سورەتی العلق ئایەتی ٥ .

گەورەش بەیەکەوە باسی کردووە. ﴿يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾[١]. واتە (خوا ئەو کەسانەتان باوەڕیان هێناوە بەرز دەکاتەوە، ئەوانەش زانستیان پێدراوە پلە گەلێ بەسەر باوەڕدارەکاندا بەرز دەکاتەوە، چونکە ڕێزو شەرەفمەندی لای خوا تەنها بە باوەڕو زانستەوەیە خواش بەئاگایە بەو کارو کردەوانە ئێوە دەیکەن).

ئەمانە هەڵبژاردە و ناوەرۆك و کاکڵی کۆمەڵگەن [٢]. دیارە زۆر هەڵە دەکەن ئەوانەی دەڵێن بیرکردنەوە و زانست بۆ توێژێکی تایبەتن پەیوەندی بە ئیمانەوە نییە، نێوانی فکر و زانست و ئیمان ناتوانێ دیاری بکەی، چونکە تەواوکەری یەکترن، بەیەکەوە گرێدراون، ئیمانداری بەهێز خاوەن فکر و زانستی بەهێزە[٣].

## یاسای جێبەجێکردنی فکر.

لەم کورتە بابەتە باسی چۆنیەتی جێبەجێکردنی بواری فکری دەکەین، واتا چۆن لە لایەنی نەزەریەوە بگوازرێتەوە بۆ بواری کرداری لە ڕووی فکرەوە، بە واتای ئەوەی لایەنی کرداری مانای ئەوەنیە بچێتە نێو کردار بەبێ فکر بەڵکوو کردار ئەنجام بدەی بەپێی هەنگاوە فکریەکان، بەنمونە ئەصل لە ئیسلامدا وشەی کردار(العمل) هاتووە، نەك وشەی جێبەجێکردن (التطبیق)، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ﴾[٤]. واتە: ( بۆ ئایندەش بە تەئکید خواو پەیامبەری خوا، گشت کردەوەکانتان دەبینن).

(١) سوڕەتی المجادلة ئایەتی ١١ .
(٢) بڕوانە: الفوائد ابن القیم (ل ١٥١) .
(٣) البناء الفکری د. فتحی حسن ملکاوی (ل ٤٨) .
(٤) سوڕەتی التوبە ئایەتی ٩٤ .

کردەوە لە ئیسلامدا لە دڵەوە دەست پێدەکات لە ڕووی زانیاریەوە (المعرفە) نەك کردار و زانست، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (انا اعلمکم باللە ) [١].
واتە: من لە هەمووتان زیاتر بە خودا زانام.

ئەگەر پێچەوانە بووەوە واتا کردار لە دەست و پەیوەندەکان دەستی پێ دەکرد، ئەوە دەبێتە کارێکی ڕووتی کردار بەبێ بەش بوونی دڵ.

کرداری تەواو بەم پێوەرە سەرکەوت و دەبێت لەوە دەست پێ دەکات: عەقڵ+دڵ+دەروون+ڕوح+دەست و پەیوەندەکان [٢].

مەبەستمان لەم پێوەر دانانە بۆ ئەوەی تەواوی ناوەوەو دەرەوەی مرۆڤ، واتا ناخ و دڵ و دەروونی لەگەڵ دەرەوەی بەهاوتاو هاوتەریبی هەر زانست و زانیاریەکان هەیەو دەی بینن جێبەجێی بکەن، ئەمرۆ گرفتی بەشێك لە زانستخوازان و تەنانەت جاری وا هەیە زاناش تووشی گرفتی گوفتارکردنێکی زۆر بووە بەبێ کردار ئەمەیان ڕەنگی داوەتەوە لە نێو کۆمەڵگاو بووەتە خاڵێکی سلبی، ڕاستە ئوصولیەکان بەشێکیان دەڵێن گوفتار پێش کردارە، بەڵام کرداریش ڕەنگ دانەوەی گوفتارە ئیسلام و موسوڵمانەتی بە کردار دەناسرێنەوە لە نێو کۆمەڵگا، جیاوازی موسوڵمانان لەگەڵ تەواوی میلەتانی تر ئەوەیە گفتارو کردار، دونیاو دوارۆژ، ڕوح ولاشە، عاتیفەوعەقڵ، مادی و مەعنەوی، دەرەوەو ژوورەوە. بەیەکەوە دەبەستێتەوە تەواوی دین و ئاینەکانی تر گرنگی بەلایەك دەدەن زۆربەی لایەنەکانی تر پشتگوێ دەخەن.

---

(١) بوخاری گێڕاویەتەوە لە صەحیحەکەیدا: کتاب الإیمان باب قول النبی (ﷺ) أنا أعلمکم باللە). (١٢/١).
(٢) بڕوانە: أسس و موجهات بناء المنهج الجامعی الموصل. أ. محاسن ادریس الهادی (ل ٣٤) .

## پێگەیاندنی زانستخوازان

هەوڵ و ماندووبوونی زانستخواز بە تەنها بەس نیە بۆ ئەوەی کەسێکی سەرکەوتوو زانایەکی خۆڕاگر و کۆڵنەدەری لێ دەربچێت، لەبەر ئەوەی هەڵگری زانست ڕێگاکەی دورو درێژو هەورازو نشێوو ئازارو ناخۆشی زۆری تێدایە، ڕێگای پێگەیاندنیشی ئاسان نییە، بۆیە پێویستی بە هەوڵ و کۆششی هەمەلایەنە هەیە تا بە قۆناغەکان دا سەرکەوێ، بۆ ئەم مەبەستە چەن پاڵنەرێکی زانستخوازان باس دەکەین، کە دەبنە هۆی سەرەکی بۆ پێگەیاندنی زانستخواز لەوانە:

## یەکەم: پاڵپشتی خێزانی بۆ زانستخوازان.

خێزان یەکەم قوتابخانەیە بۆ پێگەیاندنی هەموو تاکێك بە تایبەتی تاکی زانستخواز دایك و باوك ئەم دوو چەترە بەهێزەن بۆ ئەوەی کەڵە پیاوی زانستی بەرهەم بهێنن : ﴿ وَٱلْبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَٱلَّذِى خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا ۚ ﴾ (١). واتە: (وڵاتی بەپیت و چاك دار و درەخت و ڕوەکی تێدا دەڕوێت بە فەرمانی پەروەردگاری, ئەوەشی کە زۆنگ و پیس بێت تەنها شتی بێ سوود و بێکەڵکی لێ بەرهەم دێت).

بێگومان ئامۆژگاری و پشتگیری دایك و باوك بنەمای زانستی بۆ قوتابی دروست دەکات، ابراهیمی کوری ئەدهەم دەفەرمووێ باوکم پێی وتم (يَقُولُ : قَالَ لِي أَبِي : " يَا بُنَيَّ ، اطْلُبِ الْحَدِيثَ ، فَكُلَّمَا سَمِعْتَ حَدِيثًا ، وَحَفِظْتَهُ ، فَلَكَ دِرْهَمٌ فَطَلَبْتُ الْحَدِيثَ عَلَى هَذَا )(٢).

واتە (ئەی کوڕم بەدوای فەرموودە بکەوە هەر کاتێك هەر فەرموودەیەکت

(١) سورەتی الأعراف ئایەتی ٥٨ .
(٢) بڕوانە: شرف اصحاب الحديث، الخطيب البغدادي (ل ١٦٥).

لەبـــەرکرد درهـــەمێکت دەدەمـــێ منـــیش فـــەرموودەم لەبـــەرکرد لەســـەر ئـــەم پشتگیرییە).

ئیمامی تەبەری باسی پشتگیری باوکی دەکات دەڵێت: (حفظت القرآن ولي سبع سنين، وصليت بالناس وأنا ابن ثماني سنين، وكتبت الحديث وأنا في التاسعة)[1].

واتە: (قورئانم لەبەرکرد تەمەنم حەفت ساڵ بوو، پێشنوێژیم بـۆ خـەڵك کـرد لـە تەمەنی هەشت ساڵی، دەستم بە نووسینی فەرموودە کرد نـۆ سـاڵ بـووم.) کاتێـك لێیان پرسی چۆن گەیشتیە ئەم پلەیە لە وەڵامدا باسـی دەوری بـاوکی کـرد گـوتی باوکم لەخەودا منی بینی دانیشتبووم لەبەر دەستی پێغەمبەری خودا دەفـرێکم لـە پێش بوو پڕ بوو لە بەرد من بەردەکانم دەهاویشـت بـاوکم چـووە لای لێکـدەرەوەی خەون ئەویش پێی وت ئەگەر کوڕەکەت گەورە بێت ئامۆژگـاری کـارێکی گـەورەی ئیسلام دەبێ لە شەریعەتیش زۆر شارەزا دەبێت: (فحرص أبي على معـونتي علـى طلب العلم وأنا حينئذ صبي صغير)[2] باوکم زۆر سوور بوو، کە پشگیریم بکات بۆ فێربوونی زانست من لەو کاتەیدا منداڵێکی بچووك بووم .

## سوفیانی سەوری و پشگیری دایکی

ئیمامی ئەوزاعی لە بارەی زانست و گەورەیی سوفیانی سەوری دەفەرموێت: (لم يبق من تجمع عليه الامة بالرضـا إلا سـفيان)[3]. واتـە (کەسـێك نـەماوە هـەموو ئومەت لەسەری یەك دەنگ بن تەنها سووفیان نەبێت) .

ئەمـەش بەرهـەمی دەسـتی دایکێکـی صـالحەیە سـوفیان بۆخـۆی دەفـەرموێت کاتێك بەدوای زانست کەوتم وتم خودایە چۆن مەعیشەت بۆخۆم پەیـدا بکـەم داوام

(١) بڕوانە: معجم الادباء، ياقوت الحموى (١٨-٤٩).
(٢) بڕوانە: معجم الادباء، ياقوت الجهودى (١٨-٤٩) .
(٣) بڕوانە: تذكرة الحفاظ ابو عبدالله الذهبي (١/٢٠٤).

له خودا كرد يارمەتيم بدات دايكم پێی وتم (يا بنى اطلب العلم و انا اكفيك بمغزلي)[١].

واته ئەی كوڕی شيرينم به دوای زانست بكەوه، من كەفالەتی ژيانت دەكەم به ڕستن و چنين).

جگه له يارمەتی مادی ئامۆژگاريشی دەكرد دەيفەرموو (يا بني! إذا كتبت عشرة أحرف فانظر هل ترى في نفسك زيادة في خشيتك وحلمك ووقارك، فإن لم تر ذلك فاعلم أنها تضرك ولا تنفعك!) [٢]..واته: (كوڕی شيرينم ئەگەر ١٠ پيتت نوسی تەماشاكه ئايا ترسان له خوداو نەرم و نيانيت زياتر بووه ئەگەر ئەمەت له دەروونت دا نەبينی ئەوه بزانه زەرەرت پێ دەگەيەنێ و سوودمەند نابی.

.له بيرمان نەچێت هەريەك له ئيمامی مالك و شافعی و احمدو غەزالی و هەيسەمی و حافزی عيراقی و گەوره زانايان به پشگيری و كاريگەری خێزان و عائيله و دايك و باوكيان پێگەيشتوون .

## دووەم: دەوری دەوڵەت له پشگيری و پێگەياندنی زانستخوازان.

دووەم ماڵی پێگەياندن به زانستخوازان مالی گەورەيه كه دەوڵەته دەوری له خێزان كەمتر نييه، پشكی هەره گەوره له پێگەياندن بەبەر دەوڵەت دەكەوێ، بۆ ئەوەی تاكەكانی كۆمەڵگا بكاته سەركردەو بينای داهێنان و پێشكەوتن بۆ دەوڵەتداری بينا بكات دەبێ ژينگەيەكی زانستی فراوان بۆ زانستخوازان فەراهەم بكات.

(١) بڕوانه: حلية الاولياء ابو نعيم (٦-٣٧٠) .
(٢) بڕوانه: صفة الصفوة لابن الجوزي (١٨٩/٣).

ئاورێك لە مێژووی دەوڵەتداری ئیسلامی بدەینەوە لە پێشدا بۆت دەردەکەوێت کە ساتێك بێ ئاگانەبوون لە پێگەیاندن و گرنگیدان بە زانست و خوێندنگاو زانستخوازان، دەیان و سەدان مەداریس و خوێندنگاو زانکۆیان کردووەتەوە، زۆرترین کتێبخانەو شوێنی گشتی و تایبەتیان بۆ فێربوون کردۆتەوە لەسەر بوجەی دەوڵەت، هەموو پێداویستیەکانیان فەراهەم کردووە، تەنانەت قوتابی بێ دەرامەت خوێندنی بەخۆڕایی لەسەر دەوڵەتداری ئیسلامی تەواو کردووە.

بۆ نموونە:

- سەلجوقییەکان وەزیرێکیان هەبوو بەناوی (نظام الملك) عێراق و خوراسانی پڕکردووە لە قوتابخانەو خوێندنگا، هەموو شارێك قوتابخانەیەکی لێ دروست کرابوو، لە هەندێك خوێندنگا ڕێژەی زانستخوازەکان گەیشتووەتە شەش هەزار قوتابی هەموویان بەبێ بەرامبەر دەیان خوێند[١].

- صلاح الدینی ئەیوبی خوێندنگای لە هەموو ئەو شارانە کردووە، کە لە ژێر دەستی دابوون، وەك :میسر و دیمشق و موسڵ و بیت المقدیس، بە گرنگی دان بە زانست کە دکتۆر ئیبن میمون یەهوودیەکی ئەندەلوسی دکتۆری تایبەتی خۆی بوو زۆرترین گرنگی پێ دەدا.

- هاڕوون ڕەشید خەلیفەی عەباسییەکان یەکێکە لە دیارترین نموونە بەرزەکانی ناو مێژووی دەوڵەتداری ئیسلامی، کە زۆرترین خوێندنگای کردۆتەوە بە جۆرێك دونیای تووشی سەرسوڕمان کردووە، دەیان و سەدان بیمارستان و دەزگای خوێندنی لێ دروست کردووە، گرنگی بە تەواوی زانستەکانی شەرعی و مرۆیی و پیشەیی دا، تەنانەت زانکۆی تایبەت کرایەوە بۆ پزیشکی و ئەندازیاری و بەشەکانی تر، عبد اللەی کوڕی موبارەك دەڵێت: ( نەم بینیوە خوێندەوارو زانایەك بە قورئان و

(١) بڕوانە: من روائع حضارتنا مصطفى السباعي (ل ١٠٤) .

فێرخوازێك بۆ خێركردن و پارێزەرێك بۆ پاراستنی حەلاڵ و حەڕام لـە دوای وەفـاتی پێغەمبـەر (ﷺ) و خولـەفای ڕاشـدین و صـحابە بـە ئەنـدازەی زەمـانی هـاڕوون ڕەشید و ڕۆژگارەكانی، مێرد منداڵی وا هەبوو، هەموو قورئـانی لەبـەر بـوو تـازە تەمـەنی گەیشـتبووە هەشـت سـاڵان، لـە زانسـتی فقـه، گێڕانـەوەی فـەرموودە و تەدوینـكردن و مونازەڕەی زانستی وەك بـەحر وابـوو، كەچـی تەمـەنی ٢١ سـاڵان بوو)[1].

- ئیبن كسیر باسی ڕۆژگار و ڕوداوەكانی ساڵی (٦٣١) دەكـات و دەڵێـت: (ثـم دخلت سنة إحدى وثلاثين وستمائة فيها كمل بناء المدرسة المستنصرية ببغداد ولم يبن مدرسة قبلها مثلها، ووقفت على المذاهب الأربعـة مـن كـل طائفـة اثنـان وسـتون فقيها، وأربعـة معيـدين، ومـدرس لكـل مـذهب، وشـيخ حـديث وقارئـان وعشـرة مستمعين، وشيخ طب، وعشرة من المسلمين يشتغلون بعلم الطب، ومكتـب للأيتـام وقدر للجميع من الخبز واللحم والحلوى والنفقة ما فيه كفاية وافرة لكل واحـد. ولمـا كان يوم الخميس خامس رجب حضرت الدروس بها وحضـر الخليفـة المستنصـر بـالله بنفسه الكريمة وأهـل دولتـه مـن الامـراء والـوزراء والقضـاة والفقهـاء والصـوفية والشعراء، ولم يتخلف أحد من هؤلاء، وعمل سماط عظيم بها أكل منه الحاضـرون، وحمل منه إلى سائر دروب بغداد من بيوتات الخـواص والعـوام، وخلـع علـى جميـع المدرسين بها والحاضرين فيها، وعلى جميع الدولة والفقهـاء والمعيـدين، وكـان يومـا مشهودا) تا دەكاتە ئەوەی دەفەرمویت: (ووقفت خـزائن كتـب لم يسـمع بمثلـها في كثرتها وحسن نسخها وجودة الكتب الموقوفة بها)[2].

دیارە سوڵتان و سـەركردەكان تـەنها گرنگیـان بـە زانسـتی شـرعی و زانایـانی

(١) بڕوانە: تاريخ الخلفاء لإبن قتيبه الدنيوری (١٥٧/٢).
(٢) بڕوانە: البداية والنهاية ابن كثير، ( ١٦٣/١٣).

موسوڵمان نەداوە بەڵك و گرنگی تەواویان بە تـەواوی زانسـتەکان داوە تـا دەگاتـە خەڵکانی بێ باوەڕیش زۆرترین ئاسانکاریان بۆ هەڵگرانی زانست کردووە.

- محمدی فاتیح بە دوای ئەندازیارێکی نەصرانی نارد نـاوی (أوروبـان) بـوو لـە دروستکردنی تۆپ زۆر شارەزا بوو، باشترین پێشوازی لێ کـرد، ڕێـزی زۆری لێنـا، گرنگی تایبەتی پێدا، تەواوی پێداویسـتییەکانی بـۆ ئامـادە کـرد بـۆ ئـەوەی ئـەم ئەندازیارە باشترین تۆپی بۆ درووست بکات. جۆرە تۆپێکی درووست کرد بـە نـاوی (المدفع السلطانی) کە پێشتر وێنەی نەبووە[1]. ئێمە باسی گرنگی دەوڵەت دەکـەین لە پشتگیری زانست و زانسـتخوازان دەوڵـەتی عوسمـانی دیـارترین زانـای جیهـانی کۆکردەوە، لە زۆربەی ولاَتان هەموو کار ئاسانیەکی بۆ کردن تـاوەك و زانسـتەکان وەربگێـرن بـۆ سـەر زمـانی عـەرەبی سـوودی لێ وەربگـرن بـەم کارەیـان دەوڵـەتی عوسمانییان گەیاندە لووتکەی شارستانیەت لە ڕووی سیاسی و عەسکەرییەوە.

لێـرەدا پێویسـتە بڵـێین دەوڵـەت زۆرتـرین کاریگـەری هەیـە لـە پێگەیانـدنی زانسـتخوازان و بەهێزکردنی دەزگاکانی خوێندن بـۆ گەیانـدنی ولاَت بـە لووتکـەی پێشکەوتن، هەستانەوە، ڕۆشنبیری، شارستانیەت، تەکنـەلۆژاو بـواری عەسـکەری تەنهاو تەنها پشتگیری دەوڵەت گرنگی دانە بە زانستخوازو دەزگاکانی خوێندن.

## سێیەم: ڕۆڵی زانایان لە پشگیری زانستـخوازان.

تەنها نوخبەیەك لە نێو کۆمـەڵگا ڕۆڵـی سـەرەکییان هەیـە لـە چاکسـازی و هەسـتانەوە و پێگەیانـدنی تاکـەکان ئـەویش زانایـانن، بـەردەوام لـە بـیری ئاوەدانکردنـەوە و پێگەیانـدن و گەشەسـەندنی تـاك و کۆمـەڵگاو دەوڵەتـدان، بەرژەوەندی دەپارێزن و، زانست بلاَو دەکەنەوە، ڕۆڵەکانی گەل بە ئامانج دەگەیەنن

(١) بڕوانە: الفتوح الاسلامیە عبدالبصیر عبدالعزیز العمری (ل ٣٦١) .

پەروەردەو پێگەیاندن لەسەر شانی ئەوانە، چونکە لە هەموو تاکەکان خەم خۆرترو شارەزاترو سورترن، خزمەتکردنی دین و ژینی خەڵك بە واجب دەزانن، هەستی بەرپرسیارەتییان بەرزە، غەمی ئوممەیان لەسەر شانە، بەردەوام هانی قوتابخانەو زانستخوازو دەزگاکانی خوێندن و مەدرەسەو مزگەوت دەدەن بۆ زانست و فێربوونی زانست، ئەمەش وەك میراتێك بەجێماوە بۆ زانایان، لە پێشدا صەحابە بەم میراتگرایەتیە هەڵساون ئەوەتا معازی کوری جەبەل فەرمان بە تاکەکان دەکات و پێان دەڵێت: (تَعَلَّمُوا الْعِلْمَ ، فَإِنّ تَعَلُّمَهُ لِلَّهِ خَشْيَةٌ ، وَطَلَبَهُ عِبَادَةٌ ، وَمُذَاكَرَتَهُ تَسْبِيحٌ ، وَالْبَحْثَ عَنْهُ جِهَادٌ ، وَتَعْلِيمَهُ لِمَنْ لا يَعْلَمُهُ صَدَقَةٌ ، وَبَذْلَهُ لأَهْلِهِ قُرْبَةٌ ، لأَنَّهُ مَعَالِمُ الْحَلالِ وَالْحَرَامِ ، وَمَنَارُ سَبِيلِ الْجَنَّةِ ، وَالأُنْسُ فِي الْوَحْدَةِ ، وَالْمُحَدِّثُ فِي الْخَلْوَةِ ، وَالصَّاحِبُ فِي الْغُرْبَةِ ، وَالدَّلِيلُ عَلَى السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ ، وَالسِّلاحُ عَلَى الأَعْدَاءِ ، وَالزَّيْنُ عِنْدَ الأَخِلَّاءِ ، وَالْقَرِيبُ عِنْدَ الْغُرَبَاءِ ، يَرْفَعُ اللَّهُ بِهِ أَقْوَامًا فَيَجْعَلُهُمْ فِي الْخَيْرِ قَادَةً ، وَهُدَاةً يُهْتَدَى بِهِمْ ، وَأَئِمَّةً فِي الْخَيْرِ تُقْتَصُّ آثَارُهُمْ ، وَتُرْمَقُ أَعْمَالُهُمْ ، وَيُقْتَدَى بِفِعَالِهِمْ ، وَيُنْتَهَى إِلَى رَأْيِهِمْ ، تَرْغَبُ الْمَلائِكَةُ فِي خِلَّتِهِمْ ، وَبِأَجْنِحَتِهَا تَمْسَحُهُمْ ، وَفِي صَلاتِهَا تَسْتَغْفِرُ لَهُمْ ، حَتَّى حِيتَانِ الْبَحْرِ وَهَوَامِّهِ ، وَسِبَاعِ الْبَرِّ وَأَنْعَامِهِ ، وَالسَّمَاءِ وَنُجُومِهَا ، لأَنَّ الْعِلْمَ حَيَاةُ الْقُلُوبِ مِنَ الْعَمَى ، وَنُورُ الأَبْصَارِ مِنَ الظُّلَمِ ، وَقُوَّةُ الأَبْدَانِ مِنَ الضَّعْفِ ، يَبْلُغُ بِالْعَبْدِ مَنَازِلَ الأَبْرَارِ ، وَمَجَالِسَ الْمُلُوكِ ، وَالدَّرَجَاتِ الْعُلَا فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ ، وَالْفِكْرَةُ فِيهِ تُعْدَلُ بِالصِّيَامِ ، وَمُدَارَسَتُهُ بِالْقِيَامِ ، وَبِهِ يُطَاعُ وَيُعْبَدُ ، وَبِهِ يُعْمَلُ وَيُحْفَدُ ، وَبِهِ يُتَوَرَّعُ وَيُؤْجَرُ ، وَبِهِ تُوصَلُ الأَرْحَامُ ، وَيُعْرَفُ الْحَلالُ مِنَ الْحَرَامِ ، إِمَامُ الْعَمَلِ وَالْعَمَلُ ، قَالَ : تَابِعُهُ ، يُلْهَمُهُ السُّعَدَاءُ ، وَيُحْرَمُهُ الأَشْقِيَاءُ )(١).

ڕۆڵی سەرەکی زانایان هاندان و پشتگیری کردن و وتنەوەی دەرس و داڕشتنی

---

(١) بڕوانە: جامع بيان العلم و فضله (١/٢٣٥).

مەنهــەجی نــویێ و ســەردەمیانەو ئامۆژگــاری و ڕێنــوینی زانســتــخوازانە، پــەروەردەکردن و فێرکردنــی تــەواوی تاکەکانــە لــە منداڵــەوە بگــرە تــا دەگاتــە بەساڵاچووەکان، کاتێك باسی ڕێبەری مەنهەجی خوێندن دەکـەین بـۆ هەسـتانەوەی ئومە بێگومان زانایان زۆرترین دەوریان هەبووە لە هەر گۆڕانکاریەك کە لە پێشـدا ڕوویداوە، بونەتە هەوێنی پێشکەوتنی زانستی و زانستخوازان، لە پێشـدا سـەدانی وەکوو ئیمامی احمد و ابن تیمیە و نـەوەوی و لـەم سـەردەمەدا زانایـانی وەك ابـو علای مودودی و جمال الدینی ئەفغانی و محمد عبدەو محمـد رشـید رەزاو محمـد ابـو زوهرەو حسـن البنـاو و سـید قوتـب و عبدالحمیـد بادیسـی و عبـدالرحمن منبکـە المیدانی و شیخ سعیدی پیران و نەورەسی و سفر الحوالی و مامۆسـتا مـلا عوسمـان عبدالعزیز و دەیان و سەدانی تر زۆرترین پالپشت بوون بۆ زانسـت و زانسـتخوازان هەموویان فەرمانی خودایـان جێبەجێـکردووە کـە دەفـەرموێت: ﴿ وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ ﴾ (١).

واتە: (باسی ئەو خاوەننامانە بکە خوا پەیمانی لێوەرگرتن کـە بـەڕێکوپێکی - ئەونامەیە بۆیان هاتووە- بەخەڵکی راگەیەنن و، هیچی لێ نەشارنەوە).

## چوارەم: دەوری کۆمەڵگاو ژینگە لە پشگیریـکردنی زانستـخوازان.

مـرۆڤ بـە سرووشـت کـوڕی ژینگـەو کۆمـەڵگـەی خۆیـەتی وەك ابـن خلـدوون دەفـەرموێت ( الانسـان ابـن بیئتـە)، واتـە: (مـرۆڤ نـەوەی ژینگـەی خویـەتی)، کۆمــەڵگاو ژینگــە تەندرووســت و گونجــاو و پێشــکەوت و وشــیار بــن زۆرینــەی

(١) سورەتی ال عمران ئایەتی ١٨٧ .

ڕۆڵەکانیشی بەم ئاراستەیە دەبن، بە سرووشت مرۆڤ کاریگەری باش و خراپی دەوروبەرو ژینگەو کۆمەڵگای خۆی لەسەرە، تا کۆمەڵگا ئاستی زانست و زانیاری، بەهێز بێت ئەوا زانستخوازانیش وشیارو داناو زاناو سەرکەوتوو دەبن پێچەوانەکەشی بە پێچەوانەوەیە، لە بەرامبەر ئەم دڵسۆزی و خۆشەویستی و ئامۆژگاری و زانست و زانیاریەی کە زانستخوازو زانا پێشکەشی کۆمەڵگای دەکات پێویستە لەسەر کۆمەڵگاش ڕێزو تەقدیری تایبەت بۆ زانایان و زانستخوازان دابنێ، ڕێزگرتنی زاناو زانستخواز و قوتابییان لە ناو کۆمەڵگادا کارێکی پێویستە، زانستخوازان خودا ڕێزی لێناون و بەهۆی زانستەکەیانەوە بەرزی کردوونەتەوە: خودا دەفەرموویت﴿ يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖ ﴾[1]. واتە: (ئەوانەی ئیمانیان هێناوە و زانست و زانیارییان پێدراوە لە ئێوە خوای گەورە چەندەها پلە و پایە بەرزیان دەکاتەوە) . ئەوان لە کۆتاییدا دەبن بە میراتگری پێغەمبەران (العلماء ورثة الأنبياء) ، پێغەمبەرانیش پێشەنگ و چاوساغ و سەرمەشقی زانستخوازو قوتابی و خوێنکاران بوونە، هەر کۆمەڵگایەك بیەوێ پێش بکەوێ لە تەواوی بەشەکانی ژیان ناتوانێ بەبێ زانستخوازو زانایان سەرکەوتوو بێت، کۆمەڵگاش ئەگەر ڕێزی لە زاناو زانستخوازان نا ڕێزی لە خۆی و ژینگەو تاکەکانی کۆمەڵگای گرتووە، ئیبن عباس لەگەڵ ئەوەی ئامۆزای پێغەمبەرە، بەلاّم جڵەوی ولاّغەکەی زیدی کوڕی سابت ڕادەکێشێ دەفەرمویت (هَكَذَا أُمِرْنَا أَنْ نَفْعَلَ بِعُلَمَائِنَا وَكُبَرَائِنَا) واتە: وا فەرمانمان پێ کراوە ڕێز لەزانا و گەورەکانمان بگرین، ئەمە جوانترین نموونەی دەوری کۆمەڵگایە بەرامبەر بە زانستخوازان.

---

(١) سورەتی المجادله ئایەتی ١١ .

ئیمامی شافعی کاتێك لە مەجلیسی ئیمامی مالیك دادەنیشێ شەرم دەکات وەرەقەی کتابەکەی وەرگێڕێ لەبەر (ڕێزی مامۆستاکەی) دەفەرمووێت: (کنت أصفح الورقة بين يدي مالك صفحاً رقيقا هيبة له لئلا يسمع وقعها)[١]. واتە: من پەڕەیی کتێبەکەم لەبەر دەستی ئیمامی مالك لەسەرەخۆ و بەنەرمی وەردەگیڕا لەبەر هەیبەتی ئیمام تا گوێی لەدەنگی وەرەقە نەبێ.

-بەهەزاران کەس دەوریان لە ئیمام بوخاری دەدا بۆ فێربوون و ڕێزگرتن کەچی تەمەنی نەگەیشتبووە ٢٠ساڵ (وهو دون العشرين من عمر)[٢].

ئەم ڕێزو پشگیریەی کۆمەڵگا لە زانایان لەبەر زانستەکەیانەوە بووە زانستیش بۆ خزمەتکرنی دین و ژین و کۆمەڵگا بووە، بۆیە کۆمەڵگا زۆر پێویستە ڕێزی زۆر لە زانستخوازان بگرن پشتگیرییان بکەن و سەریان بخەن سوود و قازانج و بەروبوومیان بۆ هەموو کۆمەڵگایە بە گشتی.

## پێنجەم: ڕۆڵی پارەدار و خێرخواز و دەوڵەمەندەکان لە پشتگیریکردنی زانستخوازان.

مرۆڤ بە سروشت پێویستی بە بژێوی ژیان هەیە سەرچاوەی بژێوی ژیانیش ئابووری و پارە و پوولە، بێگومان زانستخوازیش وەك هەر تاکێکی تر هەموو پێداویستییەکانی ژیانی پێویستە بەڵام زانست مەگەر بە دەگمەن نەبێ، ئەگەر نا پێویستی بە خۆیەکلاکردنەوە هەیە تا بتوانێ زانستخوازێکی زیرەك و پڕ زانستی لێ دەرچێ، بەخشینی ماڵ و سامان بۆ کەسانی زانستخواز زۆر خێر و پاداشتی زیاترە لە بەشەکانی تر.

---

(١) بڕوانە: تاريخ دمشق (١٤/ ٢٩٣) .

(٢) بڕوانە: تهذيب الكمال (٤٥٢/٢٤) .

زانستخواز بە زانستەکەی خزمەت بە دینی خودا و ژینی خەڵك دەکات واتا لە پێناو خودادا، خوداش هانی کەسەکان دەدات تا ماڵ ببەخشنەوە لەپێناو خودا، خودای گەورە دەفەرموویّت: ﴿ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِى كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّائَةُ حَبَّةٍ ۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾[1].

واتە: (نمونەی ئەو کەسانەی کە دارایی خۆیان لە ڕێگەی خوادا دەبەخشن، هەر وەکو دانە تۆمێکە کەحەوت گوڵ دەردەکا و هەر گوڵەی سەد دانەی تێدا بێ " کەوابوو تەنها دانە تۆمێك (٧٠٠) دەنکی پێوە دەبێ، واتە: پاداشتی گشت خێر و چاکەیەك بە لای خواوە یەك بەدە، تا حەوت سەدە و هێمان بۆ هەرکەسیش خوا خۆی بیەوێ چەند بەرامبەر پاداش دەدا، چونکە خوا بەخششی یەکجار فراوانە، زۆر ئاگاو زانایە" ئەزانێ هەرکەس چەندە هەڵدەگرێ).

دیارە ڕێگاکانی بەخشین زۆرن باشترین ڕێگا بۆ خێرخواز و بەخشەرەکان یارمەتی دانی زانستخوازانە بۆ بلاّو کردنەوەی زانست و زانیاری و فێرکردن، بۆ خزمەتکردن و پێگەیاندنی نەوەی زانستخوازو زاناو دانا، عبداللە ی کوڕی موبارەك بازرگانی دەکرد تا خزمەت بە زانستخوازان بکات دەیفەرموو: (إِنِّي لأَعْرِفُ مَكَانَهُمْ ، لَهُمْ فَضْلٌ وَصِدْقٌ ، وطَلَبُوا الْحَدِيثَ ، فَأَحْسَنُوا الطَّلَبَ لِلْحَدِيثِ ، حَاجَةُ النَّاسِ إِلَيْهِمْ شَدِيدَةٌ وَقَدِ احْتَاجُوا ، فَإِنْ تَرَكْنَاهُمْ ضَاعَ عِلْمُهُمْ ، وَإِنْ أَغْنَيْنَاهُمْ بَثُّوا الْعِلْمَ لأُمَّةِ مُحَمَّدٍ (ﷺ) ، فَلا أَعْلَمُ بَعْدَ النُّبُوَّةِ دَرَجَةً ، أَفْضَلَ مِنْ بَثِّ الْعِلْمِ)[2].

واتە: من پلەو پایەی زانایان دەناسم، ڕێزیان هەیە و ڕاست گۆن، بەدوای

---

(١) سورەتی البقرة ئایەتی ٢٦١ .

(٢) بڕوانە: تاريخ الدمشق (٤٥٦/٣٢) .

وەرگرتنی فەرموودە دەکەون بەباشترین شێوە، خەڵك زۆر پێویستی پێیانە، ئەگەر وازیان لی بهێنین زانستەکەیان لەدەست دەچێ ، ئەگەر بێ ئیحتیاجیان بکەین، زانست لەنێو ئومەتی محمد بڵاودەکەنەوە، ئەم زانیوە پلەیەك هەبی دوای پیغەمبەران بەرز تر بێ، لە بڵاوکردنەوەی زانست.

بەهۆی بەخشینی بەشێك لە بازرگانەکانەوە دەیان سەنتەر و دەزگا و نوسینگە و ناوەندی لەبەرکردنی قورئان و فێربوون لە هەرێمی کوردستان کراوەتەوە ، دەیان و سەدان زانستخوازی لێ پەروەردە بووەو فێری زانست و فێربوون بووە و سوودی بە کۆمەڵگا گەیاندووە، بووەتە هۆکاری گرنگی دان بە ئادابی شرعی زانستی جۆراوجۆر دەورات و فێربوونی زمان و زۆربەی بابەتە زانستیەکانی تر، بۆیە بوونی بازرگانی بەخشەر بۆ پشتگیری زانستخوازان زۆر گرنگ و پێویستە لە نێو کۆمەڵگا.

ئەم پێنج بابەتەی باسمان کرد زۆر گرنگن بۆ سەرخستن و پێگەیاندنی زانستخوازی بەسوود و هەستیار و سەرکەوت و لەگەڵ ئەوەش باشترین هۆکار کەسایەتی زیرەك و داناو خاوەن هەوڵی کەسەکە خۆیەتی، چەند گرنگی بەخۆی بدات کات بەفیڕۆ نەدات و هەموو پاڵپشت و هۆکارەکان بۆ گەیشتن بە زانستخوازی فەراهەم دێنێ[1] .

---

(١) بڕوانە: العلم و بناء الامم د. راغب السرجانی (ل ٢٨٠) .

## دەزگاكانی خوێندن لە قۆناغی سەرهەڵدان و گەشەسەندنی شارستانیەتی ئیسلامی

بە پێویستی دەزانم ئاوڕێكی كورت بدەمەوە بۆ دەزگاكانی فێربوون لە مێژووی سەرهەڵدان و گەشەسەندنی لە قۆناغەكانی پێشوو چۆنیەتی گرینگیدان و پێگەیاندنی زانستخوازان، بۆ ئەوەی زانستخوازی سەردەم بێ ئاگا نەبێ لەم كەلەپووره پڕ لە گەوهەرو مرواریەی، هەروەها بیكات بە جێگەی تێرامان و پەند وەرگرتن، ڕۆژێك لە ڕۆژان بیر لەوە نەكاتەوە پەروەردەو فێركردن و ئیسلام لە ژیانی تاك و كۆمەڵگا و ژینگە و لایەنەكانی كۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی و بەشەكانی تر دابڕێ، بزانێ كە دەزگای خوێندنی ئیسلامی لە پێشدا چەند خزمەتێكی گەورەی بە مرۆڤایەتی كردووە، چۆن تاك و كۆمەڵگای گەیاندووەتە لووتكە و سەردەمی زێڕینی ڕۆشنبیری و شارستانیەت و ئاوەدانكردنەوەی بەرپاكردووە، میللەتان شانازی بە ڕابردووی خۆیانەوە دەكەن كەچی زۆر جار ڕابردوویان تاریك و نەفامی و نەزانی بووە، كەچی سەردەمی دەزگاكانی فێربوونی ئیسلامی سەردەمی هەستانەوە و پێشكەوتنە نابێ زانستخواز ئاگاداری نەبێ.

### یەكەم: سیستەمی خوێندنی ئیسلامی.

بە درێژایی مێژووی فێربوونی ئیسلامی تێكەڵكراوە بەڕووحی ئیسلام و ئیمان، ئەم شێوازو ڕێرەوە گۆڕانكاریەكی ڕیشەیی لە ڕووی كۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی و پەروەردەیی لەنێو جەزیرەیی عەرەبیدا بەرپاكرد، ئەمە وای كرد زانستخواز زانستەكان وەك پەیام وەربگرێ نەك پیشە، بڵاوكردنەوە و فێركردن و فێربوونی زانست بوو بە بەشێك لە خواپەرستی، هەموو تاكێكی موسڵمان هەرچەندە لەسەرەتادا سیستەمی فێربوون بە شێوازێكی میللی و ڕاستەوخۆ بوو،

گرینگیـدان بە زانست و فێربوون وای لە موسڵمانان کرد ئەم شێوازە میللییە پـەرە بســێنی و وردە وردە تــەواوی مــاڵ و دووکــان و نوســینگە و شــوێنی گشــتی و نەخۆشخانە و هۆڵ و بۆنەکانیش بگرێتەوە، هیچ شوێنێك نەما نەبێتـە قوتابخانـەی فێرکردن، ئەم شێوازە فێربوونە میـلـلییە وای کرد دەزگاکانی فێربوون یەك شـکل و شیواز نەکرنە بەر بۆ فێربوون، بەڵکو دەیان جۆرو ڕێگای فێربوونیان فەراهـەم کـرد بەپێی پێداویستی کۆمەڵگا. بە نموونە.

١- (الكُتَّاب): ناوی شوینێکە تایبەت کرابوو بۆ لەبەرکردنی قورئان و زانستە ئایینیەکان بۆ هەرزەکاران. ئەم ناوە دەگەڕێتەوە بۆ چاخەکانی پێشوو، لەسەردەمی هاتنی ئیسلامیش گەشەی پێدرا.

٢- مزگەوت و نوێژگاکان بۆ قوڵتربوونەوی زانستی شەرعی بەلایەنی فراوانی.

٣- قوتابخانەکان بۆ بابەتە پسپۆرییەکان بوون.

٤- بیمارستانەکان تایبەت بوون بە زانستی پزیشکی.

٥- ڕوانگەکان بۆ بابەتی فەلەکناسی بوون.

هــیچ شــارێك نــەبوو خــالی بــێ لــە دەیــان دەزگــای فێربــوون، کــە بــەپێی پێداویستییەکانی خەڵك کرابوونەوە[1].

## دووەم: فێربوون لە ژوورە بچووکەکان لە نزیک مزگەوت دروست کرابوو(الکتاتیب).

ڕێگاو دەزگای فێربوون بۆ تەواوی چینوتوێژەکان بـە شـێوازی جیاجیـا دروسـت کرابوو، یەکێك لەم ڕێگایانە گەورەو بچووك، منداڵ و ئافرەت تێیدا فێـری زانسـت دەبوون ئەو ژورە بچووکانە بوون کە لە دەوروبەری مزگەوتەکان دروست کرابوون تـا

(١) بڕوانە: تاريخ التربية الاسلامية (ل ٤٤)، هەروەها معاهد التربية الاسلامية (ل ٤٥) .

دەرفەت بۆ زانستخوازان بڕەخسێ تێدا، خوێندن و نوسین و فێربن، ئەم جۆرە خوێندگایانە لە پێشدا هەبوون کە ئیسلام هات گرنگی زیاتری بەم جۆرەدا، لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) گەشەی کرد ئەم گەشەکردنە بەردەوام بوو تا قۆناغەکانی سەردەمی خیلافەی ڕاشدین و دوای ئەو زیادی کرد، بە پێی پێویستی و داخوازی خوێندکاران، ئافرەت و پیاو و ژن منداڵ بۆ لەبەرکردنی قورئان و فەرموودە، و فیقھ و بابەتەکانی تر ئامادەکرابوون.

ئیبن حزم دەفەرمووێت: (ثم مات ابوبكر وولى عمر ففتحت بلاد فارس طولا وعرضا و فتحت الشام كلها، والجزيرة ومصر كلها، ولم يبق بلد الا وبنيت فيه المساجد ونسخت فيه المصاحف، قرأ الأئمة القرآن وعلم الصبيان فى المكاتب شرقاً وغرباً)[1].

واته(دوای ئەوەی ئیمامی ئەبوبەکر وەفاتی کرد عمر شوێنی گرتەوە ولأتی فارسیان فەتح کرد بە درێژایی و پانتاییەکەی، شامیشی بە تەواوی فەتح کرد، هەروەها جەزیرە و میسریش هەمووی فەتح کرد، هیچ شارێك و لادێیەك نەما مزگەوتی تیا نەکردبێت و موصحەفی قورئانی تیا چاپ کرد، ئیمامەکان قورئانیانیان تیا خوێند و منداڵیان لە مەکتەبەکان فێرکرد لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا).

ئەمە بیرمان دەخاتەوە، کە لە هیچ سەردەمێك جوڵەی زانست و فێربوون نەوەستاوە، سەرەتای گەشەکردنەکەی بۆ ئیمامی عومەری کوڕی خەتاب دەگێڕێتەوە، هەروەها ئەوەشمان بۆ دەردەخات سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) و خولەفای ڕاشدین تەنها سەردەمی غەزەوات و جەنگ نەبوو، بەڵکو گەشەی زانستی و فێربوون بەردەوام بوو، تەنانەت جەنگیش هەر لە پێناوی بانگەوازی و

(١) بڕوانە: الفصل فى الملل والنحل، ابن حزم (١/٦٥).

بڵاوكردنەوەی زانست و زانیاری بووە[١]. ئەم ژوورانەی لە نزیك مزگەوت دروست كراون بۆ خوێندنی منداڵان بۆ پاراستنی مزگەوت بوو لە هەندێك كەموكوڕی ئەگەر منداڵ هەیبێ. دواتر(الكُتَّاب) ژورە بچوكەكانی نزیك مزگەوت بە ئەندازەیەك زیادی كرد هیچ شوێن وشارێك نەما چەندان الكُتّاب ی تیایدا دروست نەكرێ، ئیبن حوقل دەڵێت: ژمارەی مامۆستایانی ژورەكانی نزیك مزگەوت لەیەك شاری(بلرم لە حەقلیە)دەگەیشتە نزیك (٣٠٠)مامۆستا، ئەگەر ئەمە ژمارەی تەنها ماموستاكان بێ، بێگومان ژمارەی قوتابییان چەندان جار زیاتر بووە[٢]. ئەم شێوازە بۆ فێربوونی زانستخوازان درێژەی هەبوو لە جیهانی ئیسلامی تا سەردەمانی ئێستاش.

ئیمامی عومەر پیاوانی دەوڵەتداری دابەش كردبوو بۆ سەر بوارە پسپۆڕییە تایبەتەكان، لە كۆنگرەی (الجابیە) دەیفەرموو: (كەسێك دەیەوێت پرسیار لەبارەی قورئان بكات با بێتە لای ئوبەی كوڕی كەعب، ئەوەی دەیەوێ پرسیار دەربارەی میرات بكات با بێتە لای معازی كوڕی جەبەل، ئەوەی دەیەوێ پرسیار لە پارەو ماڵ و سامان بكات با بێتە لای من، خودای گەورە منی كردووەتە بە خەزنەدار)[٣].

بەم جۆرە ئەلقەی زانستی لەتەواوی مزگەوتەكاندا بەردەوام بوو كەسێكی وەك ئەبودەرداء ڕێژەی قوتابییەكانی دەگەیشتە( ١٠٠٠ ) قوتابی زیاتر، هەموو ئەم حەلەقاتانە لە تەواوی مزگەوتەكانی ولاّتانی ئیسلامی دا سەرچاوەی سەرەكی زانستخوازی بوون، هەموو كات مزگەوت شوێنی زانست و زانیاری و پێگەیاندن و

---

(١) بڕوانە: نظرات فی دراسة التأريخ الاسلامی، عبدالرحمن الحجی ، (ل٢٥ ـ ٥٤) .
(٢) بڕوانە: التربيه الاسلامية نظمها، وفلسفتها تاريخها ، احمد شلبی، (ل ٥٣).
(٣) بڕوانە: النظام الحكومة النبوية عبدالحميد الكتانی (ل٤٠-٤٨) .

بەندایەتی و ئاراستەکردن و ڕەمزی شارستانیەت بووە، زۆرێك لەم مزگەوتانە، کە لە زمانی عەرەبی پێیان دەڵێن جامع وەك (جامعی عمری کوری عاص لە فصطاط ساڵی (٢١ھ). و جامعی احمدی کوری طولون ساڵی (٢٥٩ھ ). و جامعی الازھر ساڵی ( ٣٦٠ھ) شوێنی مزگەوتیان گرتبۆوە) [(١)].

ئەم مزگەوتانە بوونە شوێنی بۆنە ئایینییەکان و چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان. هەروەها حاکم و **قازی** و دادوەرو دادگاکانیش هەر لەم مزگەوتانە کارەکانیان ئەنجام دەدا، هەموو کات سەربەخۆیەکی تەواو و ئازادییەکی ڕەهایان هەبووە لە کارکردن و گێڕانی دەوری سەرەکی خۆیان کە پەروەردەیە.

## سێیەم: فێرکرن لە قوتابخانەکان.

بەپێی پێداویستی و زیادبوونی ڕێژەو داخوازی لەسەر خوێندن و زانست دەزگاکانی خوێندن و فێربوون ڕوویان لە زیادبوون کرد. مزگەوتەکان ڕۆژ بە ڕۆژ حەلەقاتی زیاترو ژمارەی قوتابیانی ڕوو لە زیادبوون بوو، وتووێژو گفتوگۆی زانستی لەناو مزگەوتەکان کەمێك ئارامی و سەکینەتی لە نوێژو و عیبادەت و زیکر کردن ئاڵۆز کردبوو، گەشەسەندن و بەرەوپێشچوونی زانستەکانیش خاڵێکی تر بوو وای کرد بیر لە کردنەوەی قوتابخانە بکرێتەوە، تاوەکو تایبەت بکرێت بۆ زانست و فێربوون و فێرکردن، وە زۆرترین کاتیان لە زانستخوازی لەوێدا بەسەر ببەن.

هەر فەرموودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ) پاڵنەرێکی بەهێزە بۆ خزمەت کردنی زانست و زانستخوازان کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت (اذا مات الانسان

---

(١) بڕوانە: الخطط المقريزية (٤-٧٩) .

انقطع عمله الا من ثلاث: صدقة الجارية، او علم ينتفع به او ولد صالح يدعو له ) [(١)]. واتە: (ئەگەر مرۆڤ مرد کردەوەکانی کۆتایی دێت تەنها سێ کردەوە نەبێت، خێرێکی نەبڕاوە، یان زانستێکی سوود بەخش، یان نەوەیەکی صالح دووعای بۆ بکات).

بە تێگەیشتن لەم فەرموودەیە پیشینان گەیشتینە ئەنجام کە باشترین خێرێك کە ئەنجامی بدەن کردنەوەی قوتابخانەو خوێندنگایە بۆ هەژاران، قوتابخانەیان کردەوە ئەوقافی فێرکردن و فێربوون دانرا، هەر لە خەلیفەو ئەمیرو زاناو تەواوی پیاو ماقولاَن دەستیان کرد بە کردنەوەی قوتابخانەی جۆراو جۆر، یەکیك لە توێژەرەکان دەڵێت: (إن عددا من الطلاب كان يسكن هذه المداريس التى يمكن تشبهها بالكليات الداخلية فى جامعتى اوكسفور و كيمبريج)[(٢)].

واتە (بەڕاستی ڕێژەی ئەم قوتابیانەی لە قوتابخانەکان دەمانەوە دەکرێ بە گشتی بە هەردوو زانکۆی ئۆکسفۆردوو کامبریج بچوێنی لە ڕووی زۆریەوە) . ساڵانە وەقف کراوەکان ئەوەندە زیادی کردبوو قوتابخانەکان و مامۆستاو قوتابی مووچەیان بۆ سەرف دەکرا، ماڵ و سەروەتێکی زۆر بۆ بینای قوتابخانەکان سەرف دەکرا، تا بوە هێمای هونەری ئیسلامی. قوتابخانەی سولطان حسن (٧٥٧ھ)، خەتی کوفی و خەتی نەسەفی و جوانکاری میلەتانی ترو جوانکاری داهێنانەکانی موسوڵمانانی تێدا جێ بەجێ کراو بوە سەرچاوەی ئەم هونەرانە) [(٣)].

بەم شێوازە قوتابخانەکان ژمارەیان زیادی کردوو بلاَو بوونەوە، مەقریزی دەڵێت: لە سەردەمی من تەنها لە قاهیرە (٦٣) قوتابخانە هەبوو، ئیبن جبیرد دەڵێت: (

---

(١) موسلم گێڕاویەتیەوە بە ژمارە (١٦٣١) .

(٢) بڕوانە: التربية عبر التاريخ من العصور القديمة حتى اوائل قرن العشرين (ل ١٠٠) .

(٣) بڕوانە: تاريخ الحضارة المصرية محمد مصطفى (ل ٥٨٨) .

٥٣ ) قوتابخانــه لــه بەغــدا هــەبوو لــه لووتکــەی جــوانی و ســەرج دابــوون. هــەر قوتابخانەیەك پەرتوكخانەی گـەورەی تێـدا بـوو لەوانـە: قوتابخانـەی (مسـتنصـریە) كتێبخانەیٚكی تێـدابوو لـەكاتی كردنەوەیـدا ژمـارەی كتێبـەكانی ٨ هـەزار كتێـب بوو.[(١)]

## چوارەم: چەند شوێنێکی تری جیاواز بۆ فێربوون.

جگە لەم چوار دەزگا سەرەكییەی فێربوون چەند شوێن و جێگایەكی تری جیاواز لەوانە كرانەوە بونە ناوەندی خوێندن بۆ زانستـخوازان لەوانە:

١- پەرتوكخانەی تایبەت.

لەبەر ئەوەی زۆربەی مەلیك و سولّتان و ئـەمیر و زاناكـان لـە پێشـدا گرینگـی زۆریــان بــە زانســت و زانســتخوازی دەدا، گشــتیان بەشــداربوون لــە كردنــەوەی پەرتوكخانەكان بۆ قوتابییان و زانستخوازان، لە هەموو شوێنێك زانستـخوازان بـە ئاسـانی تێیـدا كۆدەبوونـەوە توێژینـەوە و لێكۆڵینـەوەی زانسـتییان دەكـرد، ئـەو سەردەمە بووە چەرخی نوسین و تەئلیفات، یەكێك لـە توێـژەران دەڵێـت: (نجد فـی البلاد الاسلامیة جمیع انواع المکتبات : المکتبات العامـة المفتوحـة للجمهـور علـی اختلاف انواعة ، واجناسة، وثقافة، والمکتبات الخاصة، التی یمتلکها أفراد معنیون لخدمة اغراضم الشخصیة، والمکتبات الملحقة بالمساجد والجوامـع والـربط والخانقـاه، ومکتبات المتخصصة للدراسـات العلیـاء والمکتبـات التابعـة للمـدرس والجامعـات علی اختلاف أنواعها، والمکتبات الموجودة فی المشافی والبیمارستانات)[(٢)].

واتە: (لە وڵاتانی ئیسلامی هەموو جۆرە پەرتوكخانەیك هـەبوو: پەرتوكخانـەی

(١) بڕوانە: الدرس فی التاریخ المدارس، للنعیمی. و تاریخ علماء المستنصریة، ناجی معروف. (١ ـ ٥٥) .
(٢) بڕوانە: المکتبات فی الاسلام محمد ماهر صادة (ل٨٢).

گشتی کراوە بۆ خەڵك، بە هەموو شێواز و ڕەگەزو ڕۆشەنبیریە جیاوازەکانەوە، هەروەها پەرتوکخانەی تایبەت، ئەمەیان بۆ کەسایەتی تایبەت و کارە تایبەتەکان بەکاریان دەهێنا، هەروەها پەرتوکخانە بەستراوەکان بە مزگەوت و خانەقاو جەوامیعەکان، هەروەها پەرتوکخانەکانی دەوڵەت تەواوی خەلیفە و ئەمیر و چاکەکان دایان مەزراند بوو، وە پەرتوکخانەی تایبەت بە خوێندنی باڵا، وە پەرتوکخانەی پاشکوی قوتابخانە و زانکۆکان بە جیاوازی جۆریانەوە، پەرتوکخانە بۆ نەخۆشخانە و بیمارستانەکان).

بێگومان بوونی پەرتوکخانە لە هەموو بەش و جۆر و ناوەندەکان وای کردبوو هەموو شوێنێك قوتابخانەیەك بێت بۆ زانست و زانستخوازان. ئەم جۆرە داهێنانانە لە دروستکردنی پەرتوکخانە لە نەخۆشخانە و بیمارستانەکان تەنها لە سەردەمی زێڕینی ئیسلام هەبوو، هیچ میلەتێك ئاستی ڕۆشنبیری و گرینگیدانی بە خوێندن و زانستخوازان نەگەیشتۆتە ئەم ئاستە تەواوی بەشەکانی ژیان بکات بە شوێنی فێربوون و فێرکردن.

**٢- پەڕاوگەکان.**

یەکێکی تر لەم دەزگایانەی سەرچاوەی زانستخوازان بوون پەڕاوگەکان بوون، دەورێکی باڵایان هەبوو لە بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاری و پەروەردە، زۆرترین خزمەتیان پێشکەش بە زانستخوازان کرد، بە چاپکردن و کۆپی و ئاراستەکردنی قوتابیان و ڕێ نیشاندان و ئاشناکردنیان بە نوسراوو پەرتووکە سەردەمیەکان، زانای گەورە ئیبن نەدیم خاوەنی کتێبی ((الفهرست)) یەکێك بووە لە خاوەن پەڕاوگەکان، بۆیە پەڕاوگەکان بونە شوێنی خوێندنەوەو گوفتوگۆ و ئیرشاداتی زانستی.

**٣- خانەقاکان و ڕوکنەکانی شوینی نویژکردن (المصلی).**

مێژوی ئیسلامی زۆر بیرۆکەی جیاوازی تیایدا هەڵکەوتووە یەکێك لەوانە بیری

صوفیگەریەتیە، ، بەلاّم هیچیان دانەبڕاون لەزانست و زانیاری و فیربوون، خانەقا وشەیەکی فارسیە بو شوێنی خواپەرستی یان شوێنی خۆحەشاردانە بەرامبەر دوژمن بەکار دێت، بەلاّم ئەم خانەقایانە لەکاتی ئارامی و نەمانی جەنگ لەگەڵ دوژمن بووەتە سەرچاوەی سەرەکی بۆ فێربوون و فێرکردن، هەروەها لەبەر زۆر نوێژخوێنان لە هەموو ولاّتێکی ئیسلامی و شارەکان زۆرترین نوێژگا دروست کراوە، هەموو نوێژگایێکیشی چەند سووچێکی هەبوو تایبەت کراوە بە خوێندن و فێربوون، دەوری سەرەکییان بینیوە لە پێگەیاندن و خزمەتی زانستی و زانستخوازان.

لە کۆتایی بینیمان دەزگای زانستی شەرعی و گرینگیدان بە زانستخوازان لە سەردەمی زێریندا چەند جۆر و شێوازی جیاواز بوون، ئەوقافەکان زۆرترین خزمەتیان بە فێرگە و زانستخوازان کردووە، سەردەم سەردەمی ململانێی پێگەیاندن و زانستخوازی بووە , رووحی ((اسلام)) و پەیام لەگەڵ هەموو بوارەکانی زانست تێکەڵ کراوە ، بەم رووحە پڕ لەخزمەتە ئیسلامیانە چرایی رووناکیان بۆ مرۆڤایەتی هەڵکردووە، زانستیان گەیاندۆتە لووتکە، هەر کات زانست و زانستخواز گەیشتە پێشەنگ ئەوە میللەت و ئومەت پێشەنگی گەلان دەبن لە هەموو رویەکەوە، واتا لە تەواوی لایەنەکانی ژیان .

## زانستخوازان چۆن بینای مەعریفەو زانست و زانیاری خۆیان داڕیژن؟

بۆ چارەسەری هەر بابەتێکی بینای مەعریفی پێویستمان بە دیاریکردنی گرفتەکە هەیە، لە پێشدا زۆرترین گرفتی فێربوونمان باس کرد کە بوونەتە هۆکار بۆ شکستی گەیاندنی پەیامی ئیسلام و دواکەوتنی کۆمەڵگاو هەڵنەستانەوەی ئوومەت، ئاماژەمان بەوەکرد کە فێربوون سەرچاوەی سەرەکی هەموو هەستانەوەو

ئاوەدانکردنەوەیەکە، لەم بەشە پێویستمان بە چارەسەری بابەتەکە هەیە بە واتا چۆن چارەسەری ڕێڕەوی خوێندن و فێربوون بکەین تا پەیامی خۆی بگەیەنێ، یان زانستخوازان چۆن بینای مەعریفەو زانست و زانیاری خۆیان دارێژن؟ بێگومان سەرەتای چارەسەری ئەم گرفتە لەڕێڕەوی خوێندن و فێربوون دەبێت بە بینای مەعریفە دەست پێبکەین، واتا پێویستمانە بزانین چۆن بینای مەعریفە بکەین زانست بەتەنها چارەسەری کۆمەڵگای بۆ ناکرێ و توانای هەستانەوەی ئوممەی نییە بەبێ مەعریفە. بۆ ئەم مەبەستە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەو بنەماکان تا بزانین پەیوەندییان بە مەعریفەو زانست و فێربوون چییە.

## سەرچاوەی سەرەکی بینای مەعریفە نیگایە (الوحی).

سەرچاوەی تەواوی زانست و زانیاری دەگەڕێتەوە بۆ وەحی ئەگەر بگەڕینەوە بـۆ مێژووی سـەرەتای دروستـبونی مروڤایـەتی، کـە باکمـان ئادەمـە دەبیـنین لەگـەڵ دروستبوونی یەکەم مرۆڤ لەسەر زەوی بنەمای زانست و مەعریفەی بۆ دارێـژراوە و تەواوی زانستەکانی فێرکرا: ﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ﴾ [١]. واتـە: (خـوای گەورە هەموو ناوەکانی فێری ئادەم کرد)

شیخ الاسلام ئیبن تیمیە دەفەرموویێت: ( "المعرفة المكتسبة من الوحي معرفة يقينية مطلقة ذلك أن الوحي بصفته جزءًا من علم الله له ما لهذه الصفة من كونها حقيقة مطلقة غير محدودة، ودلالة الوحي في إفادة المعرفة الدينية دلالة شرعية سمعية وعقلية) [٢]. واتە: مەعریفەو زانیاری وەدەستهاتوو لەوەحی مەعریفەیەکی یەقینیە و ڕەهایە، چونکە وەحی بەشێکە لەزانستی خودا کەواتـە وەحـی ئـەم صـیفەتەی هەڵگرتووە کە راستیەکی ڕەهایەو بێسنورە، بەڵکەداری وەحی بو زانسـتی ئـایینی زانستیکی شەرعی و عەقڵیە). سەرچاوەی مەعریفە لەلای مادیەکان تەنها ئەوانەن کە بەجیهازە هەستیارەکان هەستیان پێ دەکرێ، یان عـەقڵ دەرکیـان پـێ دەکـات، بەڵام لەلای ئیمەی موسڵمان جگە لەم دوو سەرچاوە کـە زۆر گـرنگن و نیعـەتێکن بەمرۆڤـەکان دراوەو مروڤـی لەتـەواوی بونـەوەر جیاکردووەتـەوە، سەرچـاوەیەکی ئەساسی بـۆ راسـتکردنەوەی هەڵـەی ئەمانـە یـان دەرك نـەکردنی هەنـدێ زانسـت

---

(١) سورەتی البقرە ئایەتی ٣١ .

(٢) بڕوانە: مجموعة الفتاوی ابن تيمية، (١٣ – ١٣٦).

کەناتوانن درکی پی ببەن ئەویش وەحی خودایی کە بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێ لە مەنهەجی زانستی و مەعریفی و فێربوون جیابکرێتەوە، بەڵکوو تەواوی زانست و زانیارییەکانی بەستراوەتەوە بەم ئەصلە. هەر زانستێك بەدەست دێنێ بەهۆی ئیجتهادات و عەقڵەوە دوور بێ لە پێوەرەکانی وەحی و تەنها پشتی بە عەقڵ بەستبێ ئەوە لاڕێ دەبێ، ئاوڕێك لە تیۆریە بەشەرییەکانی سەدەی ڕابردوو بدەینەوە لەبیردوزو تیۆریەکانی داروین و نیتشە و دورکاریم و فرویدو هیکل و تەواوی تیۆریەکان بەهۆی ئەم زانست و تیۆریە مەعریفیانە زوڵم و ستەم و نا دادگەری وخوێنڕشتن و مرۆڤکوژییان بەرهەم هێنا، جیهانیان پڕ لە ئاگر و ئاسن کرد ، تەواوی لایەنەکانی پەیوەندییان بە مرۆڤ هەیە شێوان و لەسەر بنەمای سروشتی و خزمەتی مرۆڤایەتی لایەندا. زانستەکانی مرۆڤ پەیوەستە بە توانای کەسەکە و زەمان و مەکانێکی تایبەت و سەردەمێکی تایبەت، مرۆڤ ناتوانێ چارەسەری داهاتووی خۆی بکات، نازانێ گرفتەکانی زەمان و مەکانێکی تر چییە و بەچی چارەسەر دەکرێ، توانای عەقڵی وەك باقی بەشەکانی تر سنووردارە و بێسنوورنییە.

تەنها شتە بینراوەکان دەبینێ و لە پەنهانەکان بێ ئاگایە ﴿ يَعْلَمُونَ ظَٰهِرًا مِّنَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ ٱلْءَاخِرَةِ هُمْ غَٰفِلُونَ ﴾ (١)، واتە: (تەنها ئاگادارن بە ڕووکەشی ژیانی دونیا و بێ ئاگان لە باسەکانی ڕۆژی دوایی).

لە جوگرافیایەکی تایبەت دەتوانێ بیردۆز دابڕێژێ نەك بۆ هەموو جۆر و ڕەنگ و شێواز و تاکە جیاوازەکان کاریگەری ژینگەی و جوگرافیا و قەوم ودەوڵەمەندی و فەقیری و هێز و فاکتەرەکانی تری لەسەرە، بەڵام وەحی لە پێش زەمان و مەکانە و

(١) سورەتی الروم ئایەتی ٧ .

پێویستی بە کەس نییە و هیچ جۆرە فاکتەرێك ناتوانێ کاری تێبکات و زانیاریەکانی بە ڕێژەی ١٠٠٪ تەواوو یەقینی و بێسنوورن لە ئاشکرا و پەنهان ئاگادارە. بۆیە مرۆڤ لەگەڵ وەحی بە ئاسانی دەتوانێ باشترین زانیاری بەدەست بهێنێ چاکترین چارەسەر بۆ تەواوی گرفتەکانی ژیان بدۆزێتەوە، عەقڵیش بە تێگەیشتن لە وەحی ڕێگای ڕاست و دروستی خۆی دەگرێتە بەر.

## چۆن بینای مەعریفی بکەین لە ڕێگەی وەحی

کاتێك دەڵێین وەحی واتا قورئان و کەلامی خوای گەورە: ﴿ لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦۖ تَنزِيلٞ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٖ ﴾ [(١)]. واتە: (هیچ ناحەقی و نادروستی و ناتەواویەك ڕووی تێ ناكات لە هیچ کاتێکدا و لە هیچ لایەکەوە, ڕەوانەکراو و نێردراوی زاتێکە کە خاوەنی حیکمەت و داناییە و شایەنی سوپاس و ستاییشە).

ئەوقورئانەی، کە حەقی ڕەهای لایە:﴿ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُمۡتَرِينَ ﴾[(٢)]. واتە: (ڕاست ئەوەیە کە بۆت هاتووە ئەی محمد لە لایەن پەروەردگارتەوە کەواتە لە گوماندااران مەبە).

تەواوی پەیرەوانی کتێبە ئاسمانییەکان دەزانن کە تەنها ئەم قورئانە حەقە: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡلَمُونَ أَنَّهُۥ مُنَزَّلٞ مِّن رَّبِّكَ بِٱلۡحَقِّۖ ﴾ [(٣)]. واتە: (ئەوانی کە نامەمان پێبەخشین سوور دەزانن بێگومان ئەم قورئانە لە لایەن پەروەردگارتەوە بە حەق و ڕاستی نێردراوە).

(١) سورەتی فصلت ئایەتی ٤٢ .
(٢) سورەتی البقرە ئایەتی ١٤٧ .
(٣) سورەتی الأنعام ئایەتی ١١٤ .

ڕێگەی ڕاست و دروستی مەعریفی و زانستە : ﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ ﴾ (١). واتە: (بەڕاستی ئەم قورئانە ڕێنموونی دەکات بۆ ڕێباز و بەرنامەیەك کە ڕاستترینە).

بۆ سوود وەرگرتن لە وەحی یان چۆنیەتی بیناکردنی مەعریفی خۆمان لە وەحی پێویستە بابەتەکە پۆلێن بکەین، هەندێك جار وەحی زانیاری تەواو و قەتعیت دەداتێ، بوار بۆ مرۆڤ ناهێلێتەوە تا قسەی تێدا بکات، واتا لە سنوری توانای مرۆڤەکان نییە جاری واش هەیە مەجال بۆ مرۆڤەکان دەهێلێتەوە و ئیجتیهادی تێدا بکەن لە چوارچێوەی ئاماژەو لێکۆڵینەوە بگەنە ئەنجام .

## بەم چەند خاڵە پۆلێنی سوود وەرگرتن لە وەحی دیاری دەکەین

١- جاری واهەیە وەحی زانیاری مەعریفیەکی یەقینی تەواوت دەداتێ لەسەر بابەتێك مرۆڤ تەنها بۆی هەیە وەری گرێ و تێی بگا و قبووڵی بکات، بێ ئەوەی پێشتر هیچ زانیاریەکی لەسەر هەبێت واتا عەقڵی مرۆڤەکان لەم جیهانە هیچ دەورێکیان نییە ناتوانن قسەی تێدا بکەن، یان وەلاَمی پرسیارەکانی بدەنەوە، یان بگەنە ڕاستییەك جێگای قبووڵ بێت، وەحی دوو جیهان لێك جودا دەکاتەوە، ناوی ناوە جیهانی پەنهان و جیهانی بینراو، ئەم زانست و مەعریفیانەی باسی جیهانی پەنهانە مرۆڤ لێی بێ ئاگایەو مەجالی لێکۆڵینەوە و بە دواداچوونی بۆ نییە، ( ٤٨) جار وشەی غەیب هاتووە وەك خوای گەورە دەفەرمووێ:﴿ وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ ﴾ (٢). واتە: (کلیلی هەموو نهێنییەکان هەر لای خوایە و کەس نایان زانێ).

---

(١)سورەتی الإسراء ئایەتی ٩ .

(٢) سورەتی الأنعام ئایەتی ٥٩ .

﴿ فَقُلۡ إِنَّمَا ٱلۡغَيۡبُ لِلَّهِ ﴾ [(١)]. واتــە: (بلّــێ بێگومــان زانینــی نهێنییــەکان تایبەت بە خوایە).

تەنانەت پێغەمبەرانیش شارەزاییان نییە لە سەر جیهانی پەنهان تەنیا ئەوانەی خودا پێی فەرموون ﴿ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٖ ﴾ [(٢)] . واتە: (هەر خوا زانایە بە نهێنییەکان و کەس ئاگـادار ناکـات بەسەر نهێنییەکانی تەنها ئەوانە نـەبێ کـەخودا لێیـان رازیـەو زانیاریـان لـەبارەی غەیبەوە دەداتێ).

ئەم ئایەتانە زانیاری تەواومان پێـدەدەن لـە سـەر جیهـانی پـەنهان و تـەواوی پرسیارە فەلسەفیەکانی مرۆڤ دەتوانن لێرەوە وەلاّم بدەنەوە، بێگومان مروڤ ناتوانێ تەنها بە عـەقلّ وەلاّمـی سـێ پرسـیارە فەلسـەفیەکەی دەسـت بکـەوێ، تـەواوی تیۆریەکان جگە لە وەحی ناتوانن هیچ زانیاری و زانستێك ببەخشن یـان وەلاّمێـك بۆ راستییەکان وەرگرن. ژیانی دوای مردن کە پێك هاتووە لە قەبروو زیندوو بونەوە و لێ پێچینەوە و پاداشت و سزاو بەهەشت و جەهەنەم و تەواوی زانست و زانیاری پەیوەست بە ژیانی دوای مردن تەنها لە ڕێگەی وەحیەوە دەست دەکەوێت، هـەموو تییۆرو بیردۆزەکان لەم بابەتـە بـە هەلّـە داچـوون نـەیان توانیـوە وەلاّمیـان دەسـت بکەوێ .

**٢ـ** هەروەها وەحی کۆمـەلّێك زانست و زانیاری تەشریعی و ئەخلاقی دەدات بە مرۆڤەکان بۆ ڕێکخستنی ژیانیان، لە مـەبادئی و فەرمانــکردن و قەدەغەکردنـدا، مرۆڤ بۆی نییە ئیجتیهـادی تێـدا بکـات تـەنها لەسـەریەتی حێبـەجێیان بکـات و

---

(١) سورەتی یونس ئایەتی ٢٠ .

(٢) سورەتی الجن ئایەتی ٢٦ .

قبووڵی بکات، بۆ ڕێکخستنی جووڵەی ڕۆژانەی لەگەڵ خۆی و خەڵکدا، لادان لەم پێوەرە تەشریعیانە زیانی زۆر گەورە بە کۆمەڵگا دەگەیەنێ، کاریگەری نەرێنی لەسەر مرۆڤەکان دروست دەکات، چونکە وەحی هەر زانیاریەك بدات لە بارەی تەشریعەوە تەنها بەرژەوەندیە بۆ مرۆڤەکان و دورخستنەوەی خراپەیە لێیان .

٣ـ هەروەها وەحی چوارچێوە و پێوەری داناوە بۆ زۆر لایەنی جیاواز، یەکێك لەوانەش مەنهەجی پەروەردەو فێرکردنە، کە وەحی بە چوارچێوەیەکی قەتعی قسەی لەسەر نەکردووە تا مەجال بۆ مرۆڤەکان نەهێڵێتەوە بەڵکوو مەجالێکی فراوانی بە مرۆڤەکان داوە، تا باشترین ڕێگا و چاکترین شێواز هەڵبژێرین بۆ پێگەیاندن و تێگەیاندن، چ یاسا و پێوەرێك دەبێتە هۆی ئاوەدانکردنەوەو زیادبوونی زانست و مەعریفە و ڕۆشەنبیری بەرچاوکردنی پێوەرەکان دەتوانن گەشەی پێ بدەن و کۆمەڵگای پێ سەربخەن تا ئەمن و ئارامی و شارستانیەت بەرپا دەکەن.

## پەیوەندی وەحی بە زانستە جۆراوجۆرەکانی مرۆڤ

پەیوەندی وەحی بە زانستە مرۆییەکان پەیوەندیەکی هەمەلایەنە و هەمەجۆرە، گرینگی پەیوەندی وەحی بە زانستە مرۆییەکان لەوەدایە بە هەردووکیان چارەسەری کێشەکانی مادی و مەعنەوی و ئەخلاقی و جیهانی مرۆڤ دەکەن، بۆ هەر ڕەهەندێك لەم ڕەهەندا وەحی دەوری بالای هەیە و یاسا و پێوەری بۆ داناوە، مرۆڤیش بە لێکدانەوە و بە دوادا چوون لە وەحی زانستەکان بەفراوانی و هەمەلایەنی بەرهەم دێنێ، وەحی لە چەند ڕوویەکەوە کار ئاسانی دەکات تا مرۆڤەکان بتوانن لەم چوارچێوەیە زانستی فراوان بەرهەم بهێنن لەوانە:

١ - مرۆڤ بە بێ وەحی لەم چوارچێوەی مادی ڕووت دەمێنێتەوە، ناتوانێ لە بازنەی ڕۆحیانەت و دەروون زانستی خۆی فراوان بکات، وەحی بەهۆی فراوانی و

گشتـگیری خـۆی زانیاریـەکی زۆر لـە ڕوی ڕوحیانیـەت و دەروونـی بـە مرۆڤـەکان دەدات ئەمەش دەبێتە دەرگایەکی زانستی و مەعریفی فراوان بە و مرۆڤ و زانستە مرۆییەکان، تا مرۆڤ لە جیهانی مادیەت بپەڕێتەوە بۆ هەردوو جیهان واتە مادی و مەعنەوی و یان ڕوحی.

٢- وەحی مرۆڤەکان ئازاد دەکات لە لێکدانەوەیەکی ڕووتی مادی بۆ بونـەوەرو مرۆڤ و ژیان و کۆمەڵگا، ئەم لێکدانەوەیە سەری کێشـاوە بـۆ بێبـاوەڕی و ئیلحـاد لێرەدا زانستەکانی وەحی تێروانینێکی درووسـت بـۆ مرۆڤـەکان درووسـت دەکـات تاوەکو ببێتە خاوەنی زانست و مەعریفەی ڕاست بـۆ ژیـان و کۆمـەڵگاو بونـەوەرو مرۆڤ.

٣- زانستە مرۆییەکان کاریگەری ئایـدۆلۆژیاو ئینتیمـای کەسـی و قـەومیاتی لەسـەرەو لـە ڕێـڕەوی ڕاسـتی خـۆی لایانـداوە، بنـەماکانی ڕاسـتی و ئەمانـەت و بەرپرسیاریەتی و ڕاستگۆییە لە وەحی دا زانستە مرۆییەکان دەخاتەوە سەر ڕێگای ڕاسـتی زانسـتی و مەعریفـەوە، ئەمـەش لـەژێر چـەتری تەوحیـد و یەکتاپەرسـتی دەبێت.

٤- زانستە مرۆییەکان بەگشتی جیاکاری دەکات لەنێوان لێکۆڵینەوەی زانستی ڕووت و بەها و، ئەمەش زۆر جار وادەکات زانستەکان ببن بە نەهامەتی و ناخۆشی بۆ مرۆڤ، بەڵام بە پێوەری وەحی هـەموو زانسـت و مەعریفەیـەك گـرێ دراوە بـە بەهاو قیەم و ئەخلاق.

٥- هیچ زانستێکی مرۆیی نییە کاریگـەری کۆمـەڵگاو واقیعـی لەسـەر نـەبێ زۆرجـاریش کۆمـەڵگاو واقیـع لایـداوە لـە ڕێـڕەوی خـۆیی و نـەگۆڕو گۆڕاوەکـانی (الثوابت والمتغیرات)ی تێکەڵ کـردووە، بـەم جـۆرە کۆمەڵگایـەکی خـراپ و فاسـد بەرهەم دێت لە بری کۆمەڵگایەکی تەندروست و سـاغ، بـەڵام پێـوەری نیگـا داد و

حەق و ڕاستی دەبێتە پێوەرو میزان بۆ هەڵسەنگاندنی تەواوی زانست و مەعریفە مرۆییەکان.

**وەحی کۆمەڵێك زانیاری ورد دەدات بە مرۆڤ لە زۆر لایەنەوە، کەمرۆڤ لێیان بێ ئاگایەو ناتوانێ بەبێ وەحی ئەم زانستانە بەدەست بهێنێ لەوانە :**

١- وەحی زانستێکی وردی مێژویی لە بارەی مرۆڤەکانەوە دەدات لەبارەی سەرەتای دروستبوونی مروڤەکان و هەروەها داهاتوویان، ئەم زانست و مەعریفەیە کەوەحی دەیدات تەواو راست وحەتمیە و هیچ گومان هەڵناگرێ، سەرچاوەی زانستەکەش خودای گەورەیە پێمان دەڵێ چی ڕوویداوەو چ ڕوودەدات لە ڕابردوو لە داهاتوودا وەك: ﴿ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيْهِم بِعِلْمٍ وَمَا كُنَّا غَائِبِينَ ﴿٧﴾ ﴾[(1)]. واتە: (سوێند بە خوا ئەوەی کردوویانە بۆیان دەگێڕینەوە، ئێمە هیچ بێ ئاگا نەبووین لێیان).

﴿ قَالَ فَمَا بَالُ الْقُرُونِ الْأُولَىٰ قَالَ عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي فِي كِتَابٍ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى ﴾[(2)]. واتە: (فیرعەون وتی ئەی خەڵکانی پێشوو حاڵیان چۆنە, موسا فەرمووی زانیاری ئەوە لای پەروەردگارمە لە پەڕاوێکدا و هیچی لێ ون نابێ و هیچی لە بیر ناچێ).

﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنبَاءِ الْقُرَىٰ نَقُصُّهُ عَلَيْكَ مِنْهَا قَائِمٌ وَحَصِيدٌ ﴾[(3)]. واتە: (ئەوەی باسکراوە بۆت چەند هەواڵێك لە شارەکانی پێشوو ئێمە بۆت دەگێڕینەوە هەندێکیان ماون و هەندێکیان نەماون).

---

(١) سورەتی الأعراف ئایەتی ٧ .
(٢) سورەتی طه ئایەتی ٥١ - ٥٢ .
(٣) سورەتی هود ئایەتی ١٠٠ .

﴿ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ ﴾[١]. واتە: (هەمووت بۆ دەگێڕینەوە لە هەواڵی پێغەمبەران).

﴿كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ مَا قَدْ سَبَقَ ۚ وَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ مِن لَّدُنَّا ذِكْرًا ﴾[٢].

واتە: (ئەی محمد بەو جۆرە بەسەرهاتی گەلانی ڕابردووت بۆ دەگێڕینەوە, بێگومان لە لایەن ئێمەوە قورئانت پێدراوە).

ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە وەحی سەرچاوەیەکی زانستی و مەعریفی زۆر گرنگە لەڕووی مێژووییەوە بۆ پەرەپێدانی زانستەمرۆییەکان لە ڕووی سیاسی و فەرهەنگی و کۆمەلأیەتی و پەروەردەیی و فێرکردن و ئەخلاقی نابێ زانستخواز لێی بێ ئاگا بێ.

٢- وەحی زانیاری و مەعریفەیەکی فراوان و زۆر لە ڕووی عیبادات و خواپەرستیەوە دەدات بە مرۆڤەکان، هەروەها مللملانێی نێوان بیروباوەڕی ڕاست و هەڵە، حەق و باتل، بەڕوونی باس دەکات، لەگەڵ جۆری خوداپەرستی ڕاست وەك نوێژ و ڕۆژوو تەواوی خوداپەرستیەکانی تر.. هەروەها پەرستنە هەڵەکانیش ڕوون دەکاتەوە وەك ئەستێرەپەرستی و مانگ و خۆر و پەرستراوە دروستکراوەکانی تر.

٣- وەحی کۆمەڵێك زانیاری و مەعریفە دەدات بە زانستە مرۆیەکانەوە، لەبارەی نەریت و تەقلید و تەشریعات و خراپەکاریەکانی ئومەتانی پێشوو، هەموو باس و بەسەرهاتی ئەوانی تومارکردووە، وەك زانیاری بۆ ئێمەی گواستووەتەوە، تالێی دوور کەوینەوە، وەك کردەوەی قەومی لووت و کوشتن و بڕین و منداڵ لە ناوبردنی قەومی بەنی ئیسرائیل ، ئەم کردەوانە هەڵەن و نابێت میللەتان دووبارەی بکەنەوە لەژێر هەر ناوێکی زانستی بێت.

(١) سورەتی هود ئایەتی ١٢٠ .

(٢) سورەتی طه ئایەتی ٩٩ .

٤- وەحی کۆمەڵێك زانیاری و مەعریفە ئاشکرا دەکات لە ئومـەتانی پـێش و لە بارەی زیندەبەچاڵی منـداڵان و ژن کوشـتن و بـە کۆیلـەکردنی مـرۆڤ و سـتەم و بێـڕێزی و مامـەڵکردن بـە مرۆڤـەوە، ئەمـەش زانیـاری وردە بـۆ دوورکەوتنـەوەی زانستە مرۆیـیەکان لەم خراپەکاری و کارە نا شارستانیانە.

٥- وەحی کۆمەڵێك زانست و مەعریفەی ورد دەدات بە زانستە مرۆیـەکان لـە بارەی یەکەم مرۆڤ، درووستبوونی و شێوازی لاشە و ڕوحی ، کەسایەتی و کرداری، زانست و زانیاری سەرەڕای ئەمانـە زانیـاری وردی داوە، کـە یەکـەم مـرۆڤ لەسـەر زەوی مرۆڤێکی خاوەن زانست بووە ، پێغەمبەر بـووە، کـاری سـەرەکی جێنشـین و خەلیفـەی سـەر زەوی و ئـاوەدان کردنوەوەیـە . واتـا مـروڤ هـاتووە بـۆ بینـای شارستانیەت و پیشکەوتن و زانستخوازی.

٦- وەحـی زانیـاری و مەعریفـەی کۆمەلآیـەتی داوە بـە مروڤـەکان تـا ژیـانی کومەڵایەتی پیٚ ڕێك بخەن، کە مرۆڤ هاتووەتە سەرزەوی تەواوی ژیانی بۆ فەراهـەم کـــــراوە: ﴿ أَلَمۡ تَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَأَسۡبَغَ عَلَيۡكُمۡ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةٗ وَبَاطِنَةٗۗ ﴾ (١) . واتە: (ئایا نەتان زانیوە، کە بەڕاسـتی خـوا ڕامـی هێناوە بۆتان ئەوەی لە ئاسمان و زەویدا هەیە نیعمەتەکانی بە فراوانـی ڕشـتووە بـە سەرتاندا چ ئاشکرا و چ پەنهانە).

هەروەها هەر لە سەرەتاوە تیۆرو بیردۆزی ئەنسرو و پۆلۆجیەکان رەت دەکاتەوە کەدەڵێن مرۆڤ بۆ خۆی سیستەمی ژیانی ریٚك خستبیٚ، بەڵکوو بۆ هەر سـەردەمەو زەمـــەنێك خـــودا پێغەمبـــەرانی نـــاردووە کیتـــاب و تەشـــریعی بـــۆ نـــاردوون: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡۖ ﴾ (٢) .

(١) سورەتی لقمان ئایەتی ٢٠ .
(٢) سورەتی إبراهیم ئایەتی ٤ .

واتە: (هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە مەگەر بە زمانی گەلەکەی نەبێت بۆ ئەوەی ئایینەکەیان بۆ ڕوون بکاتەوە).

٧- لە بارەی گەشەسەندنی کۆمەڵگای مروڤایەتی وەحی زانیاری و مەعریفەی وردی داوە بە زانستە مرۆییەکان، زانایان و فەیلەسوفەکان لە بارەی گەشەسەندنی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دەیان بیردۆز و تیۆری جۆراوجۆریان باس کردووە بە هەڵەو دوور لە پێوەری زانستی! زۆربەی بیردۆزەکان لەم بارەیەوە تێك دەگیرێن (بیردۆزی داروین، سروشت، کونت) هەموویان شکستیان هێنا، کاتێك دەگەڕێینەوە بۆ وەحی و زانست ومەعریفەکان لە بارەی کۆمەڵگای مروڤایەتی بۆمان دەردەکەوێ تەواوی ململانێکانی مرۆڤایەتی لەسەر بنەمای ئایدۆلۆژیا و ئایین بوونە، واتە لە نێوان ڕاست وناراست ،حەق و باتیل،یەکتا پەریستی و هاوبەش دانان، دادگەری و زوڵم، ئەمانەش لەڕێی پێغەمبەرانەوە گەیانراوە بە خەڵك و کۆمەڵگا تەواوی شۆڕش و هەستانەوە و دادگەری و حەق و ڕاستی بەسەرپەرشتی پێغەمبەران کراوە، کۆمەڵگاکان ئاراستە کراون لەلایەن پێغەمبەران ، بۆ ڕێخستنی ژیان و گەشەی کۆمەڵایەتی و بەرپاکردنی شارستانیەت و ئاوەدان کردنەوەی ژیان.

لە کۆتاییدا ئەم هەموو زانست و زانیاری و مەعریفەو فێربوونە سەرچاوەکەی لە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرمانە، کەچی زۆرینەی زۆری بەتایبەتی لە سەردەمی عەولەمە سەرسام بوون بە جیهانی ئەوروپی لەم سەروەتە زانستییە بێ ئاگانە، زانستخواز بۆ بینای مەعریفە و زانستی خۆی ناگەڕێتەوە بۆ سەر قورئان لە کاتێکدا تەواوی زانستە مرۆییەکان لە قورئاندا بنەمای سەرەکی و چوارچێوەی فراوانی بۆ داڕێژراوە تاوەکو زانستخواز بە وردی لێی بکۆڵێتەوە گەوهەر و مرواری و کەنزەکانی لێ دەربێنێ ، قورئان زانستی بوارەکانی کومەڵایەتی و فکری سیاسی و ئیداری و فەهەنگی و پەروەردەیی و فێرکردن و دەروونناسی و فکرو فەلسەفەو

پیشەسازی و کشتوکاڵ و تەواوی زانستەکانی تری بەشیوەکی یاسا داڕێژراو باسکردوە، بەشێوەیەکی گشتی لەهەر بوارێك لەم بوارانە زانستخواز دەتوانی زانست و مەعریفەی خۆی تێدا زیادو فراوان بکات..

## تایبەتمەندییەکانی وەحی

لە پێشدا وەحیمان وەك سەرچاوەی یەکەم و سەرەکی باس کرد بۆ بینای مەعریفەی زانستخوازان، پێویست دەکات بەکورتی تایبەتمەندیەکانی وەحی باس بکەین تا زانستخواز بزانێت ئەم زانست و زانیاریەی لە ڕێگەی وەحی خودایی بەدەست دەهێنێ یەقینی و تەواو و بێ وێنەیە.

**١- وەحی سەرچاوەکەی خودایە:**

ئەم زانستەی لە وەحی خودایی وەردەگیرێ جێگیرو ڕاست و دروستە، بە ڕێگەیەکی تەواو گەیشتۆتە دەستی مرۆڤەکان، خودای گەورە پارێزبەندی کردووە: ﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾[1]. واتە: (ئێمە ئەم قورئانەمان دابەزاندووە و هەر ئێمەش دەیپارێزین).

بووەتە پێوەر بۆ هەڵبژاردە ڕاستەکان قابیلی هەڵە نییە، زانستەکانی بە مرۆڤ دەبەخشێ لە بارەی مێژوو، فکر، زانست، فەلسەفە، پەروەردە، فێرکردن، فەرهەنگ، بوارەکانی کۆمەڵایەتی و تەواوی بەشەکانی تر لە لایەن خوداوە داڕێژراوەو هیچ گومان و دوودڵی تێدا نییە.

**٢- وەحی و بوارە پەنهانەکان:**

مرۆڤ بە سروشتی دروستبوونی توانای تەواوی هەستەکانی بە عەقڵیشەوە سنووردارە، واتا ناتوانێ دەرك بە هەموو شتێك بکات، هەروەها لە توانای

---

(١) سورەتی الحجر ئایەتی ٩ .

مرۆڤدانیه هیچ زانیارییەك لەسەر شتە پەنهانەکان بەدەست بهێنێ، بۆیە یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی وەحی پێدانی زانستە لە بوارە پەنهانەکان، بۆ ئاوەدانـکردنەوە و هەستانەوە و شارستانیەت مرۆڤ پێویستی بە زانستە پەنهانـەکانیش هەیـە، تـەنها وەحی دەتوانێ ئەم زانستە بە مرۆڤ ببەخشێ.

**٣- وەحی فەرمانێکی کامڵ و نەمرو هەتاهەتاییە.**

لەبەر ئەوەی مرۆڤ کوڕی ژینگە و سەردەمی خۆیەتی زانستەکەشی بۆ سەردەمە و کاتێـکی دیاری کراوە، بۆیە بەردەوام زانست لە هەڵکشان و داکشـانە، زانسـتی (١٠٠) ساڵی پێش و بۆ ئەمڕۆ ناگونجێ، بەڵام زانستی وەحـی کامـڵ و نـەمرە بـۆ هەموو زەمان و مەکانێکە، بۆ تەواوی سەردەمەکانە، تا ئێسـتا زانسـتی سـەردەم نەیتوانیوە ڕۆژێك لە ڕۆژان زانستێکی قورئانی بە درۆ بخاتـەوە! یـان تێکـگیرانێك لەگەڵ زانستی سەردەم درووست ببێت. ئـەم زانسـتەی کـە وەحـی بـە مرۆڤـەکانی دەبەخشێ لە لایەن زاتێکەوەیە ئاگاداری جیهانی بینراوو بیسـتراو و پەنهانەکانـە، ئاگاداری ئێستاو داهاتوو پێشووە، ورد و درشت، زۆر و کەمە: ﴿ أَلَا يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ﴾[1]. واتە: (ئایا خوا نازانێ کێی دروست کردووە و ئەو وردبین و زانایە).

**٤- زانست و مەعریفەی وەحی هاوسەنگ و جێگیرە.**

هەموو زانستێکی مرۆڤ کاریگەری ژینگە و جۆرێك لە لایەنگیری و تەرەفـگیری لەسـەرە، تـەنها ئـەو زانسـتەی لەلایـەن خوداوەیـە لایـەنگیری کـاری تێناکـات و پێویستی بەکەس نییە: ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَـٰلَمِينَ ﴾[2]. واتە: (بە ڕاستی خوا بێ پێویستییە بە جیهانیان).

---

(١) سورەتی الملك ئایەتی ١٤ .

(٢)سورەتی آل عمران ئایەتی ٩٧ .

له كاتی داڕشتنی شـەریعەت بـۆ مرۆڤـەكان، لـە كـاتی بەخشـینی زانسـت بـە زانستخوازان، هاوسەنگی ڕادەگرێت لە نێوان بوونەوەرو ژیان و مـرۆڤ و كۆمـەڵگا، هیچ لایەنداریەك ناكات، لەسەر حیسابی تاك زەرەر بـە كۆمـەڵگا نـادات، لەسـەر حیسابی دەوڵەمەند زەرەر لە هەژار نـادات، بـەش و پشـك و مـاف و تایبەتمەنـدی تـەواوی تاكـەكان دەپـارێزێ، جـێگیرەو گۆڕانكـاری بـە پەلـەو ناتەندروسـتی لێ ڕوونادات.

**٥- وەحی مەعریفەو زانستەكانی كرداری و ئەرێنین.**

زۆرێك لە پرنسیپ و یاسا دەستكردەكان لە زانكۆ و پەیمانگاكان دەخوێندرێن نا كـرداری و نـەرێنین، لـە شـێوەی خـەیاڵی و نـەزەری باسـكراون، ناچـنە بازنـەی جێبەجێكردن، یان ناتواندرێ جێبـەجێ بكرێـت لـە بـواری عەمـەلی، زانسـتەكانی وەحی هیچ جۆرە بیرۆكەیەكی تێدا نییە نەچێتە بواری جێبەجێكردن، یان لە بازنەی (مەحاڵ) بێت، هەروەها زانستەكان هیچ حاڵەتێكی نەرێنیان نییە بۆ مرۆڤ، كەچی بەشێك لە زانستەكانی مرۆڤ دایانـڕشتووە بوونەتە دەردو ناخۆشی و نەهامـەت بـۆ مرۆڤایەتی و كۆمەڵگاو تەنانەت ژینگەش.

**٦- وەحی ڕێگایەكی تایبەت مەندە.**

وەحی تایبەت مەندە بەو كەسانەی خوا هەڵی بژاردوون، پاراستوونی لە هەڵە و ئامادەی كردوون بۆ هەڵگرتنی پەیامەكەی خۆی، كەواتـە هـەموو مرۆڤـەكان یـان بڵێن عامەی خەڵك ناگاتـە ئاسـتی وەحـی تـەنیا پێغەمبـەران نـەبن، (صـەلات و سەلامی خوایان لەسەر)، بەڵام لـە ڕێـی پێغەمبەرانـەوە ئـەم زانسـت و زانیاریانـە دەگەیەندرێنە تـەواوی مرۆڤایـەتی: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا

وَنَـٰذِيرًا ﴾ [(١)]. واتـه: (ئێمـه تۆمـان نـاردووه ئـەی محمـد بـۆ هـەموو خـەڵکی مژدەبەخش و ئاگادارکارەوە).

هــەروەها: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ ﴾ [(٢)]. واتە: (ئەی پەیامبەری خوا ئەوەی لە لایـەن خـواوە بـۆت هـاتووە بیگەیەنە, ئەگەر وانەکەی بێگومان پەیامەکەیت نەگەیاندووە).

بەم پێوەرە تەواوی مرۆڤایەتی بەتایبەتی زانستـخوازان زانست و مەعریفـە لـە ڕێی پێغەمبەرانەوە وەردەگرن.

### ٧- وەحی مەبەست و ئامانجی دیاری کراوە.

ئەو زانستەی، کە لـە ڕێـی وەحیـەوە زانسـتخواز فێـری دەبێـت دەیانگەیێنێتـە ئامانج و مەبەستی دیاریـکراو نـەك بێـهودە و نادیـار بـێ، زانسـتی وەحـی دوو ئامانجی سەرەکی هەیە یەکەمیان بەم زانستە نزیك ببنەوە لە خودای گەورە و خودا بناسن.

دووەمیـان دادپـەروەری لـەنێو کۆمـەڵگا بەرپابکـەن، تـا مـرۆڤ پـەیامی ئاوەدانکردنەوە و شارستانیەت و خزمەت بە مرۆڤایەتی بکات.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَـٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ ۖ ﴾ [(٣)]. واتــــە: (ئێمــــە پێغەمبەرانمان نارد بـە بەڵگـە و مـوعجیزە و پـەرتووك و تـەرازووی دادگـەری بـۆ ئەوەی خەڵکی بە دادگەری ڕەفتار بکەن).

---

(١) سورەتی سبأ ئایەتی ٢٨ .
(٢) سورەتی المائدە ئایەتی ٦٧ .
(٣) سورەتی الحدید ئایەتی ٢٥ .

ئەم تایبەتمەندیە لە هیچ پێوەرێکی زانستی نییە، تەنها لە وەحی نەبێ بۆیە زانستخواز ئەگەر بینای زانستی و مەعریفی لەسەر قورئان و وەحی بکات توشی هەڵە نابێت و بە بەرپرسیاریەتیەوە مامەڵە لەگەڵ زانست دەکات، وەك پەیامێکی مرۆڤایەتی بە جیهان دەگەیەنێ[1].

## پێوەری مەعریفە و زانست لە قورئاندا

کاتێ ورد دەبینەوە لە قورئان بۆت دەردەکەوێت هەر زانیاریەك لە قورئاندا پەخش کرابێت بۆ مرۆڤ دەیان سەوابتی ئەخلاقی و زانستی هەیە، گواستەنەوەی زانست و زانیاری ئەمانەتێکی گەورەیە بۆیە قورئان پێش دانانی پێوەری زانستی پێوەری ئەخلاقی داناوە، هیچ زانست و زانیاریەك نابێ بگوازرێتەوە بەبێ بنەمای ئەخلاقی و ئەمینداریەتی و ڕاستی. بە کورتی ئاماژە بە پێوەری ئەخلاقی و زانستی دەکەین، تاوەکو زانستخواز ڕابهێندرێت لەسەر وەرگرتن و دانەوەی زانست بە پێوەری ئەخلاقی و زانستی.

## پێوەری ئەخلاقی مەعریفە و زانست و زانیاری لە قورئاندا.

قورئان سەرچاوەی سەرەکی دارێژەری ئەخلاقە هەروەك چۆن سەرچاوەی سەرەکی زانستیشە، لە ئەنجامی بە دواداچوون بۆ ئەم دوو چەمکە بۆت دەردەکەوێ کە قورئان چەندان پێوەری بنچینەیی داناوە بۆ گواستنەوەی زانست و زانیاری لەڕووە ئەخلاقییەکەیەوە، لەوانە:

**١ ـ قەدەغەکردنی ململانێ(التنازع).**

پێشبڕکێ لەسەر بەدەستهێنانی مەعریفەو زانست و زانیاری کارێکی دروست و

(١) بڕوانە: (مختصر المفاهيم المفتاحية لنظرية المعرفة فی القران الكريم، عبدالكريم بليل (ل ٢٨٧) .

ڕێپێدراوە بۆ بەرەو پێشبردنی بواری زانستی: ﴿ وَفِي ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَٰفِسُونَ ﴾ [(١)]. واتە: (لەم کارانەدا پێوستە کێبڕکێ بکەن).

بەڵام ململانێ بە هەموو جۆرەکانیەوە قەدەغەکراوە و بواری پێنەدراوە، چونکە سەردەکێشی بۆ لێك ترازان و تەفرەقە و هەڵوەشاندنەوەی ڕیزی مسوڵمانان، هیچ خزمەتێك بە بواری زانست و زانیاری ناکات: ﴿ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفْشَلُواْ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ ﴾ [(٢)]. واتە: (جیاواز مەبن و دوو بەرەکی ئەنجام مەدەن بەهۆیەوە بشکێن و لاواز بن و هێزتان نەمێنێ).

ترسناکترین نەخۆشی توشی ئومەتی ئیسلامی دەبێت نەخۆشی لێکترازان و ململانێیە، بە تایبەتی دوای گەیشتن بە زانست و زانیاری ئینجا بە دوای هەواو هەوەس بکەوێت ئەمەشیان لە قورئاندا نەهی لێکراوە: ﴿ وَمَا ٱخْتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ﴾ [(٣)]. واتە: (ئەوانەی پەرتووکیان پێدراوە جیاوازییان لە نێوانیان پەیدا نەبوو تەنها دوای ئەوە نەبێت کە زانستیان پێدرا ئەوەش بە هۆی دووبەرەکی و ململانێی ناو خۆیان).

**٢ ـ بێلایەنانەی وەحی.**

مەبەستمان لە بیلایەنانە ئەوەیە مرۆڤ لە کاتی گواستنەوەی زانست و زانیاری خۆی یەکلا بکاتەوەو هیچ کاریگەریەکی عاتفی و سۆزداری لەسەر نەبێت، کاریگەری لە ڕێرەوی زانستی بکات بەبێ هیچ بەڵگەیەکی نەقڵی و عەقڵی، لە کاتی پێویست بۆ دەرکردنی بڕیارێك یان حکومێك، پێوەری بێلایەنانە لە

---

(١) سورەتی المطففين ئایەتی ٢٦ .
(٢) سورەتی الأنفال ئایەتی ٤٦ .
(٣) سورەتی آل عمران ئایەتی ١٩ .

نەقڵکردنی زانیاری بە ئەمانەت و ڕاستگۆیی و دورکەوتنەوە لە هەواو هەوەسی کەسی زۆر پێویستە و کارێکی گرینگە. زاراوەی بێلایەنانە لە نەقڵکردنی زانست لە قورئاندا وەك پێوەرێك هاتووە وەحی ئەم پێوەرەی داناوە بۆ کاتی دەرکردنی ئەحکام و هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ بەرامبەرەکان، خودای گەورە باسی بەسەرهاتی ئومەتانی پێشوو دەگێڕێتەوە، باسی ئەمانەتی ئەخلاقییان دەکات، هەروەها جۆرەکانیان چەندە جیاوازبوون:﴿ وَمِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ مَنْ إِن تَأْمَنْهُ بِقِنطَارٍ يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ وَمِنْهُم مَّنْ إِن تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ ﴾[1]. واتە: (لە ئەهلی کتاب کەسانێك هەن شاخێك ئاڵتونیان بە ئەمانەت پێ بدەی دەیپارێزن و دەیگێڕنەوە بۆت, تێیاندا هەیە، کە دینارێکی بە ئەمانەت پێ بدەی ناگەڕێنێتەوە بۆت). هەروەها: ﴿ لَيْسُوا۟ سَوَآءً ۗ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴾[2]. واتە: (هەموویان وەك یەك وانین ئەهلی کتاب تێیاندا هەیە بەهێزن و ئایەتەکانی خوا دەخوێننەوە بە درەنگانی شەو و سوجدە دەبەن بۆ خوا).

قورئان مەنهەجێکی وردی داناوە بۆ نەقڵکردنی زانست، داوای لە مسوڵمانان کردوە خیانەت نەکەن لە هیچ شتێك بەتایبەتی زانست و مەعریفە، چونکە زانست گەورەترین ئەمانەتە:﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَخُونُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓا۟ أَمَـٰنَـٰتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾[3]. واتە: (ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە خیانەت مەکەن لە خوا و پێغەمبەر خیانەت دەکەن لە ئەمانەتەکانتان لە کاتێکدا دەشزانن).

---

(١) سوڕەتی آل عمران ئایەتی ٧٥.
(٢) سوڕەتی آل عمران ئایەتی ١١٣ .
(٣) سوڕەتی الأنفال ئایەتی ٢٧ .

**٣ ـ نەشاردنەوەی مەعریفە و زانست و زانیاری**

یەکێك لە پێوەرەکانی قورئان نەشاردنەوی مەعریفە و زانستە لە زانستـخوازان، حەرامە و دروست نییە زانا زانیاری و زانستی هەبێ لە زانستـخوازانی بشارێتەوە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلْهُدَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِى ٱلْكِتَٰبِ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴾ (١). واتە: (ئەوانەی کە ئایەتـە ڕۆشن و ڕێنماییەکانمان دەشارنەوە دوای ئەوەی کە ڕوونمان کردووەتەوە بـۆ خـەڵکی ئەوانە خوا و نەفرەتکارانیش نەفرەتیان لێ دەکەن).

هەروەها: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَيَشْتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ إِلَّا ٱلنَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ (٢). واتە: (ئەوانەی ئەو ئایەتانە دەشارنەوە، کە خودا ناردویەتیە خوارەوە لە تەوڕات و دەیگۆڕنەوە بە نرخێکی زۆر کەم ئەوانە ئاگر نەبێت هیچی تر ناچێتە سکیانەوە  خوا لـە ڕۆژی دوایـی قسـەیان لەگەڵ ناکات و پاکیان ناکاتەوە و سزای سەختیان دەدات).

**٤ ـ دورکەوتنەوە لە گومان.**

گومان و ناڕاستی هەرچەند بەدواکەوتنی زۆر بێت، هیچ بەهایێکی بۆ دانانـدرێ لە قورئاندا، حەق و ڕاستی پێوەری سەرەکیە بۆ زانست با بەدواکەوتنەکانیش کـەم بن، زۆربەی کات بەدواکەوتنی گومـان و باتـڵ زۆرتـرن: ﴿ وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴾ (٣).

(١) سورەتی البقرە ئایەتی ١٥٩ .
(٢) سورەتی البقرە ئایەتی  ١٧٤ .
(٣) سورەتی الأنعام ئایەتی ١١٦ .

واتە: (ئەگەر گوێڕایەڵی زۆربەی ئەوانە بیت، کە لەسەر زەوین لـە ڕێگـەی خـوا گومڕات دەکەن و ئەوانە هەر شوێنی گومان کەوتوون هەمیشە درۆ دەکەن).

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی زانست دەبێ بە دڵنیایی بێ نەك گوماناوی.

**٥ ـ تێکەڵنەکردنی حەق و باتڵ.**

تەواوی تیۆر و بیردۆزەکانی دەست کرد و زادەی فکری مرۆڤ بۆ شـاردنەوەی نـا ڕاستی زانستەکانی خۆیان حەق و باتڵ تێکەڵ دەکەن، ئەمـە بـە پێـوەری قورئـانی قەدەغەیە و دروست نییـە: ﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَلۡبِسُونَ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴾ (١). واتـە: (ئـەی ئـەهلی کتـاب بۆچـی ڕاسـت و ناڕاسـت تێکەڵاو دەکەن و ڕاستی دەشارنەوە لە کاتێکدا دەزانن کامە ڕاستییە).

هەروەها جاری وا هەیە خەریکی تێکەڵکردن و گۆڕینی مادەکانی زانستین بە ویست و هەوا و هەوەسی خۆیان دەیـگۆڕن بەبێ پێوەری زانستی: ﴿ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ يَكۡتُبُونَ ٱلۡكِتَٰبَ بِأَيۡدِيهِمۡ ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشۡتَرُواْ بِهِۦ ثَمَنٗا قَلِيلٗاۖ فَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتۡ أَيۡدِيهِمۡ وَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا يَكۡسِبُونَ ﴾ (٢). واتە: (ئینجا هاوار و تیاچوون بۆ ئەوانەی کە بەدەستی خۆیان تەوڕات دەنوسنەوە و دواتر دەڵێن ئەمە لە لایەن خواوەیە تا شتێکی کەمی پێبکڕن و هاوار و تیاچوون بۆ ئەوان لەوە کە دەستی ئەوان نوسیویەتیانەوە وە هاوار بۆ ئەوەی پەیدای دەکەن).

گۆڕینی زانست بەپێی هەواوهەوەس و بەرژەوەندی خۆی تـاوانێکی ئەخلاقییـە، چونکە دەرئەنجامی خراپی دەبێت لەسەر کۆمەڵگاو مرۆڤایەتی.

(١) سوڕەتی آل عمران ئایەتی ٧١.
(٢) سوڕەتی البقرە ئایەتی ٧٩ .

## پێوەرە زانستییەکانی قورئان بۆ گواستنەوەی مەعریفە و زانست

بە هەمان پێـوەری ئـەخلاقی چـەندان پێـوەری زانسـتیمان هەیـە لـە قورئانـدا بۆگواستنەوەی زانست لەوانە:

### یەکەم ـ هیچ قسەو وتەیەک وەرناگیرێ بە بێ بەڵگە.

مەنهەجی قورئان زۆر جەخت لەسەر جـێگیر کردنـی بەڵگـەی نـەقڵی و عـەقڵی دەکاتـەوە لـە کـاتی نـەقڵ کردنـی زانسـت، مەبەسـت لـە بەڵگـە گواسـتنەوەی سەرچاوەکانی قورئان و سوننەتی صەحیحی پێغەمبەرمانە (ﷺ)، مەبەستیش لە بەڵگەی عەقڵی بابەتە سەلمێندراوەکانە بە پێوەری عەقڵ کە بواری نکـوڵی کردنـی نەهێشـتوەتەوە خـوای گـەورە دەفـەرموویت:﴿ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾[1]. واتـە: (پێیـان بڵـێ بەڵگـەکانتان بهێـنن ئەگـەر ئێـوە ڕاسـت دەکەن).

هـــەروەها:﴿ ائْتُونِي بِكِتَابٍ مِّن قَبْلِ هَٰذَا أَوْ أَثَارَةٍ مِّنْ عِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾[2]. واتە: (پەڕاوێکم بۆ بێنن لە پێش ئەم قورئانە هاتبێ یان زانیارییەك کە لە پێشووان بە جێ مابێت ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن).

زانایانیش وتەیەکی جوانیان هەیە دەفەرمون: (واذا تکلمت فالدلیل واذا نقلت فالصحة).

---

(١) سورەتی النمل ئایەتی ٦٤ .

(٢) سورەتی الأحقاف ئایەتی ٤ .

## سێیەم ـ قسەنەکردن لەسەر شتێک کە زانیاری لەسەر نییە

لە دوای عەولەمەبونی جیهان زانستەکان بەرەو پسپۆڕی دەڕۆن، بۆیە قسەکردن لەسەر زانستێك کە زانیاریت لەسەر نەبێت لاوازی و بێ متمانەیی بۆ زانستەکە دروست دەکات، قورئان هەر لە سەرەتاوە ئەم بابەتەی بنبڕ کردووە و زانستی داوەتە خاوەنی خۆیی، هەروەها قەدەغەی کردووە قسە لەسەر بابەتێك بکرێت کە زانیاری لەسەر نەبێت دەفەرمویت:﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ﴾[1]. واتە: (شوێن شتێك مەکەوە کە زانیاریت لەسەری نییە).

هەروەها پێغەمبەرمان (ﷺ) فێری کردوین ئەگەر زانیاریمان لەسەر شتێك نەبوو بڵێین (ما المسؤول اعلم بالسائل)[2].

## چوارەم: شارەزایی لە زانستی زمان و تێگەیشتن لە زاراوەکان.

هەر زانستێك پێوەرێکی تایبەتی هەیە بۆ تێگەیشتن ، زاراوەو چەمکەکان زۆر بەشیان پێویستی بە شارەزایی هەیە لە زمان، یەکێك لەم پێوەرە زانستیانەی قورئان دایناوە بۆ بینای مەعریفە شارەزاییە لە زانستی زمان و تێگەیشتن لە زاراوەکان، چەندان نموونە و پێوەری دانا تا ڕایان بهێنێ لەسەر زاراوەی زانستی، جیاوازییان لەنێوان دا بکەن وەك دەفەرمویت:﴿ قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا ۖ قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا ﴾[3]. واتە: (هەندێك لە بیابانشینەکان وتیان ئیمانمان هێناوە پێیان بڵێ ئیمانتان ناهێناوە بەڵکوو، بە زۆر موسوڵمان بوون).

کاتێك موسوڵمانان وتووێژیان لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دەکرد دەیان فەرموو

---

(١) سورەتی الإسراء ئایەتی ٣٦ .
(٢) بڕوانە: السنن الصغرى للنسائي , (ب ٨, ل ٩٧).
(٣) سورەتی الحجرات ئایەتی ١٤ .

(راعنا) واتە: سەرپەرشتی ماڵ و حاڵمان بکە (راع احوالنا) ، ئەم زاراوەیە بۆ مەقامی پێغەمبەر (ﷺ) جوان نەبوو، بۆیە خوای گەورە پێی گۆڕین و لە قورئاندا تۆماری کرد، تاوەکو بینای مەعریفە لەسەر هەڵە بینا نەکەن:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقُولُواْ رَٰعِنَا وَقُولُواْ ٱنظُرۡنَا ﴾[1]. واتە: (ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە مەڵێن "راعنا" بەڵکو بڵێن چاوەڕێمان بکە). زانستخواز دەبێ ئاگاداری بەکارهێنانی زاراوە و چەمك بێت و فێری ئەوپەڕی ڕەوانبێژی و ئاداب و شێوازی جوان بێت.

## پێنجەم: جێگیرکردنی هەر زانیاریەک بە پێوەری زانستی دەبێت.

زۆر زانیاری و مەعریفە هەیە لە نێو کۆمەڵگا بەکاردێت بە هەڵە، لە ڕووی زانستییەوە ناتواندرێ بە بەڵگە بسەلمێندرێ، قورئان بۆ ئەم مەبەستە پێوەری ڕوونی زانستی داناوە، هەروەها بە جیاوازی زانستی بۆیان دەسەلمێنێ ئەم زانیاری و مەعریفەیە هەڵەیە بۆ نموونە: دەیانگوت مەلائیکەتەکان مێینەن! یان دەیانگوت مەلائیکەتەکان کچی خودان!: ﴿ وَجَعَلُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمۡ عِبَٰدُ ٱلرَّحۡمَٰنِ إِنَٰثًاۚ أَشَهِدُواْ خَلۡقَهُمۡۚ سَتُكۡتَبُ شَهَٰدَتُهُمۡ وَيُسۡـَٔلُونَ ﴾ [2]. واتە: (فریشتەکانی خوایان کرد بە مێینە، کە بەندەی خوان, ئایا ئەوان ئاگاداربوون کاتێك دروست کران, بێگومان شایەتییەکەیان دەنوسرێتەوە و لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێ).

هەروەها:﴿ أَمۡ لَهُ ٱلۡبَنَٰتُ وَلَكُمُ ٱلۡبَنُونَ ﴾ [3]. واتە: (ئایا خوا کچی هەیە و ئێوەش کوڕتان هەیە).

---

(١) سوڕەتی البقرە ئایەتی ١٠٤ .
(٢) سوڕەتی الزخرف ئایەتی١٩ .
(٣) سوڕەتی الطور ئایەتی ٣٩ .

خودای گەورە بە پێوەری زانستی ڕەدی دانەوە فەرمووی ئایا ئەوان شاهیدی دروستکردنی مەلائیکەتەکان بوون (﴿أَشَهِدُواْ خَلْقَهُمْ﴾)، واتا کاتێك مەلائیکەتەکانمان درووست کرد ئەوان لەوێ بوون، ئایا ئەو قسەیەی ئەوان دەیکەن بەڵگەی زانستیان هەیە، چونکە ئەمە لە دوو حاڵەت بەدەر نییە یان ئەوەی ئەوان لەوێ بووبن لە کاتی درووستکردنی بێ گومان لەوێ نەبوون، یان دەبێ ئەوان مەلائیکەتەکانیان بینیبێ بەچاو دیارە ئەوەشیان نەبینیووە، کەواتا زانیاریەکە هەڵەیە بە بەڵگەی زانستی، ئەمەش یەکێکە لە مەنهەجە وردەکانی زانستی لە قورئان بۆ بینای مەعریفەو زانیاری.

## شەشەم: دانانی سنورێک بۆ عەقڵ لە چوارچێوەی ئاییـن دا.

عەقڵ بە تەنها ناتوانێ تەواوی زانست و زانیاریەکان بەرهەم بهێنێ، چونکە سنوردارەو تواناکەی لە چوارچێوەیەکی دیاریکراو تێناپەڕێ، زۆر بوار هەیە عەقڵ ناتوانێ دەرکی پێ بکات و زانیاری لەسەر کۆبکاتەوە، بۆ نموونە زانیاری لەسەر ڕوح، ڕۆژی دوایی، جیهانی مەلائیکەت، جنۆکە، بارانبارین، دەیان زانست و زانیاری تر تەنها دەبێ لە ڕێی وەحیەوە زانست وەرگرێ، عەقڵ هەر قسەیەکی لەسەر بکات، ناتوانێ بەبەڵگەی زانستی بیسەلمێنێ خودا دەفەرمووێت:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ (١).

واتە: (پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی رووح, ئەی محمد تۆش بڵێ رووح لە فەرمانەکانی خوایە و ئێوە بەشێکی کەم لە زانستان پێدراوە).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَاۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ

---

(١) سورەتی الإسراء ئایەتی ٨٥ .

رَبِّيۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَۚ ﴾[١]. واتە: (ئەی محمد پرسیارت لـێ دەکـەن دەربـارەی قیامەت کەی بەرپا دەبێت، تۆش بڵێ زانینی کاتەکەی تەنها لای خوای گەورەیە و هیچ کەسێك ناتوانێ لە کاتی خۆیدا بەرپای بکات تەنها زاتی خۆی نەبێت).

هـــــــەروەها: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِۖ ﴾[٢].

واتـە: (خـوای گـەورە زانسـتی کـاتی هـاتنی قیامـەتی لایـە و بـاران دەبـارێنێ و دەشزانێ چی لەناو رەحمی دایك دایە).

لێرەدا زانستخواز دەبێ زانست و مەعریفەی ئەوەی هەبێ پشتـبەستن تەنها بـە عەقڵ دوور لە وەحی مرۆڤ گومرا دەکات و بە لاڕێی دادەبـات، ئـەو کـات عـەقڵ گرنگە کە لەگەڵ نەقڵ تەواوکەری یەك بن.

## حەوتەم: دادگەری و ئینساف پێوەری سەرەکی زانست و مەعریفەن.

یەکێك لەم پێوەرانە، کە قورئان دایناوە بۆ زانست و مەعریفە دادگەرییە، هەر بڕیارو گوفتارێك لەسەر کەس، یان حیزب، یان مەزهەب، یان کۆمەڵ، و گروپ و ئاینێکەوە بێ، دەبێ عەدالەت و ئینصافی تێدا بێت، ئەگەرنا بە پێوەری زانستی داناندرێت خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُواْۚ ٱعْدِلُواْ

(١) سورەتی الأعراف ئایەتی ١٨٧ .

(٢) سورەتی لقمان ئایەتی ٣٤ .

هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ﴾ [(١)]. واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بە ڕێکوپێکی فەرمانەکانی خوا ئەنجام بدەن, شایەتی بدەن بە داد و ڕاستی, با ڕق و کینەتان لە کۆمەڵێك واتان لێ نەکات دادگەری نەکەن, دادگەر بن ئەوە نزیکترە لە ڕاستییەوە).

## هەشتەم: وەرگرتنی مەعریفەو زانست و زانیاری لە سەرچاوەی ڕاست

پێوەرەکانی قورئان بۆ وەرگرتنی زانست داوای سەرچاوەی ڕاست و تەواو دەکات، داوامان لێ دەکات بگەڕێینەوە بۆ خاوەن پسپۆڕی تایبەت: ﴿ فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾ [(٢)]. واتە: (پرسیار بکەن لە شارەزایان ئەگەر ئێوە خۆتان نازانن).

دەبینین قورئان بەرهاتی پێغەمبەر (موسی) (علیه السلام ) مان بۆ دەگێڕیتەوە زۆر لە (خضر) خاوەن پێگەترە کەچی داوای لێ دەکات بە دوای بکەوێت و زانستی لە سەرچاوەی خۆی لێ وەرگرێ: ﴿ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴾ [(٣)]. واتە: (موسا بە خزری فەرمووو ئایا شوێنت بکەوم تاوەکو فێرم بکەی لەوەی فێری بووی).

هەروەها کوڕی ئادەم پێغەمبەر (علیه السلام) مرۆڤە کەچی زانست لە قەلەڕەشێك وەردەگرێ : ﴿ فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابًا يَبْحَثُ فِى ٱلْأَرْضِ لِيُرِيَهُۥ كَيْفَ

(١) سوڕەتی المائدە ئایەتی ٨ .
(٢) سوڕەتی الأنبیاء ئایەتی ٧ .
(٣) سوڕەتی الکهف ئایەتی ٦٦.

يُوَٰرِي سَوۡءَةَ أَخِيهِۚ قَالَ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ أَعَجَزۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِثۡلَ هَٰذَا ٱلۡغُرَابِ فَأُوَٰرِيَ سَوۡءَةَ أَخِيۖ فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلنَّٰدِمِينَ ﴾ (١). واتە: (خوا قەلەڕەشێکی نارد لە زەویدا چاڵی هەڵکەند بۆ قەلەڕەشێکی مرداربوو تاوەکو بیشارێتەوە و بۆ ئەوەی نیشانی بدات کە چۆن تەرمی براکەی بشارێتەوە وتی ئای داخی گرانم من ئەوەشم نەتوانی بیکەم تا تەرمی براکەم بشارمەوە و چوویە ڕیزی پەشیمان بووانەوە).

لەم نمونانە زانستخواز فێر دەبێ بە دوای زانست دا بکەوێ لەهەر شوێنێکە، لە لای هەر کەسێکە، تاوەکو لەسەرچاوەی خۆی دەستی کەوێ و ڕاست و دروست بێت.

ئەم خاڵانەی باسمان کردن لەڕووی ئەخلاقی و مەنهەجی زانستی، بۆ ئەوەیە زانستخوازو تەنانەت مامۆستای ئایینیش بێ ئاگا نەبێ لەم مەنهەجە بەهێز و پڕ لەپیوەری ئەخلاقی و زانستییە ، قورئان گەوەترین سەرچاوەی زانستیە بو مروڤایەتی بەگشتی و موسلمانان بەتایبەتی، کەچی موسڵمانان لەبەر بێ ئاگاییان لەم هەموو پێوەرە، ئەمڕۆ تەواوی شارستانیەت و تەکنەلۆژیا و پیشکەوتنە سەردەمییەکان بەجێ ماوین ئەگەر ڕاست بڵێین ئێستا موسڵمانان زۆر بێ ئاگاو دواکەوتوین لەزۆربەی بەشەکانی ژیانی شارستانی، جگە لەئیمان و عەقیدەو ئەخلاق نەبێ ، بۆیە ئەم پێوەرانەمان باسکردووە تا بگەینە مەنهەجێکی زانستی و ئەخلاقی ڕاست و دروست، بۆ ئەوەیە بگەینە زانست و مەعریفەیەکی تەواو (٢).

---

(١) سورەتی المائدة ئایەتی ٣١ .

(٢) بڕوانە: مختصر المفاهيم المفتاهية لنظرية المعرفة فى القران الكريم.

## سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) سەرچاوەی دووەمی مەعریفەو زانست و زانیارییە

دڵخۆشم لەم دەستپێکەدا لەبارەی سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) کە سەرچاوەی زانست و فێربوون و مەعریفەیە بە ئایەتێکی خودا دەست پێ بکەم ، تێیدا کارو ئەرکی پێغەمبەری (ﷺ) باس کردوە و سەرچاوەی سەرەکییە بۆ ئێمە:

﴿ كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا۟ تَعْلَمُونَ ﴾[1]. واتە: (وەك ڕەوانەمان کرد لە ناوتاندا پێغەمبەرێك لە خۆتان کە ئایەتەکانی ئێمەتان بەسەردا بخوێنێتەوە پاکتان بکاتەوە فێری قورئان و داناییتان بکات وە فێری ئەو شتانەتان بکات کە نەتان زانیوە).

. تەواوی مەزهەبەکان لەسەر ئەوە یەك دەنگن لە دوای قورئان سونەتی صحیحی پێغەمبەرمانە (ﷺ) وەك لە بنەماکانی ((اصول الفقه)) داهاتووە، هەروەها لەم ئایەتەدا خوای گەورە وەزیفەی پێغەمبەری (ﷺ) دیاری کردووە لە م خاڵانەدا.

١- يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا .

٢- وَيُزَكِّيكُمْ .

٣- وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ.

٤- وَٱلْحِكْمَةَ .

٥- وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا۟ تَعْلَمُونَ .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (أَلَا إِنِّي أُوتِيتُ الْكِتَابَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ،

---

(١) سوڕەتی البقرة ئایەتی ١٥١ .

أَلَا إِنِّي أُوتِيتُ الْقُرْآنَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ[١]. واتە: (ئاگاداربن خوای گەورە کتێب و وێنەی کتێبی پێداوم . هەروەها قورئانی پێداوم لەگەڵ وێنەی قورئان کە سونەتە).

## کەواتا ئەرکەکانی پێغەمبەر (ﷺ) خۆی دەبینێتەوە لە :

### یەکەم: تیلاوە:

خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەر کردووە قورئان بەسەر خەڵکیدا بخوێنێتەوە چۆن بۆی دابەزیوە: ﴿ وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَۖ ﴾[٢]. واتە: (بیخوێنەوە لەوەی کە خوا بۆی ڕەوانە کردووی لە پەرتوکەکەیدا).

هەروەها: ﴿ أَوَلَمۡ يَكۡفِهِمۡ أَنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ﴾[٣]. واتە: (ئایا ئەوە بەس نییە بۆیان کە ئێمە ئەو قورئانەمان بەسەردا دابەزاندوون و بەسەریاندا دەخوێنرێتەوە).

. زانایان دەفەرموون وشەی تیلاوە تەنها مەبەست خوێندنەوەی قورئان نییە بەڵکوو خوێندنەوەو ماناداریش دەگرێتەوە[٤].

### دووەم: ڕاگەیاندن.

یەکێکی تر لە کارو ئەرکەکانی گرنگەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، گەیاندنی تەواوی ئایەتەکانی قورئانە بەبێ جیاوازی، تەنها ئەگەر بابەتێك پێغەمبەر (ﷺ) لە دڵدا پێی خۆش نەبووبێ خەڵك بیزانێ یان باسی بکات بەڵام هەر ڕای

---

(١) ئەبو داود گێڕاویەتیەوە لە سونەنەکەیدا , (ب ٤, ل ٢٠٠) .
(٢) سورەتی الکهف ئایەتی ٢٧.
(٣) سورەتی العنکبوت ئایەتی ٥١ .
(٤) بڕوانە: مفردات راغب الاصفهانی (ل ٧٥) .

گەیاندووە، وەك بەسەرهاتی تەبەنیکردنی زەید و مارەکردنەوەی دایکمان زەینەب، لەگەڵ بەسەرهاتی باس و خواسی ئەبو لەهەبی مامی پێغەمبەر (ﷺ). خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥۚ ﴾ [1]. واتە: (ئەی پێغەمبەر ئەوە بگەیەنە کە لە لایەن خواوە بۆت دابەزێندراوە، ئەگەر وانەکەی، ئەوە بێگومان پەیامەکەت نەگەیاندووە).

## سێیەم: ڕوونکردنەوە (البيان).

ئەرکێکی سەرەکی لە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوونکردنەوەو مانا لێکدانەوەی قورئانە، خوای گەورە فەرمانی پێ دەکات دەفەرموێت: ﴿ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ [2]. واتە: (ئێمە قورئانمان بۆ ڕەوانە کردووی بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی ڕوون بکەیتەوە لەوەی بۆیان دابەزیوە بەڵکوو بیربکەنەوە).

هەروەها: ﴿ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِي ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ ﴾ [3]. واتە: (ئێمە ئەم قورئانەمان بۆ دابەزاندووی تەنها لەبەر ئەوەبووە بۆیان ڕوون بکەیتەوە ئەو شتانەی لەسەری ڕاجیاوازن).

ڕونکردنەوەش تەواوی بەشەکانی عیبادات و موعامەلات و ئەوانی تر دەگرێتەوە .

---

(١) سوڕەتی المائدە ئایەتی ٦٧ .

(٢) سوڕەتی النحل ئایەتی ٤٤ .

(٣) سوڕەتی النحل ئایەتی ٦٤.

## چوارەم: ئامۆژگاری (النصح) .

بەشێکی گرنگی مەعریفەو زانست ئامۆژگارییە، هیچ زانستخوازێك نییە پێویستی بە ئامۆژگاری نەبێت، یەکێك لە ئەرکەکانی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئامۆژگارییە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنَا۠ لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴾ [(١)]. واتە: (پەیامەکانی خواتان پێ دەگەیەنم و من بۆ ئێوە ڕێنموونیکارێکی ئەمینم).

ئامۆژگاری لە قورئاندا زۆر مانای فراوان دەگرێتەوە وە پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێت (الدين النصيحة قالوا لمن قال لله و لكتابه و لرسوله و لائمة المسلمين و عامتهم) [(٢)]. واتا دین ئامۆژگارییە، گوتمان بۆ کێ؟ فەرمووی بۆ خوداو بۆ قورئان بۆ پێغەمبەرو بۆ گەورەی موسوڵمانان و تێکڕایی خەڵك.

## پێنچەم: فێرکردنی قورئان و حیکمە

یەکێك لەو ئەرکانە خودا بۆ پێغەمبەری داناوەو فەرمانی پێ کردووە فێرکردنی خەڵکە لە قورئان و حیکمە: ﴿ كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا۟ تَعْلَمُونَ ﴾ [(٣)]. واتە: (هەروەك چۆن لەناو ئێوەدا پێغەمبەرێکمان نارد

---

(١) سورەتی الأعراف ئایەتی ٦٨ .
(٢) موسلم گێڕاویەتیەوە (٧٤/١) (٥٥) .
(٣) سورەتی البقرە ئایەتی ١٥١ .

ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێندەوە و تەزکیەی دەکردن و فێری قورئان و دانایی دەکردن و فێری ئەو شتانەی دەکردن کە نەتان دەزانی).

فێرکردنی خەڵك لە لایەن پێغەمبەرەوە لەسەر چۆنیەتی کارکردن بە قورئان و جێبەجێکردنی ئەحکامەکانیەتی، بەلاّم حیکمە زانایان زۆر ڕاو بۆچوونی جیاوازیان هەیە، هەندێکیان دەڵێن مەبەست پێی فەرموودە و سوننەتی صحیحی پێغەمبەرە، بەشێکیشیان دەڵێن مەبەستی مانایەکی گشتگیرە بۆ زانست و مەعریفەی بونەوەر و پسپۆڕی مرۆڤەکان لە تەواوی بوارەکاندا.

### شەشەم- تەزکیەی خەڵك بەم قورئانە

تەزکیەی دەروون و عەقڵ و ژیان و ڕێکخستنیان کارێکی تری پێغەمبەرە، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾ (١). واتە: (ئەو زاتەی کە لەناو نەخوێندەوارەکان پێغەمبەرێکی نارد ئایەتەکانی ئێمەی بەسەردا دەخوێندنەوە و تەزکیەی دەکردن و فێری قورئان و دانایی دەکردن, گەرچی ئەوان لە پێشتردا لە گومڕاییەکی ئاشکرا دابوون).

هەروەها: ﴿ لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾ (٢) . واتە: (خوا منەت بەسەر باوەڕداراندا دەکات کە پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانە کردوون لە خۆیان و ئایەتەکانی خوا بەسەریاندا

---

(١) سورەتی الجمعة ئایەتی ٢ .

(٢) سورەتی آل عمران ئایەتی ١٦٤ .

دەخوێنێتەوە و تەزکیەیان دەکات و فێری قورئان و داناییان دەکات, گەرچی ئەوان لە پێشتردا لە گومڕاییەکی ئاشکرا دابوون).

ئەم شەش خاڵەی باسمان کرد کارو ئەرکی پێغەمبەر بوون (ﷺ) ، بێگومان بەشێکی تریش ماوە، بەڵام تەرکیزمان لەسەر ئەوانە کرد کە پەیوەندی بەفێربوون و زانست و مەعریفە هەیە[1].

## سوننەت کاکڵ وکرۆکی مەعریفەو زانست و زانیاریە بۆ زانستخوازان

دەبێ زانستخوازان بزانن، کە سوننەت سەرچاوەی دووەمی سەرەکی مەعریفەو زانست و زانیاریە، دابەشکردنی مەعریفەو زانست و زانیاری لە سوننەتی پێغەمبەر دەکرێ دابەش بکرێت لە ڕووی سەرچاوەی دووەمی زانست و مەعریفی بەم شێوازەی خوارەوە:

**بەشی یەکەم:** لە ڕووی تەشریعیەوە واتا ئەوەی پەیوەندی بە تەشریعەوە هەیە ئەحکامەکانی گشتییە یان تایبەتە.

**بەشی دووەم:** سوننەت وەك سەرچاوەی مەعریفەو زانست و زانیاری لە ڕووی ئایینەوە یان لە ڕووی غەیبیاتەوە وەك بەهەشت و جەهەننەم و قەبرو قیامەت و هتد. دیارە مەعریفە پەیوەندی بە لایەنەکانی مرۆڤەوە هەیە، وەك پەروەردە و فێرکردن و ئابووری و تەندروستی و پەیوەندییەکانی بە بواری زانستەکانی ترەوە.

(١) بڕوانە: اشكاليه التعامل مع السنه النبويه طه صابر العلوانى (ل ٤٤).

## بەشی یەکەم: سوننەت وەک سەرچاوەی مەعریفە و زانست و زانیاری لە ڕووی ئایینیەوە

دوای قورئـان ســوننەت سەرچـاوەی دووەمــە بــۆ زانســتە غـەیبییـەکان، ئـەو زانستانەی بە عەقڵ و ئەزموون و تاقیکردنـەوە و لێکۆڵینـەوە بـە دەست نایـەت، تەنانەت پێغەمبەرانیش غەیب نازانن تەنها ئەوانە نەبێت، کە خودا زانسـتی لـە و بارەوە پێداون: ﴿ عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُۥ يَسْلُكُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ رَصَدًا ﴾[1]. واتـە: (هـیچ کەسـێك ناتوانێ بە پەنهانییەکانی زانای پەنهانی ئاشـنا بێـت, تـەنها مەگـەر ڕەزامەنـدی دەربڕێت بۆ پێغەمبەر و ئەویش لە ژێر فەرمانی خوادا هەنگاو دەنێت).

### ئەو بابەتە غەیبیانەی لە سوننەت دا هاتوون.

ئەو غەیبیاتانەی سونەت قسەی لەسەر کـردووە لـە قورئانـدا بنـەمایان هەیـەو باس کراون بە نمونە:

- **باسی جوانی خودای پەروەردگار**، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (ان الله جميل يحب الجمال) [2] واتە: خوا جوانە و جوانیشی خۆش دەوێت.
- **باسی دەستکراوەی خودای گەورە:** پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (ان الله جواد يحب الجواد) [3]. واتە: خوا دەستکراوە و بەخشەرە و دەستکراوەکانیشی خۆش دەوێت.
- **ناوە جوانەکانی خودا:** (إِنَّ لِلَّهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ اسْمًا مِائَةً إِلَّا وَاحِدًا، مَـنْ

---

(١) سورەتی الجن ئایەتی ٢٦ - ٢٧ .
(٢) موسلم گێڕاویەتیەوە , (ب ١, ل ٩٣).
(٣) موسلم گێڕاویەتیەوە , (ب ١, ل ٩٣).

أَحْصَاهَا دَخَلَ الجَنَّةَ)[1] واتە: خوای گەورە نەوەدونۆ ناوی هەیە هەرکەسێك هەژماریان بکات و بیان زانیت و کاریان لەسەر بکات دەچێتە بەهەشتەوە.

- **باسی فریشتەتەکان:** (خُلِقَتِ الْمَلَائِكَةُ مِنْ نُورٍ، وَخُلِقَ الْجَانُّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ)[2] واتە: فریشتەکان لە نوور دروست کراون, جنۆکەکانیش لە پارچەیەکی ئاگر دروست کراون.

- **باسی قەبرو بەرزەخ:** (يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلًا)[3] واتە: لە ڕۆژی دواییدا خەڵکی زیندوو دەکرێنەوە بە ڕوتی و پێ پەتی خەتەنەنەکراو.

- **باسی ڕۆژی دوایی** : لەم بارەیەوە سوننەت پانتایەکی زۆری لە ڕۆژی دوایی و چۆنیەتی ژیانی دواڕۆژ باس کردووە، زۆر بابەت هەیە قورئان بە کورتی باسی کردووە، یان لێی بێدەنگ بووە، بەڵام سوننەت زۆر بە وردی قسەی لەسەر کردووە لەوانە:

- (أَنَا سَيِّدُ النَّاسِ يَوْمَ القِيَامَةِ، وَهَلْ تَدْرُونَ مِمَّ ذَلِكَ؟ يَجْمَعُ اللَّهُ النَّاسَ الأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ.......)[4] واتە: من سەردار و گەورەی گرۆی ئادەمیم لە ڕۆژی دواییدا, دەزانن ئەمەش چۆنە؟ خوای گەورە خەڵکی هەموو کۆ دەکاتەوە .......

- (لَا تَزُولُ قَدَمَا عَبْدٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ أَرْبَعٍ......)[5] واتە: هیچ کەسێك ناتوانێ هیچ هەنگاوێك بنێت لە ڕۆژی دواییدا تاوەکوو چوار پرسیاری لێ نەکرێت........

---

(١) بوخاری لە صەحیحەکەیدا گێڕاویەتەوە, (ب ٣, ل ١٩٨) .

(٢) موسلم گێڕاویەتیەوە , (ب ٤, ل ٢٢٩٤) .

(٣) موسلم گێڕاویەتیەوە , (ب ٤, ل ٢١٩٤).

(٤) بوخاری لە صەحیحەکەیدا گێڕاویەتەوە , ( ب ٦, ل ٨٤).

(٥) ترمذي گێڕاویەتیەوە لە سونەنەکەیدا (٦١٢/٤ ژ٢٤١٧).

- **لەبارەی پیلانی نێو دەوڵەتیەوە لە ئومەتی ئیسلام** : (یوشك أن تـداعى عليكم الأمم)[١] واتە: خەریکە ئومەتان دەکەونە پیلانـگێڕی لێتان.

- **بڵاوبوونەوەی ئیسلام لـە هـەموو دونیـا:** (لَيَـبْلُغَنَّ هَـذَا الْـأَمْرُ مَـا بَلَـغَ اللَّيْلُ)[٢]. واتە: ئەم ئیسلامە دەگاتە هەموو شوێنێك کە شەو پێی گەیشتووە.

ئەمانەو چەندان بابەتی تر لەبارەی ڕۆژی دوایی و نیشانەکانی و باسی بەهەشت و جەهەننەم و تەواوی زانست و زانیـاری و مەعریفـە لـە سـوننەدا هـاتووە، بـەڵام لەبەر درێژی بەوەندە کۆتایمان پیّ هێنا.

## زانیاری و زانست و مەعریفە مرۆییەکان لەنێو فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ).

زانیـاری و زانسـتێکی بـێ ژومـار هەیـە لەسـەر زانسـتە مرۆییـەکان، هـەر پسپۆریەك لە زانستی خۆی دەتوانێ لەم کانیاوە پاکە مەعریفەی خۆی زیاد بکـات و زانستی خۆی پەرە پیّ بدات بە زانستە جیاوازەکانیشەوە، لێرەدا بۆ هەر بـەش و بابەت و زانستێکی جیاواز نمونەیەك دێنینەوە.

- **زانست و مەعریفە لەبارەی پەروەردەو ئـاداب:** (كَفَـى بِـالْمَرْءِ كَـذِبًا أَنْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ مَا سَمِعَ)[٣] واتە: بەسە بۆ مرۆڤ درۆکردن کە هەرچی بیستی بیڵێتەوە.

- **زانست و مەعریفە لە بارەی ژینگەوە:** (لا يبولن أحدكم في الماء الدائم ولا يغتسل فيه مـن الجنابـة)[٤]. واتـە: پیسـایی لـە ئاوێکـدا مەکـەن کـە وەسـتاوە و خۆشتانی تێدا مەشۆن.

---

(١) ئەبو داود لە سونەنەکەیدا گێڕاویەتەوە (١١١/٤ ، ژ ٤٢٩٧) .
(٢) ئیمام أحمد گێڕاویەتیەوە (١٠٣/٤ ، ژ ١٦٩٩٨) .
(٣) موسلم گێڕاویەتیەوە (١٠/١ ، ژ ٥) .
(٤) ئەبو داود گێڕاویەتیەوە (١٨/١ ، ژ٧٠) ، هەروا ابن حبان (٦٨/٤ ، ژ ١٢٥٧) .

- **زانست و مەعریفە لە بارەی دارو درەختەوە:** (مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَغْرِسُ غَرْسًا، أَوْ يَزْرَعُ زَرْعًا، فَيَأْكُلُ مِنْهُ طَيْرٌ أَوْ إِنْسَانٌ أَوْ بَهِيمَةٌ، إِلَّا كَانَ لَهُ بِهِ صَدَقَةٌ)[١] واتە: هەر موسوڵمانێك شتێك بچێنێت باڵندەیەك لێی بخوات یان مرۆڤێك یان ئاژەڵێك بە خێر و چاکە بۆی دەنووسرێت.

- **زانست و مەعریفە لە بارەی بەروبومی گیانداران:** (مَنْ قَتَلَ عُصْفُورًا بِغَيْرِ حَقِّهِ، سَأَلَهُ اللَّهُ عَنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)[٢] واتە: هەرکەسێك باڵندەیەك بکوژێت بە تاوانباری خوای گەورە لە ڕۆژی دوایی لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکات.

- **زانست و مەعریفە لە بارەی تەندروستی و چارەسەرەوە:** (نِعْمَتَانِ مَغْبُونٌ فِيهِمَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ: الصِّحَّةُ وَالفَرَاغُ)[٣] واتە: دوو نیعمەت هەیە خەڵکێکی زۆر تێیدا بێ بەشن, تەندروستی و کات بەتاڵی.

- **زانست و مەعریفە لە بارەی پاك و خاوێنی:**

جگە لەوەی چەندان جۆر خۆ شۆردنمان هەیە زۆر یان لە سوننەت دا باس کراون، کەچی پاك و خاوێنی بە نیوەی ئیمان دادەندرێت: (الطُّهُورُ شَطْرُ الْإِيمَانِ)[٤] واتە: پاکوخاوێنی نیوەی ئیمانە.

- **زانست و مەعریفە لە بارەی ئابوریەوە:** (مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَغْرِسُ غَرْسًا، أَوْ يَزْرَعُ زَرْعًا، فَيَأْكُلُ مِنْهُ طَيْرٌ أَوْ إِنْسَانٌ أَوْ بَهِيمَةٌ، إِلَّا كَانَ لَهُ بِهِ صَدَقَةٌ)[٥] واتە: هەر موسوڵمانێك شتێك بچێنێت باڵندەیەك لێی بخوات یان مرۆڤێك یان ئاژەڵێك بە خێر و چاکە بۆی دەنوسرێت.

---

(١)موسلم گێڕاویەتیەوە (١١٨٩/٣ ژ١٥٥٣) .
(٢) بەیهەقی لە شعب الإيمان گێڕاویەتیەوە (٤٨٣/٧ ، ژ ١١٠٧٥) هەروەها أحمد (١٩٧/٢ ، ژ ٦٨٦١).
(٣) بوخاری گێڕاویەتیەوە لە صەحیحەکەیدا (٢٣٥٧/٥ ، ژ ٦٠٤٩) .
(٤) موسلم گێڕاویەتیەوە (٢٠٣/١، ژ ٢٢٣) .
(٥) موسلم گێڕاویەتیەوە (١١٨٩/٣ ژ١٥٥٣) .

- **زانست و مەعریفە لەبارەی ئەزموونی مرۆڤەکانەوە** بە نمونە فێربوونی زمان: قال زید: امرنی رسول الله فتعلمن له کتاب یهود بالسریانیة)[1]. واتە: زەید دەفەرمویت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێ کردم فێری زمانی یەهودیەکان بوم). (الحکمة ضالة المومن انی و جدها فهو حق بها) [2]. واتە: دانایی بزربووی ئیماندارانە لەهەر شوێنێك دۆزیەوە ئەو لەهەموو کەس حەقترە دەستی پێوە بگرێ.

- **زانست و مەعریفە لەبارەی مێژووەوە:**

تەواوی ڕووداوەکانی جەزیرەی عەرەب و بەشێکی فارس و ڕۆم و حەبەشە لە ڕووی مێژووەوە لە سوننەتدا باس کراوە وەك سەرچاوەی زانست و مەعریفە، جگە لەمانە هەر بابەتێك دەتەوێ زانیاری لەسەر کۆبکەیتەوە ئەوە سەرچاوەی دووەم کە سوننەتە قسەو باسی تێرو تەسەلی لەسەر کردووە، بۆیە زانستخواز نابێ بێ ئاگا بێت لە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ گەشەی زانست و زانیاری و مەعریفە. ئەمەی کە لێرەدا باسمان کرد دلۆپە ئاوێکە لە بەحرێکی بێ بنی سوننەت[3].

(١) بوخاری گێڕاویەتیەوە لە صەحیحەکەیدا لە (باب ترجمة الحکام ١٣ / ١٦١ ) .
(٢) ابن ماجه گێڕاویەتیەوە لە (کتاب الزهد باب الحکمة ژ ٤١ ٩) کنز العمال: (ب٠/ل٠ ژ٤٤٠٨٩)
(٣) بڕوانە: السنة مصدر للمعرفة و الحضارة ، د. یوسف القرضاوی، ( ٨٤ — ١٢٥) .

## کەلەپوری ئیسلامی سەرچاوەی زانست و مەعریفە

بەشێکی زۆر لەئومەتان خاوەن کەلەپورێکی زۆرن، ئەم کەلەپورە بۆ هەر ئومەتێك بۆتە ڕەگ و ڕیشە لە ڕووی مێژوویی شارستانیەتەوە، بۆیە تەواوی ئومەتان هەوڵیان داوە ئەم کەلەپورە بپارێزن و وەك سەرچاوەیەکی شارستانی و زانستی و مەعریفە بەکاری بهێنن, بەلاّم هیچ کەلەپوورێك ناتوانێ خۆی لە قەرەی کەلەپووری سێزدە سەددەی ئیسلامی بدات، لەگەڵ ئەوەی بەشێکی تێبینی لەسەرە و کەموکوڕی هەیە, بەلاّم چونکە ئەمانەت و ئەخلاق دوو بنچینەی سەرەکین بۆ گواستنەوەی زانیاری لەتەواوی کەلەپووری ئیسلامی وای کردووە ئەم کەلەپوورە لەم کەموکوڕی و لادانە زۆرە بپارێزرێ ، جگە لەوەش کەلەپووری ئیسلامی سەرچاوەی لە قورئان و سووننەتی صحیحی پێغەمبەر(ﷺ) هەڵێنجاوە, تەواوی لایەنەکانی ژیانی گرتووەتەوە، وەك کەلەپوورەکانی تر گرنگی بەچەند لایەنەك نەداوە و ئەوانی تر پشتگوێ بخات, بۆ نمونە کەلەپووری ئیسلامی پڕە لەزانست و مەعریفەی سیاسی و فکری و پەروەردەیی و فەلەکی و کۆمەڵایەتی ...هتد. ئەمەش سەروەتێکی یەکجار گەورەی بۆ دوای خۆی جێ هێشتووە، بۆتە شوناس و ناسنامەی ئومەی ئیسلامی. پاراستنی ئەم شوناسە بۆ موسوڵمانان مانەوەی مەعریفە و زانستە لە کەلەپوری ئیسلامی.

## کەلەپوور (التراث) مانای چیە؟

کەلەپور بە مانا فراوانەکەی بەهەموو ئەوانە دەوترێت لە بنچینەدا بۆ نەوەی دوای خۆی بە جێ بهێڵێت لە بەرهەمی فکری و ئەدەبی و شارستانیەتی و ماددی و مەعنەوی.

وشەی کەلەپور (التراث) لە زمانەوانیدا ئەوەیە کە مرۆڤ لە دوای خۆیدا بەجێی دەهێڵێ وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿فَهَبْ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنْ ءَالِ يَعْقُوبَ وَاجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيًّا﴾[1]. واتە: (خوایە لە لایەن خۆتەوە کەسێکم پێ ببەخشە, ببێتە میراتگری من و بنەماڵەی یەعقوب و خوایە بیکەیتە کەسێکی ڕەزامەند).

هەروەها: ﴿وَتَأْكُلُونَ التُّرَاثَ أَكْلًا لَّمًّا﴾[2]. واتە: (میرات دەخۆن بە بێ بەهایی و بە سانایی).

هەروەها: ﴿وَوَرِثَ سُلَيْمَٰنُ دَاوُۥدَ﴾[3] . واتە: (سولەیمان بوو بە میراتگری داود).

لە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) دا هاتووە کەلەپور بە زانستی پێغەمبەران لێکدراوەتەوە، کە زانستێکی خوداییە لە ڕێگەی وەحییەوە بۆ پێغەمبەران هاتووە، دواتر لەوانەوە وەك میرات بۆ زانایان بەجێ ماوە (وَإِنَّ الْعُلَمَاءَ وَرَثَةُ الْأَنْبِيَاءِ، وَإِنَّ الْأَنْبِيَاءَ لَمْ يُوَرِّثُوا دِينَارًا، وَلَا دِرْهَمًا وَرَّثُوا الْعِلْمَ، فَمَنْ أَخَذَهُ أَخَذَ

(١) سورەتی مریم ئایەتی ٥ - ٦ .
(٢)سورەتی الفجر ئایەتی ١٩.
(٣)سورەتی النمل ئایەتی ١٦ .

بِحَـظٍّ وَافِـرٍ)[١] واتـە: (بەڕاسـتی زانایـان میراتگـری پێغەمبـەرانن، بەڕاسـتی پێغەمبەران دینارو دەرهەمیان بەجێ نەهێشتووە لەدوای خۆیان، بـەڵکو زانسـتیان بەجێ هێشتوە، هەر کەسێك پشك و بەشی بەر بکەوێ پشك و بەشی بێ شـوماری بەرکەوتووە).

- ابن القیم دەفەرموێت واتای ئەم فەرموودەیە: (إن العلماء ورثة الأنبيـاء" هذا من أعظم المناقب لأهل العلم فإن الأنبياء خير خلق الله، فـورثتهم خـير الخلـق بعدهم)[٢].

واتە: (دانانی زانایان بە میراتگـری پێغەمبـەران لـە گـەورەترین پلـەی ئـەهلی زانسـتە، بەڕاسـتی پێغەمبـەران باشـترین دروسـتکراوی خـوان میراتگرەکانیشـیان باشترین دروسـتکراوی دوای ئەوانن).

- هەروەها لە بەسەرهاتی ئـەبوهورەیرە ڕەزای خـودای لـێبی، کـاتێ بـەلای بازاڕو بازرگانەکان دا تێپەڕی فەرمووی ئێوە چی دەکـەن لێـرە لـە کاتێکـدا وا لـە مزگەوت میراتی پێغەمبەری خودا دابەش دەکرێـت، هەسـتان ڕۆیشـتن بەپەلـە بـۆ مزگەوت هیچیان نەبینی تەنها قورئان و سوننەت و زیکرو زانست نەبێ، وتیان کوا ئەوەی وتت ئەی ئەبا هورەیرە فەرمووی: ئەمە میراتی پێغەمبەری خودایە لە نێوان بەش وەرگرەکان دابەش دەکرێت[٣].

- هەنـدێك جـار وەحـیش بـە کەلـەپوور لێکدراوەتـەوە خـودای گـەورە دەفەرموێت:﴿ ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَـٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ﴾[٤]. واتە: (لـە پاشان ئەم قورئانەمان دا بە کەسانێك و هەڵمان بژاردن).

---

(١) أبو داود گێڕاویەتیەوە (٣/٣١٧) ژ(٣٦٤١) ، ترمذي (٥/٤٨) ژ(٢٦٨٢) ، ابن ماجه (١/٨١) ژ(٢٢٣) .

(٢) بڕوانە: مفتاح دار السعادة (١/٦٦) .

(٣) طبراني گێڕاویەتیەوە لە المعجم الأوسط (٢/١١٥).

(٤) سورەتی فاطر ئایەتی ٣٢.

- **دکتـۆر محسـین عبدالحمیـد:** پێناسـەی کەلـەپور بەمشـێوەیەك دەکـات دەفەرمویێت: (کەلەپور بەرەو بومی شارستانیەتە، کـە دەرهاویێشـتەی تایبەتمەنـدی ئومەتێکە لەو ئومەتانەی کە لەگەڵ ژینگە تێکەڵ بوون و کارلێـك دەکـەن، تێیـدا سـەریان هەڵـداوە، بـە هـەموو ئـەو ڕوداوو ئەزموونانـەی کـە لـەخۆی دەگـرێ بەشێوازێکی تایبەت ڕەنگی دەکات، تا شارستانیەت و ڕۆشنبیری و هەڵسوکەوت و عادات و تەقالیدی ژیانیان بەم ڕەنگە جیادەکاتەوە لە ئومەتانی تر)[1].

- **دکتۆر ئەکرم العمري:** بەشێوازێکی تر پێناسەی کەلەپوور دەکات نزیك لەم بابەتـەی ئێمـە مەبەسـتمانە دەڵێـت: (کەلـەپوور ئـەم میراتەیـە، کـە لـە بـاوك و باپیرانمانەوە بۆ ئیمە بەجێ ماوە، لە عەقیدە و ڕۆشەنبیری و بەها و ئاداب و هونەر و پیشەسـازی و تـەواوی وەدەسـتـهاتووەکانی بەرهـەمی مروڤـەکان لـە مـادی و مەعنەویەوە، هەروەها شمـولی وەحـی خـودایی و (قورئـان و سـونەت) دەکـات لـە پێشان بۆمان بەجێ ماوە)[2].

لێرەدا دەبێ ورد بین، جیاوازیەك بکەین لەنێوان بە کەلـەپور دانـانی قورئـان و سوننەت لەگەڵ زادەی مرۆڤ، لە لای عەلمانییەکان هیچ جیاوازیەك نییـە لـە نێـوان کەلەپورەکان زادەی بەشەری بێت یان دینی، هەمووی بە کەلەپور لێك دەدەنـەوە، بـەلاّم لـە لای ئێمـەی موسـوڵمان قورئـان وسـوننەت ئەگـەر بـە کەلـەپووریش لێکدرابێتەوە ناکرێت هاوتای بکەی لەگەڵ بەرهەمی مرۆڤەکان، قورئان و سوننەتی تـەواوی پێغەمبـەر (ﷺ) قـابیلی هەڵـەو دەسـتکاری نییـە، بـەلاّم کەلـەپوری مرۆڤایەتی با بەرهەمی موسوڵمانانیش بێت هەر هەڵەو کەم وکوڕی تێدایە.

کەواتـە زاراوەی کەلـەپووری ئیسـلامی بـەکاردێت بـۆ تـەواوی بەرهەمـەکانی

---

(١) بڕوانە: تجدید الفکر الاسلامی د. محسن عبدالحمید (ل٢٦) .
(٢) بڕوانە: القران والمعاصرة د. اکرام ضیاء العمری (ل٢٧) .

مرۆڤایەتی لە شارستانیەت و زانست و زانیاری و مەعریفەو گەشەپێدانی مرۆیی کە مرۆڤەکان بەرهەمیان هێناوە، ئەوەی موسوڵمانان بەجێیان هێشتووە لە زانست و زانیاری لە تەواوی دونیا بە جیاوازی زمان و ڕەگەز جوگرافیا پێی دەڵێن کەلەپوور.

کەلەپوری ئیسلامی کورت نەکراوەتەوە لە تەفسیر و حەدیس و فقە و زمان ، زانست و مەعریفەی کیمیای جابری کوری حیان و بیرکاری خوارزمی و پزیشکی و سەیدەلیەی ئیبن سینا و رازی ، جوگرافیای ادریسی و مەقدیسی، نووسراوەکانی فیردەوسی و جەلالدینی ڕومی و ئیبن عەرەبی و با فارسیش بن، ئیبن کەمال پاشا و ئیشق پاشا با تورکش بن، ئیبن صلاحی شارەزوری و ئیبن خەلدون با کوردیش بن ، هەموویان لە کەلەپوری ئیسلامی دەژمێردرێن. بە بەرهەمەکانی کیشوەری ئاسیاو ئەندەلوسیاو فارس و ئەفریقیا و سۆڤیەتیشەوە.

## گرنگی کەلەپووری ئیسلامی

لە قۆناغی دوای نەمانی خەلافەتی ئیسلامی شەپۆلێکی بەهێز لەلایەن عەلمانیەکانەوە دەستی پێکرد بەرامبەر بە کەلەپووری ئیسلامی و مسولّمانان! کاریگەریەکی نەرێنی لەسەر کەلەپووری ئیسلامی دروست کرد، هەروەها بەشێکیش لە مسولّمانان کەوتنە نێو ئەم شەپۆلە و بانگەشایان بۆ دەکرد تا وای لیّ هاتووە بەشێك لە زانستخوازان واتیّ بگەن مێژووی کەلەپووری ئیسلامی نەهامەتی و جەهالەت و خراپەکەرییە و هیچ سوودێکی بۆ ئەم سەردەمە نییە و لەکارکەوتووە، ئەمەش وای کرد زانستخواز ئاوڕ لەم هەموو کەلەپوورە زێڕینە نەداوەتەوە پشتی تیّ بکات و بە نەرێنی باسی بکات، هەر ئومەت و میللەتێك خۆی لە مێژووی کەلەپوری خۆی دابڕیّ خۆی لە شارستانیەت و مێژووی خۆی

دابڕیوە، واتە ئومەتێکی بێ سەروەری شارستانیەتە و جێ پەنجەی لە زانست و مەعریفەدا نەبووە و شارستانیەت و ئاوەدانکردنەوەی بینا نەکردوە، خزمەتی مرۆڤایەتی نەکردووە، ئەمەش تەنها بۆ ئەوەیە مێژووی پڕ لە سەروەری کەلەپووری ئیسلامی بشێوێنن، بۆیە گرنگی بە پاراستنی کەلەپووری ئیسلامی گرنگی دانە بەپەرەپێدانی (١٣) سەدەی زێڕینی مسوڵمانان لە بوارەکانی حوکم و ساسیەت و فکرو فەلسەفەو زمان و پەروەردە و فێرکردن و ثزیشکی و ئەندازیاری و بیرکاری و تەواوی بەشەکانی تری ژیان، پشت کردن لەم هەموو بەرهەم و داهێنانە پشتکردنە لە هەوڵ و کۆششی زانایانی ئیسلامی و بەرهەمە چاپ کراو زانستە تەجروبە کراوەکانیانە. کەلەپووری میللەتان لەگەڵ ئەوەی پڕە لە هەڵەو کەم و کوڕی کەچی گرینگیەکی یەکجار زۆری پێدەدەن و دەیپارێزن، تێکەڵەیەکی زۆر هەیە لە کەلەپووری ئەوان لەگەڵ میللەتانی جیاواز و خاوەن ئایدیای جیاواز، کەچی کەلەپووری ئیسلامی لەژێر پێوەری ئەخلاقی و زانستیدا نووسراوەتەوە و بەرهەم هاتووە، قورئان و سونەتی صەحیحی پێغەمبەر﴿ص﴾ پێوەری بۆ دانەوە، لەژێر بیرو باوەڕی یەکتاپەرستی و بڕوابوون بە پاداشت و سزا بەرهەم هاتووە، بۆ هەر هەوڵ و کۆشش و نووسین و داهێنانێك چاویان لەپاداشت بووە، ترساون لە سزا، ئەمەش گەورەترین پێوەرە بۆ جیاکردنەوە و گرینگی دانی کەلەپوری ئیسلامی و کەلەپووری میللەتانی تر، بۆیە زانستخواز دەبێ زۆر گرینگی بەم کەلەپوورە بدات و بە پێوەری ورد سودی لێ وەرگرێ.

## پێوەر و بنەماکانی هەڵسەنگاندنی کەلەپووری ئیسلامی

بۆ ئەوەی هەڵسوکەوتێکی تەندروست لەگەڵ کەلەپووری ئیسلامی دا بکەین، باش و خراپ، ڕاست و ناڕاست لێك جیا بکەینەوە، مادام ئێمە بەدوای زانستێکی تەندروست و مەعریفەیەکی گشتگیردا دەگەڕێن، پێویستمان بە چەند پێوەرێك

هەیە بۆ هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ کەلەپوور و هەڵێنجاندنی لایەنە باشەکانیەوە لەوانە:

**١ ـ پشکنین لە ڕاستی و دروستی بابەتەکە.**

وتە و نووسراوێکی زۆر لە کەلەپووری ئیسلامی هەیە و دەراوەتە پاڵ پێشینانمان بێ ئەوەی پشکنینی بۆ بکرێت، زانایانی پێشوو بۆ ڕاست و دروستی هەر وتەیەك پێوەریان داناوە تا سەنەدی وتەکان بدۆزێتەوە، بەم پێوەرە دینی ئێمە لەهەموو دین و ئایدولۆژیەکانی تر جیاوازە، هیچ قسەیەك وەرناگیرێ تابەڵکە و سەنەدی تەواوی نەبی، بۆیە کەلەپوریش دەبێ پشکنینی بۆ بکرێ تابگەیتە ئەنجامێکی دروستی زانستی و مەعریفی.

**٢ ـ مافی هەموو تاکێکی شارەزایە ڕەخنەو تێبینی هەبێ لەسەر کەلەپوری وتەی پێشینان.** تەواوی زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن تەنها پێغەمبەران بێتاوانن لە خوار ئەوانەوە دەکرێ هەڵە بکات وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ: (كل بني ادم خطاء)[1]. واتە هەموو مرۆڤێك هەڵە دەکات، هەروەها لە خوار پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەکرێ قسەی ڕەت بکرێتەوە! وەك ئیمامی مالیك دەفەرموێت: (كل احد يؤخذ من قوله ويترك الا اصحاب هذا القبر)[2]. واتە: هەموو کەسێك دەکرێ قسەکەی ڕەت بکرێتەوە، یان وەربگیرێ تەنها ئەم خاوەن قەبرە نەبێ مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ)ە.

(١) دارمی لە سوننەکەیدا گێڕاویەتیەوە (٢/٣٩٢) ژ( ٢٧٢٧) وە حاکم لە مستدرك گێڕاویەتیەوە (٤/٢٧٢) ژ(٧٦١٧)

(٢) بڕوانە: الموطأ لابن مالك.

**٣ ـ دەستگرتن بە بنەمای دڵپاکی و نیازپاکی (ویژدان) لەکاتی ڕەخنەگرتن لەکەلەپووری ئیسلامی**

نیاز پاکی بنامەیەکی قورئانییە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُواْ ۚ ٱعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ ﴾[1]. واتە: (ئەی گەلی خاوەن باوەڕ! هەمیشە و بەردەوام هەوڵ بدەن، کە لەبەر خوا دادگەر و ڕاست و، پابەندی گشت بڕیارو فەرمانەکانی بن بە دادگەرانە شایەتی بدەن و، بەلای هیچ لایەکدا مەبڕن، تەنانەتی منداڵەکانیشتان، خەشموقین و دوژمنایەتی هیچ کەس و هیچ لایەك، واتان لێ نەکات بەعەداڵەت ڕەفتار نەکەن دەبێ لەگەڵ مەردم دادگەر بن، چونکە بێگومان ڕەفتاری دادگەریی و یەکسانی بە تەقواوە نزیکترەو پارێزگاری سنوورەکانی خوای پێدەکرێت).

لەکاتی ڕەخنەگرتن لە کەلەپووری ئیسلامی پێویستمان بەوەیە زیادەڕەوی و کەمتەرخەمی نەکەین ، هەروەها دەمارگیری و لایەنگریکردن بنەمایەکی هەڵەیە و نابێ بەکار بهێندرێ، بۆ ئەوی زانست و مەعریفەیەکی تەندروست بەرهەم بهێندرێت[2].

**ئیبن القیم**: لەم بارەیەوە وتەیەکی جوانی هەیە دەفەرموێت: (الطائفة الثالثة: وهم اهل العدل والانصاف الذين اعطى كل ذى حق حقة، وانزلو كل ذى منزلة منزلته، فلم يحكموا لصحيح بحكم السقيم المعلول، ولا للمعلول السقيم بحكم صحيح بل قبلوا ما يقبل، وردوا مايرد)[3].

(١) سورەتی المائدە ئایەتی ٨ .
(٢) بڕوانە: الهوية والمرجعية الاسلامية واثارهما فى الدستور، سالم عبدالسلام الشيخى (ل ٧٠).
(٣) بروانە: مدارج السالكين لابن القيم، (٢-٤٠).

(واتە تائیفەی سێیەم: ئەهلی عەدالەت و نیاز پاکن، بەشێوەیەك حەقی هەموو خاوەن حەقێك دەدەن، هەروەها هەر خاوەن پێگەیەك لە شوێن پێگەی خۆی دادەنێت، بڕیار لەسەر ڕاستی نادات لەسەر پێوەری نادروست و دەردەدارێك، هەروەها بڕیار لەسەر ناڕاستیەك وەرنادات بەپێوەرە ڕاستییەکان، بەڵکو ئەوانە قبووڵ دەکەن کە قبوڵ کراون، ئەوانەش ڕەت دەکەنەوە، کە ڕەتکراونەتەوە).

## چۆن کەلەپووری ئیسلامی بکەینە سەرچاوەی زانستی و مەعریفە؟

زانستخواز کاتێك دەیەوێت کەلەپووری ئیسلامی بکاتە سەرچاوەی زانست و مەعریفە، دەبێ کەلەپووری ڕەسەن و دەخیل لێك جیابکاتەوە، ئەم کەلەپوورەی لەکەڵ ئەصڵی ئیسلام ڕوحی دا دێتەوەو گونجاوە لەگەڵ ئەوەی دەخیلە و خورافیاتە، تێك دەگیرێ لەگەڵ ئیسلام و عەقڵ و مەنتق و لۆژیك و زانست. بەم تێڕوانینە وشیارانە کەلەپوور هەڵدەسەنگێنی نابێ بەچاوی پیرۆزی و بێ هەڵە و پەڵە تەماشای کەلەپوور بکرێت، بەڵکوو بە چاوی وردەکاری و پشکنین و جیاکردنەوە و هەڵێنجان تەماشا بکرێ، هەموو ئەو کەلەپوورانەی هەیە مەرج نییە لەسەر ئیسلام حیساب بێت و تەواو ڕاست بێ، زۆر کەلەپوور هەیە هەڵە و ناڕاستە، دەبێ پشتگوێ بخرێت و نابێتە سەرچاوەی زانست و مەعریفە بۆ زانستخوازان، بەشێك لەم رەخنانەی لە بەشێك لە کەسایەتی ئیسلامی و پەرتووك و مامۆستایانی ئایینی دەگیرێ بەبێ هەڵێنجاندن و جیاکردنەوە، هۆکارەکەی ئەوەیە کەلەپوور نەقڵ دەکەن بەبێ پشکنین ، یان هەندێ جار وەك دەقی قورئان و فەرموودەی صەحیح مامەڵەی لەگەڵ دەکەن، دواتر ئەمە چونکە بەرهەمی مرۆڤە هەڵە دەردەچێ خەڵك بەچاوی دەق تێی گەیشتووە، کاتیك لەگەڵ زانست یان واقع نایەتەوە واتێدەگەن کەئەم دینە ناتوانێ لەگەڵ واقیع هەڵبکات، لەگەڵ زانست تێك

دەگیرێ، بە تایبەتی ئەوانەی قسەو لێکدانـەوەی زانایـان وەك دەق تەماشـادەکەن، یان لە کاری سیاسی حیزب و گرووپەکان حوکمی پێ دەکەن، وا لە خەڵك دەگەیەنن ئەمە دەقە وا فەرمان دەکات نەك قسەو تێگەیشتنی زانایەکە، بە تایبـەتی تـریش لە بابەتی تەکفیرکردن و سنوور (الحدود)، بەشـەکانی تـر. بەشـێك لـە کەلـەپووری ئیسلامـی سۆفیگەری ناتەندروست و ئـەهلی کـەلام و حـوکمی بنەماڵـە و سـتەم و بابەتی فۆلکلۆری و فەلسەفەی ناتەندروست و نیقاشی بێسود بووە!، ئەمانە گەرچی کەلەپوری ئیسلامیشـن بـەلاّم وەك سەرچـاوەی زانسـت و مـەعریفی نـاژمێردرێن، دەبێ زانستخواز خۆی لەمانە بپارێزێ، کەلەپووری ئیسلامی ئەوەندەی پاك و چاك تێدایە پێویست بە خورافیات و ئەفسانەو لاری ناکات بیکەیتە سەرچاوەی زانسـت و مەعریفەی خۆت. لەلایەکی ترەوە لە (١٣) سەدەی ڕابردوو هەزاران گرفت ڕووی لە جیهانی ئیسلامی و موسڵمانان کردووە، سولّتان و زانایـان بـەپێی تێگەیشـتنی سەردەمی خۆیان چارەسەریان بۆ دۆزیتەوە بۆ زەمەن و کات و شوێنی خۆی، ئەمـە بۆتە کەلەپور لەوانەیە نـەگونجێ بـۆ سـەردەمی ئێسـتا، یـان لەگـەڵ پێشـکەوتن و شارستانیەتی ئێستا و گرفتەکان گۆرانکارییان بە سەردا هاتووە، ناکرێت بەپێوەری سەدەکانی پێشـوو هەڵسـوکەوت لەگـەڵ ئـەمرۆ بکـەی. زانایـان خـودا پاداشـتیان بداتەوە لە هەموو بوارێك زانستیان بەجێ هێشـتووە، بـەلاّم مـەرج نییـە مـەرج و پێوەرەکانیان بۆ ئەم سەردەم و کات و شوێنە گونجاو بێت، بۆیە زانستخواز دەبێـت زۆر بـە هەسـتیاریەوە هەڵسـوکەوت لەگـەڵ کەلـەپووری ئیسـلامی دا بکـات وەك سەرچاوەی زانست و مەعریفـە بـەکاری بهـێنێ، بـەلاّم بـەم زانیـاری و وشـیاری و وردبینیەی لەپێشدا باسمان کرد.

## هەمەچەشنی زانست و مەعریفە لە کەلەپووری ئیسلامی دا

زانایان گرنگیەکی زۆریان بە تەواوی زانستەکان داوە، لە تەواوی بابەتەکانیان نوسیووە بابەتی شارستانی و زانستی و مێژووی و دینی و کۆمەلأیەتی و شیعر و پەخشان و زمان و فەلسەفە و فیکر و فەرهەنگ و بابەتەکانی زانستی مرۆیی و تەنانەت پزیشکی و ئەندازیاری و فەلەکیشی گرتۆتەوە، ئەمانە بووەتە سەروەتێکی گەورەی کەلەپوری ئیسلامی بۆ ئێمە، بۆ هەر فەترەیەکی زەمەنی ناوی تەواوی نووسەر و کتێبەکان و جۆری بابەتە زانستی و مەعریفیەکەش نوسراوەتەوە، تا زانستخواز بزانێ بەرهەمە مەعریفیەکان چین. بۆ نموونە (محمد بن اسحاق الندیم) کتێبێکی لەم جۆرە داناوە بەناوی (الفهرست) تا سەدەی چوارەمی هێناوە، تێیدا تەواوی بەرهەمەکانی باس کردووە، لە بارەی زمانی میللەتان، شەریعەتی دابەزێندراو، (نحو) (صرف) ،اخبار و الاداب ، فقه و الفقهاء ، سیره والنسب، محدسین و فەلسەفە ، موسیقا و هونەر ، بیرکاری، سیحر و کەهانە ، مەزهەب و عەقائید ، کیمیاو فەلەك ، بابەتەکانی تر، چەندان کتێبی تر لەم جۆرە زورترین زانیاری لەسەر کەلەپووری ئیسلامی تێیدا کۆکراوەتەوە.

## سەرچاوە کانی تری مەعریفە و زانست:

سەرچاوەکانی زانست و مەعریفە جگە لەبوارە نەقلیەکان کە قورئان و سونەتی صحیحی پیغەمبەرە (ﷺ) دواتر کەلەپوری موسڵمانان بەشێکی گەورەیە لەسەرچاوەی پەیداکردنی زانست و زانیاری و مەعریفە، لەدوای ئەوانە ئەندامە هەستیارەکان دین وەك عەقڵ و دڵ و هەستیارەکانی تر، عەقڵیش بەکۆمەڵێك شێواز لێکدراوەتەوە، بەنموونە:

١- عــەقڵ ئــەم بەخششــە خوداییــە، کــە دراوەتــە پــاڵ مــروڤ و مروڤــی لەبونەوەرەکانی تر جیاکردووەتەوە.

٢- هەروەها عەقڵ بەمانای مەعریفەو زانیاری فیتری و زانستیە زەروریـەکان دیت بو هەموو عاقڵمەندان وەك بڵێی ( ژمارە یەك نیوەی ژمارە دووە).

٣- هەروەها عەقڵ بەکارهاتووە بەمانای زانستە تیۆریەکان کە بەرگەی بەڵگە و دەلیل بەدەست دێت.

٤- هــەروەها عــەقڵ بــەکار هــاتووە بــەمانای کــارکردن بەپێــوەری زانســتی، ئەمــەیان بووەتــە هۆکــار بــۆ چــوونە نیــو جەهەنــەمی کــافران وەك خــودای گــەورە دەفەرموویت: ﴿ وَقَالُواْ لَوۡ كُنَّا نَسۡمَعُ أَوۡ نَعۡقِلُ مَا كُنَّا فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴾(١). کەواتە عەقڵ دەورێکی زور گرنگی هەیە لەوەدەستـهینانی زانست و زانیاری و مەعریفـە، بەکورتی ئاماژە بەعەقڵ دڵ و هەستیارەکان دەکەین .

## یەکەم:عـەقڵ.

عــەقڵ ئــەم بەخششــە خوداییــە، کــە مرۆڤــ لەســەرجەم بونــەوەرەکانی تــر جیادەکاتەوە. بــەهۆی عەقڵــەوە مرۆڤــ لــە دروســتکراوە سەرپشــکەکانە، بــەهۆی عەقڵــەوە ســەرجەم دروســتکراوەکانی دونیــا بــۆی ڕام کــراوە و ئــەو ســەردار و بەڕێوەبەریانە، لەگەڵ بەشەکانی تریشەوە لە لاشەی خۆی پەیوەندییەکی زۆر بــەهێز هەیە لەنێوانیان، هەر عەقڵە ڕاستی و ناڕاستی لەیـەك جیادەکاتـەوە ، دڵ ڕوونـاك دەکاتەوە ، زانیاری ڕاستەقینە کۆدەکاتەوە، فکری ئیسلامی لەسەر بینا دەکات.

بۆیە ئیمامی جورجانی زۆر جوان بۆی چووە و پێناسەی کردووە و دەفـەرموێت: (العقل: نور في القلب يعرف الحق والباطل )(٢)، واتـە: عـەقڵ نورێکـە لـە دڵـەوە و

(١) سورەتی الملك ئایەتی١٠.

(٢) بڕوانە: التعريفات للجرجاني (ب١- ل١٩٧) .

هەق و ناهەقی پێ دەناسێتەوە ، هەموو زانیاریەکیش سەرچاوە دەگرێت لە جیاکردنەوەی هەق و ناهەق . هەر لەبارەی پێناسەی عەقڵەوە گوتراوە: (ما يعقل به حقائق الاشياء)، واتە: عەقڵ ئەوەیە بۆ ڕاستی و دروستی شتەکانی پێ دیاری بکەی و تێی بگەی.

کەواتە عەقڵ: هۆکارێکە یان ئالیەتێکە بۆ وەبەرهێنانی هزر و بیر و فکر بەگشتی، لە فکری ئیسلامی عەقڵ ئامرازێکە بۆ تێڕامان و وردبوونەوە لە (وەحی) و هەڵێنجاندنی زانستی و مەبەستەکانی، تێڕامان لە بونەوەر بۆ زانستی یاساکانی گەردوون.

## دووەم: دڵ.

مەبەستمان لە دڵ ئەم پارچە گۆشتە نییە، کە لەلای چەپی سنگی مرۆڤە و ڕۆژانە چەندین لتر خوێنی بۆ بەشەکانی تری لەش دەنێرێت، بەڵکوو مەبەست لە دڵ ئەم بەخششە خودایییە کە قورئان دەیان کاری زۆر گرنگی بۆ دیاری کردووە هەموویان پەیوەندییان بەڕاستەوخۆ و ناراستەوخۆ بە زانست و زانیاری و مەعریفە هەیە بەشێکیان دەخەینە ڕوو:

١. دڵ شوێنی باوەڕهێنانە تەنانەت باوەڕ بەبێ جێگیرکردنی لەناو دڵ قبوڵ نییە، ئەمەش بەشیکی سەرەکیە لەزانست و مەعریفە، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَلَمۡ تُؤۡمِن قُلُوبُهُمۡۛ﴾[1]، واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) باغەمبارت نەکات ئەوانەی کە بەپەلە بەدەم بێباوەڕی و بێ دینیەوە دەچن، لەوانەی کە بەدەم و زار دەڵێن: باوەڕمان هێناوە، بەڵام دڵیان باوەڕی نەهێناوە .

(١) سورەتی المائدە ئایەتی ٤١ .

٢. دڵ ناوەندی زیاد و کەمی ئیمانە. ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ﴾[١]، واتە: (بێگومان ئیماندارانی ڕاستەقینە تەنها ئەوانەن: (یەکەم) کە کاتێك ناوی خوا برا، ئەوە دڵەکانیان دەترسێت و دەهەژێت).

٣. دڵ ناوەندی ترسانە لەخودا، سەرداری زانست و مەعریفە ترسانە لەخودا: ﴿وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعۡبَۚ﴾[٢]، واتە: ( ئەوسا خوا ترسێکی فڕێدایە دڵیانەوە)

٤. دڵ ناوەندی ئارامی لاشە و دەروونە: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ﴾[٣]، واتە: (ئەوانەی باوەڕیان هێناوە دڵ و دەروونیان ئارام دەبێت بە قورئان و پەیامەکەی خوای پەروەردگار، ئاگاداربن دڵەکان: هەر بە قورئان و یادی خواو (پابەندبوون بەئاینەکەیەوە) خۆشنوود دەبن و دەحەوێنەوە).

٥. دڵ ناوەندی نەخۆشی مەعنەویە: ﴿لِّيَجۡعَلَ مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ فِتۡنَةً لِّلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلۡقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمۡۗ﴾[٤]، واتە: (خوای گەورە بۆیە ئەو دەسەلاتەی داوە بە شەیتان تائەو (خەتەرەو خەیاڵ و وەسوەسەیەی) شەیتان فڕێی دەداتە نێو ئاواتی پێغەمبەرانەوە ببێتە هۆی سزاو تاقیکردنەوە بۆ ئەوانەی لە دڵ و دەروونیاندا نەخۆشی دوو ڕوویی و ناپاکی هەیە و بۆ ئەوانەش کە بەرامبەر ئایینی خوا دڵڕەقن،).

٦. دڵ کانگای ڕەق بوونە لەکاتی دوورکەوتنەوەی مرۆڤ لە (ئیمان): ﴿فَوَيۡلٌ

---

(١) سورەتی الانفال ئایەتی ٢ .
(٢) سورەتی الحشر ئایەتی ٢ .
(٣) سورەتی الرعد ئایەتی ٢٨ .
(٤) سورەتی الحج ئایەتی ٥٢ .

لِّلْقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ﴾[1]، واتە: (هاوار و وەیل بۆ ئەوانەی کە دڵیان ڕەقە لەئاستی قورئان و یادی خوادا).

﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِىَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ۚ﴾[2]، واتە (پاشان لەوەدوا دڵەکانتان ڕەق بوو، (ئەی جولەکەکان) هەر وەك بەرد، بەڵکو ڕەقتریش).

٧. دڵ یەکەم بەشە کە لەلاشە لە ئیمان دور دەکەوێتەوە بەکوێر وەصف دەکرێت:

﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ۖ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ﴾[3]، واتە : (ئایا ئەوانە بەسەر زەویدا نەڕۆیشتوون بە دڵ و دەروونێکی هۆشیارەوە تا بیرێك بکەنەوە (کوان : خەڵکانی ڕابوردوو ؟ ئەو شارانە بۆ کاولکران ؟ کێ ئێمەی دروست کردووە ؟ ئامانج لە ژیان ؟؟) یان خاوەنی گوێ و دەزگای بیستن نەبوون بەسەرهاتەکانیان ببیستن و لێکی بکەنەوە ، جا وەنەبێت چاوان کوێر بووبێت ، بەڵکو ئەو دڵانە کوێر دەبن کە وان لە سینەکاندا (چونکە هەر ڕواڵەت دەبینن و ناوەڕۆك لێك نادەنەوە) .

٨. دڵ ناوەندی ترسان و مل کەج بونە بۆ خودای گەورە: ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ ۖ﴾[4]. واتە: (ئایا ئیتر کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ ئەوانەی کە باوەڕیانهێناوە، دڵەکانیان بە نووری ئیمان ملکەچ و ڕووناك بووەتەوە،

---

(١) سورەتی الزمر ئایەتی ٢٢ .
(٢) سورەتی البقرة ئایەتی ٧٤ .
(٣) سورەتی الحج ئایەتی ٤٦ .
(٤) سورەتی الحديد ئایەتی ١٦ .

ترسی خوای تێدا بڕوێنن بەهۆی یادی بەردەوامی خوا و ئەو قورئانەی کە ڕەوانەکراوە، وەك ئەو کەسانە نەبن کە کتێبی ئاسمانییان بۆ ڕەوانەکرا، بەڵام دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی دوورودرێژ، دڵیان ڕەق و ڕەش بوو).

٩. دڵ ناوەندی بیرکردنەوەیە بەهاوکاری عەقڵ : ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَٰكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ ﴾ (١) . واتە : (ئایا ئەوانە بە زەویدا نەگەڕاون تا دڵیان هەبێ بیری پێ بکەینەوە یان گوێیان هەبێ گوێی پێ بگرن لە ڕاستیدا چاوەکان کوێر نابن بەڵکو ئەو دڵانە کوێر دەبن کە لە سینەکاندان).

١٠. دڵ پەیوەندی ڕاستەوخۆی بەگوێ گرتنەوە هەیە.

﴿وَنَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ﴾(٢)، واتە: ( ومۆرمان دەنا بەسەر دڵەکانیاندا، جا ئەوان نابیستن).

١١. دڵ پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بە فێربوونەوە.

﴿رَضُوا بِأَن يَكُونُوا مَعَ الْخَوَالِفِ وَطَبَعَ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾(٣)، واتە: (ڕازین لەگەڵ پیرەژنان و پەککەوتواندابن و بمێننەوە، خوایش مۆری ناوە بەسەر دڵیاندا، بۆیە ئەوانە نازانن (خێر لە چیدایە)).

١٢. دڵ پەیوەندی ڕاستەوخۆی لەگەڵ گشت بەشەکانی لاشەوە هەیە ئەگەر چاك بوو سەرجەم کارەکان، کە لاشە دەیکات چاك دەبن ئەگەر خراپ بوو سەرجەم کارەکان کە لاشە دەیکات خراپ دەبێت. پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: (الا ان في الجسد مضغة اذا صلحت صلح الجسد كله واذا فسدت فسد الجسد كله ألا وهي

(١) - سورەتی الحج ئایەتی ٤٦ .

(٢) سورەتی الاعراف ئایەتی ١٠٠ .

(٣) سورەتی التوبە ئایەتی ٩٣ .

القلب)[١]، واته (ئاگادار بن پارچەیەك هەیە لە لەش ئەگەر چاك بـوو ئـەوە هـەمو لاشەی چاك دەبێ، ئەگەر خراپ بوو ئەوە هەموو لاشەی خراپ دەبی ، ئاگادار بـن ئەمە پارچە گوشتە دڵە).

ئـەم ئایـەت و فەرمودانـەی پێغەمبـەر (ﷺ) کـە پەیوەنـدی دڵ بەسـەرجەم بەشەکانی لاشە دەردەخات، فکری ئیسلامی دەوڵەمەنـد دەکـات و سەرچـاوەیەکی زۆر سەرەکی وەدەستـهێنانی زانیاری و زانست و مەعریفەیە لە فکری ئیسلامی.

کاتێك دڵ ناوەندی جێگیربوونی ئیمانە ، ئیمانیش بڕیار لەسـەر یەکتاپەرسـتیی خودا دەدات. کەواتە دڵ ڕێگایەکی زۆر سەرەکی وەدەستهێنانی زانست و زانیاریی و مەعریفە لە فکری ئیسلامی و ناکرێ فەرامۆش بکرێ.

## سێیەم: پێنج هەستیارەکەی مرۆڤ

ئەم پێنج هەستیارە وەسیلە و ڕێگان بۆ پەیـبردن بە شتە ماددییـەکان, لـەوێوە دەبێتە سەرچاوەیەکی تـری زانسـت و مەعـریفـە بـۆ مرۆڤـەکان، گـوێ هەڵدەسـتێ بەکاری گوێـگرتن و چاو بۆ بیـنین و لـووت بـۆ بـۆنکردن و زمـان بـۆ تامــکردن و پێسـت بـۆ هەسـت کـردن، ئـەم هەسـتیارانە بـۆ ئـەوەی لەگـەڵ جیهـانی دەرەوە پەیوەندییمان هـەبێ زانسـت و مەعریفـە کۆبکەنـەوە لـەریی خویانـەوە مروڤـەکان دەولەمەند بکەن، خودای گەورە لە بارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا﴾[٢]. واتە: (ئەی ئینسان) لەشتێك مەدوێ و شوێنی شتێك مەکەوە کە زانست و زانیاریت دەربارەی نییـە، چـونکە بەڕاسـتی دەزگاکـانی بیسـتن و بیـنین و تێگەیشـتن هـەر هـەمووی بەرپرسیارە لە بەرامبەریەوە).

ئەم هەستیارانە گشتیان ئامرازن بۆ زانست و زانیاری و مەعریفە.

(١) بوخاری گێڕاویەتیەوە (١/ ٢٠) ژ(٥٢)، هەروا موسلم (٥/ ٥٠) ژ(١٥٩٩) ژ(١٠٧) .
(٢) سورەتی الاسراء ئایەتی ٣٦ .

دەرئەنجام و بەروبوم

١- یەکجار ئەم ڕێبەرە بخوینەوە دەبیتە خاوەن روئیای تایبەتی و بەرچاوت ڕون دەبێت.

٢- زۆر بابەتی فکری پەنهان هەیە لەبارەی ڕیبەری زانستی لەجیهانی ئیسلامی کراوە لێرەدا ڕونکراوەتەوە.

٣- لیرەدا گرنگی خویندن و زانستت بۆ دەر دەکەوێ لەمیژوی ئیسلامی چەندە هەنگاوی گرنك هاویژراوە تائەوانی گەیاندوتە لوتکە.

٤- ئاسۆی بیرکردنەوەت فراوان دەبێت ، بەشێوازێکی فکری لەبابەتی خوێندن و خویندنەوەو مەنهەج دەڕوانی.

٥- داڕشتنەوەی ڕێبەر (المنهج) بۆ هەموو سەردەم و کات و شوێنێك پیویستیەکی گرنگی هەستانەوەو گۆڕانکاریە.

٦- هەموو سەردەمێك خویندن و زانست سەرچاوەی یەکەم بوە بۆهەستانەوەو پێشکەوتن.

٧- هەر هەنگاوێك بۆ ئاوەدانی و شارستانیەت و پێشکەوتن بێ زانست بنەمای سەرەکیە.

٨- میللەتان تا ڕێبەری خوێندنیان چاك نەکردوە نەیان توانیوە بگەنە ئەنجام.

٩- داڕشتنی ڕێبەری زانستخوازی لەسەر بنەمای قورئان و سونەتی صەحیحی پێغەمبەر(ﷺ) ڕێنوینی و بەرچاو ڕونیە بۆ زانستخوازان.

١٠-ڕۆژئاوا زۆر سودیان لەزانست و ڕیبەری موسڵمانان وەرگرتوە ئێستا گەیشتونەتە لوتکەی پیشکەوتنی تەکنەلۆژیا بەداخەوە ئێمە نەمانتوانیوە لەم سەد ساڵەی دوایی سودی لێ وەرگرین.

١١- تاوەکو ئیصلاحی مەنهەجی خویندن نەکەوین بەئاسانی ناتوانیین ئیصلاحی سیاسی و ئابوری و فکری و تەواوی بەشەکانی تر بکەین.

١٢-ئەم ولاَتانەی هەلْساونەتەوە بەپلەی یەك گرنکیان بەڕێبەری زانستی داوە وەك ئیبن بادیس کردی لەجەزائیر.

١٣- ڕۆژئاوا بەتێکدانی مەنهەج لەجیهانی ئیسلامی توانی بەسەر تەوای ناوچەکەدا زالْ بێت.

١٤- بەخویندنەوەی ئەم کتێبە دەبیتە خاوەن بیروکەی سیاسەتی تەعلیمی چەندە گرنگەو چون ئایدیولوژیاکانی رۆژئاوا لەم ڕێەوە فکری خۆیان بەسەر جیهانی ئیسلامیدا زالْ کردوە.

١٥- مەعریفە لەگەلْ زانست دەتوانن کەسایەتی فکری دروست بکەن بەبێ مەعریفە زانست ئەنجامی نابێ.

١٦-بەشێك لە گرفتی گەورەی جیهانی ئیسلامی و زانستخواز ئەوەیە نازانێ لەکێوە کەوتوەو نەخوشیەکەی چیە؟.

١٧-عەلمانیەت لەڕێی دەزگاکانی خویندن بیری عەلمانیەت بلاْودەکاتەوە.

١٨- هیچ ئایدیولوژیایەك بەئەندازەی ئیسلام خاوەن سەرمایەی زانستی نیە کەچی ئەوان لەپیێشن ئیمە لەدواوە، هوکارەکەی نەبونی مەنهەجی تەندروستە.

١٩- هەستانەوە کارێکی ئاسان نیە بەلاْم هەر کاتێك زانیمان برینەکەمان لەکێیەو بوچی کەوتوین هەستانەوەمان ئاسانە.

٢٠- میژوی ئێمە شانازیە بوٚ مروٚڤایەتی بەتایبەتی میژووی زانستیمان ئاوڕدانەوەو نویٚ کردنەوەی کاری سەرەکیمان دەبیٚ ئەمەش هەنگاوێکی بچوکە.

کوتایی

وەك لەسەرەتاکەش ئاماژەم پیٚ کرد ئەم بابەتە ئاسان نیە و کارێکی زۆر

ئەستەمە پیویستی بەلیژنـەو دەسـتەی بـالاّ هەیـە، بـەلاّم لەبـەر پێویسـتی بەهـەر شێوازێك بێت بڕیاری نوسینم دا ئومید دەکەم لەگەڵ بابەتـە فکریـەکانی تـر ببنـە پاکێکیـك و بنـەمای هوشـیاری فکـری و مەنهـەجی تێـدا دەر کـەوێت، هـەروەها هەولێك بێت بۆ بەرچاو ڕونی زانستخوازان و ماموستایانی ئاینی ، پێم وایـە هـەر کەسێك بەوردی بیخوینێتەوە جارێکی تـر بەکـەلك عەلمانیـەت نایـت و کەسـێکی ڕاوەستاوو خوڕاگرو خاوەن پەیامی لێ دەردەچێت، دەزانێ گرفتی بەربونەوەو بـوون بەعەلمانی بەشێك لە زانستخوازان و ماموّستای ئـایینی چیە، لـەکێ تێکـەوتون و دۆڕاون، ئەوەی پێگابم لەخودای بالاّ دەست و خاوەن بەزەییە ئەوەی هەڵەشم کردبێ بـێ گومـان لەنەفسـی خـۆم و شـەیتانەوەیە بۆیـە چـاوم لـەدوعای خێـری ئێوەیـە، دەپارێمـەوە دەڵـێم: ﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ ﴾ آل عمران: ٨ . أمين.

وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ.

١٨-٤- ٢٠١٩. هەولێر,

## سەرچاوەكان.


١. القران الكريم.
٢. تفسير النسفي.
٣. الفوائد ابن القيم .
٤. اثار ابن باديس.
٥. اخلاق العلماء للآجرى.
٦. الاداب الشرعية.
٧. أزمة العقل المسلم.
٨. الازمة الفكرية.
٩. أسس و موجهات بناء المنهج الجامعي المؤصَّل.
١٠. اشكالية التعامل مع السنة النبوية.
١١. اصول العلم ومنهجيته الاقراء والدرس .
١٢. الاعجاز العددي في القران الكريم .
١٣. انتقال العلوم العربيَة والحضارة الاسلامية الى الغرب.
١٤. البداية والنهاية.
١٥. بيَان الاسلام للرد على شبهات حول الاسلام.
١٦. بيان العلم اصلية.
١٧. بيان مراحل التكوين العلمي لطالب العلم.
١٨. بيَت الحكمة كيف اسس العرب لحضارة الغرب
١٩. بيَت الحكمة كيف اسس العرب لحضارة الغرب.
٢٠. تاريخ التربية لاسلامية.
٢١. تاريخ الحضارة المصرية.
٢٢. تاريخ الخلفاء.
٢٣. تاريخ دمشق .

٢٤. تاريخ علماء المستنصرية.

٢٥. تەفسیری ئاسان.

٢٦. تجديد الفكر الاسلامى.

٢٧. تحولات الفكر والسياسية فى الشرق والغرب.

٢٨. تذكرة الحفاظ .

٢٩. التربية الاسلامية نظمها، وفلسفتها تاريخها .

٣٠. التربية عبر التاريخ من العصور القديمة حتى اوائل قرن العشرين.

٣١. التعريفات للجرجانى.

٣٢. تفسير ابن كثير .

٣٣. تفسير البغوي.

٣٤. تفسير السمعاني.

٣٥. تفسير الطبري.

٣٦. تفسير القرطبيَ.

٣٧. تفسير النيسابوري = غرائب القرآن ورغائب الفرقان .

٣٨. التفسير الوسيط .

٣٩. تفسير بحر العلوم .

٤٠. تفسير عبد الرزاق.

٤١. تهذيب الكمال .

٤٢. جامع الأحاديث القدسية.

٤٣. جامع البيان العلم و فضله.

٤٤. جامع الترمذي.

٤٥. جامع بيان العلم وفضله .

٤٦. الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع.

٤٧. الجفوة المفتعلة بين العلم والدين .

٤٨. حاشية ثلاثة الأصول.

٤٩. حضارة العرب.

٥٠. حلية الأولياء وطبقات الأصفياء.

٥١. خصائص حضارتنا.

٥٢. الخطط المقريزية.

٥٣. دراسات فى الفكر الاسلامى.

٥٤. الدرس فى التاريخ المدارس.

٥٥. رسائل في الأديان والفرق.

٥٦. زغل العلم.

٥٧. زهرة التفاسير.

٥٨. السنة مصدر للمعرفة و الحضارة .

٥٩. سنن ابن ماجه.

٦٠. السنن الصغرى .

٦١. سير أعلام النبلاء للذهبيَ.

٦٢. شرح النووي على صحيح مسلم.

٦٣. شرح كشف الشبهات ويليه شرح الأصول الستة.

٦٤. شرف اصحاب الحديث.

٦٥. صحيح ابن حبان.

٦٦. صحىح البخارى.

٦٧. الطب النبؤي للذهبيَ.

٦٨. طبقات الفقهاء الشافعيين.

٦٩. العلم و بناء الامم.

٧٠. علوم الحضارة الإسلامية ودوورها الإنساني.

٧١. غزو في الصميم، دراسة واعية للغزو الفكري والنفسي والخلقي والسلوكى.

٧٢. فتح الباري.
٧٣. الفتوح الاسلامية .
٧٤. الفصل فى الملل والنحل.
٧٥. الفكر الاسلامى فى مواجهة الغزو الثقافى.
٧٦. قالوا عن الاسلام.
٧٧. القرآن والمعاصرة .
٧٨. القران والنظر العقلي.
٧٩. مجموعة الفتاوى.
٨٠. مختصر المفاهيم المفتاهية لنظرية المعرفة فى القران الكريم.
٨١. المدخل إلى مذهب الإمام أحمد.
٨٢. المزيد من المنهجية في الطلب العيلم . مقالة
٨٣. المستدرك للحاكم.
٨٤. مسند أبيَ داود.
٨٥. مسند أحمد.
٨٦. مسند البزار.
٨٧. مجموعة الفتاوى لابن تيمية.
٨٨. المشروع الاسلامى المعاصر امام التحديات.
٨٩. مُصنف ابن أبيَ شيبة.
٩٠. معاني القرآن .
٩١. معاهد التربية الاسلامية.
٩٢. معجم الادباء.
٩٣. مفتاح دار السعادة.
٩٤. مفردات الالفاظ القران.
٩٥. أهمية السياسة التعليمية في العملية التعليمية. مقالة.

٩٦. مقاييس اللغة.

٩٧. مقدمة ابن خلدون.

٩٨. المكتبات فى الاسلام .

٩٩. ملخص بحث عن اوضاع التعليم الاسلامي في جمهورية تركيا العلمانية.

١٠٠. من روائع حضارتنا.

١٠١. المنهاج والمنهجية، طبيَعة المفهوم وأهميته والمفاهيم والمصطلات ذات العلاقة

١٠٢. المنهجية في التعليم الشرعي ، مقالة.

١٠٣. موسوعة التبشير والاستشراق والدعوات الهدامة.

١٠٤. موسوعة الجنة.

١٠٥. نصائح و درر فى طلب العلم، مقاله.

١٠٦. النظام الحكومة النبوية .

١٠٧. نظرات فى دراسة التأريخ الاسلامى.

١٠٨. النظريات العلمية الحديثة.

١٠٩. الهوية والمرجعية الاسلامية واثارهما فى الدستور.

١١٠. ويكيپيديا الموسوعة الحرة.

# ناوەڕۆک

# ڕێبەری زانستخوازان

لەماوەی سەد ساڵی رابردوو، بەهۆی سەرهەڵدانی ڕابوونی ئیسلامی لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، زۆرترین بیرۆکە و مەدرەسەی جیاواز، کەسایەتی خاوەن فکر، ڕای جیاواز و ئامراز بۆ کارکردن لە جیهانی ئیسلامی سەریان هەڵداوە، هەموویان کاریگەری جیاوازیان لەسەر کۆمەڵگا و تاکەکانی کۆمەڵگا داناوە،

هەریەکە بەشێوازی جیاجیا، بەشی زۆری هەوڵ و تەقەلایان بۆ پێگەیاندنی زانستخوازان و، بیرمەندان و بانگخواز و مامۆستای ئایینی و، دروستکردنی کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوو شارەزا و ڕۆشەنبیر بووە، تا دەگاتە گێڕانەوەی حوکمی خودا.

سروشتی مرۆڤ وایە، کاتێک دەیەوێت هەنگاوێک بنێت، یان بگات بەئامانجێکی دیاریکراو، بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، شێوازو ئالییەتی جیاواز دەگرنە بەر، هەر یەکەو پێی وایە: بەئالیەتێک دەتوانێ ئامانجەکە بپێکێ، بۆ نموونە: بۆ دروستکردنی زانستخوازانی سەرکەوتوو، یان کۆمەڵگایەکی ستاندەر و تەندروست، یان گێڕانەوەی حوکمێکی عادیلانە لە کوێ دەست پێبکەین؟

مەنهەج چۆن بێ؟

زانستخواز و قوتابێ چۆن پێ بگات ؟

بەچی دەست پێ بکەین ؟

پەروەردە ، عەقیدە، یان فیکر، دەعوە، یان جیهاد، تاک، یان کۆمەڵگا، یان دەسەڵات ؟

لەکۆتاییدا هەر یەک لەم بیرۆکانە، پێویستیان بە دانانی مەنهەج و پەیڕەو هەیە، بۆ پێگەیاندنی تاکەکان.


نرخی 7.000 دینار

9 789922 632216

نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
/TafseerOffice
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com